www.pertwk.com

# نهێنی یاری کاغەز

نووسینی؛ یۆستاین گاردەر
هەمان نووسەری "جیهانی سۆفیا"
وەرگێڕانی لە دانیمارکیەوە؛ بەهرۆز حەسەن

دەقە کوردیەکە پێشکەشە بە هەموو خوێنەرانی ئەم کتێبە و
بەتایبەتی پێشکەشە بە دایکم... من دەزانم ئەم کتێبەش پیت بە پیت حونجە دەکات و هەمووی دەخوێنێتەوە.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەم چیرۆکەدا ئەم کەسایەتیانەت بەرچاو دەکەوێت؛

«هانس تۆماس» کە لەڕێگای بەرەو وڵاتی فەیلەسوفەکاندا کتێبی ناو سەمونەکە دەخوێنێتەوە.
«باوکی هانس تۆماس» کە وەک کوڕە ئەڵمانیەک لە شاری "ئارەندال"دا گەورەبووە و دواتر ڕوو لە جیهانی دەریاوانی دەکات.
«دایکی هانس تۆماس» کە لە جیهانی مۆدەدا ونبووە.
«لینا» کە نەنکی هانس تۆماسە.
«باپیرەی هانس تۆماس» کە لەساڵی 1944دا دەینێرنە بەرەی ڕۆژهەڵات.
«کورتەبنەیەک» کە زەڕەبینێک بە هانس تۆماس دەبەخشێت.
«ئافرەتێکی قەڵەو» کە لە بارەکەی شاری "دۆرف"دا کاردەکات.
«نانەوایەکی پیر» کە چوار سەمون دەخاتە زەرفێکی کاغەزەوە و لەگەڵ پەرداخێک ئاوی هەرمێدا دەیدا بە هانس تۆماس.
«ژنە قەرەجێکی بەختگرەوە» و کچە قەشەنگەکەی، ئافرەتێکی ئەمریکی کە خۆی وەک دوو کەس دەبینێت، دەلاڵێکی مۆدەی یۆنانی، پزیشکێکی ڕوسی تایبەتمەند لەبواری مێشکی مرۆڤدا، سوکرات، ئۆدیبی پاشا، پلاتۆن، بۆیەکی چەنەباز.

جگەلەوانەش لە کتێبی ناو سەمونەکەدا ئەم کەسایەتیانە دەناسیت؛

«لودفی» کە لە ساڵی 1946دا بەسەر شاخەکاندا خۆی دەگەیەنێتە شاری "دۆرف".
«ئەلبێرت» کە پاش مردنی دایکی بە نەخۆشی وەک کوڕێکی تەنها و بێدەرەتان گەورە دەبێت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

«"هانس"ی نانەوا» کە بەرلەوەی وەک نانەوایەک لە شاری "دۆرف"دا کاربکات، لەساڵی 1842دا بەکەشتی لە شاری "ڕۆتردام"ەوە بەرەو نیۆرک دەڕوات و کەشتیەکەی نقووم دەبێت.

«فرۆد» کە بەخۆی و کەشتیەکی پڕ لەباری زیوەوە لە ساڵی 1790دا لە "مەکسیکۆ"وە بەرەو ئیسپانیا دەڕوات و کەشتیەکەی لەو ڕێگایەدا نقوومی دەریا دەبێت.

«سینا" کە لەو کاتەدا کە فرۆد بەرەو مەکسیکۆ ڕۆیشتووە، دەستگیرانی ئەو بووە و سکیشی لێی هەبووە.

«فریتز ئاندرێ» ی جوتیار و «هێنریک ئەلبریتس»ی دووکاندار.

«52 کاغەزی یاری»، لە نێوانیاندا "بللی کوپ" و "کوڕی دینار" و "پاشای کوپ".

«جۆکەر» کەسێکە کە زۆر دەبینێت و زۆر قوڵیش دەڕوانێت.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

## ناواخن

قەرە

بللی قەرە

...لەو کاتەدا سەربازێکی ئەڵمانی بەسواری پاسکیلەوە لەو ڕێگایەوە دێتە خوارەوە...

دووی قەرە

...خودا لە ئاسماندا دانیشتووە و بە مرۆڤ پێدەکەنێت، چونکە باوەڕی پێناکەن...

سێی قەرە

...بەڵام بەلاتەوە کەمێک سەیر نیە کە ئاوا ناو ئەم دارستانە لەدوری ئاواییەوە برازێننەوە...

چواری قەرە

...لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە لە دەستمدابوو، کتێبێکی بچکۆلەبوو...

پێنجی قەرە

...لەوکاتەدا گوێم لێبوو ئەو پیاوە پیرە لەناو بۆشایی سەقفەکەدا دەهات و دەچوو...

شەشی قەرە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

...ساردیەکی ترت بدەمێ کە تامەکەی هەزار جار لەم ساردیە خۆشتربێت...

حەوتی قەرە

...ئەستێرەیەکی پڕ نهێنی...

هەشتی قەرە

...لە گەردەلوولی وڵاتێکی نامۆ دەچوو...

نۆی قەرە

...ئەو دەیگوت من ئەو شتە سەیر و نائاساییانە دەبینم کە خەڵکی لە ئاستیاندا کوێرن...

دەی قەرە

...ئەستێرەکانی ئاسمان وەک کۆمەڵێک دوورگەی دوور دەدرەوشانەوە و منیش بەو بەلەمە بچکۆلەیەوە نەمدەتوانی پێیان بگەم...

کوڕی قەرە

...هەردوو چاوە قەرەجیە ڕەشەکانی هەروەک دوو دەنکە کەستانەی لووس دەبریسکانەوە...

کچی قەرە

...ئەو پەپولانە جۆرە دەنگێکیان لێوە بەرزدەبووەوە کە هەر لە جریوەی بولبول دەچوو...



پاشای قەرە

...پلەی چوارهەمی یەکتربینینت...

سینەک

بللی سینەک

...کتومت لەو نیشانانە دەچوون کە لەسەر کاغەزی یاری هەیە...

دووی سینەک

...پاشان دوو بلیتی دەرهێنا و لەراندنیەوە...

سێی سینەک

...هەر لە گوڵی سێپەڕ دەچن...

چواری سینەک

...ژیان یانسیبێکی گەورەیە و تەنها ژمارەی براوەکانی تێدا دیارە...

پێنجی سینەک

...دوای ئەوە ئیتر یاریکردن بە کاغەزەکان کەمێک سەختبوو...

شەشی سینەک

...دەیوست دڵنیابێت کە من مرۆڤێکی ڕاستەقینەم و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووم...



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



حەوتی سینەک

...نەم دەزانی بە چ شێوەیەک مینا و عاج لە دەمی مندا دێنە دەرەوە...

هەشتی سینەک

...ئەگەر مێشکمان هێندە سادە بوایە کە بمانتوانیبایە لێی تێبگەین...

نۆی سینەک

...شەربەتێکی شیرینی لێدروست دەبوو، ڕەنگەکەی دەدروشایەوە و تامێکی بەزەوق و خۆشی دەبەخشی...

دەی سینەک

...نەمدەزانی بە چ شێوەیەک، شتێک هەروا لە هیچی نەبووەوە دێتە بوون...

کوڕی سینەک

...ئەگەر ژیان جادوویەک بێت، کەواتە دەبێت جادووگەرێکیش بوونی هەبێت...

کچی سینەک

...بەرلەوەی ڕابکات، دەبوایە ناوی خۆی لەسەر ئافەریدەکانی بنووسیبایە...

پاشای سینەک

...ئەو پیاوبوو هیچی وا دەربارەی ژیان نازانێت و ئەوەش ئازاریدەدا...

جۆکەر



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

...ئەو وەک مارێکی ژەهراوی خۆی کرد بەلادێکەدا...

دینار

بللی دینار

...پیاوێکی دادپەروەربووە و دەیویست هەموو شتێک ئاشکرابکات...

دووی دینار

...مێستەرە پیرەکە چەند پەیامێکی گرنگی لە وڵاتەکەی خۆیەوە پێدەگات...

سێی دینار

...دایکم وێنە ئاوێنەییەکەی خۆی ڕاپکێشاوە بۆ ئێرە...

چواری دینار

...دەستە بچکۆلەکەی هەروەک شەونمی بەیانیان ساردبوو...

پێنجی دینار

...خواردنەوەکەم لەڕاستیدا تامێکی شیرین و خۆشی هەبوو...

شەشی دینار

...جارجارێک هاتوونەتە خوارەوە و لەنێو مرۆڤدا ژیاون...

حەوتی دینار



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

...هەروەک کەرنەفاڵێکی گەورە دەهاتە بەرچاوم کە بەمیوانەکانیان گوتبێت "وەرن و هەریەکەتان جۆرە جلوبەرگێک بپۆشن کە وێنەی کاغەزێکی یاری بنوێنێت"...

**هەشتی دینار**

...بەجادوویەک دێینە دەرەوە و دواتر دیارنامێنین...

**نۆی دینار**

...هەموومان لە یەک خێزانەوە هاتووین...

**دەی دینار**

...لەپشت یەکێک لەو دوکانەکانەوە کوڕێکی بچکۆلەم بینی سەرەتاتکێی دەکرد...

**کوڕی دینار**

...سەرتاپای بوونی ئەو بەو خاڵەوە بەسترابووەوە کە جۆکەر بێت...

**کچی دینار**

...لەوێدا ئیدی ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە دایە پرمەی گریان...

**پاشای دینار**

...پاشان لەسەر ئەوە بڕیارياندا کە یەکی زەنگۆڵەیەکمان بکرێتە مل...



## کوپ

**بللی کوپ**

...کاغەزەکەم هەڵگێڕایەوە و سەیرێکم کرد، بللی "کوپ" بوو...

**دووی کوپ**

...لەوانەیە ئێستاکە لە قەراغ ئاوێکدا وەستابێت و تەماشای دەریا بکات...

**سێی کوپ**

...ئافرەتێکی ڕازاوەمان بینی کڵاوێکی گەورەی جوانی لەسەردابوو...

**چواری کوپ**

...نازانین کێ کاغەزەکان دابەشدەکات...

**پێنجی کوپ**

...لەوێدا دەبوایە خۆمم هێمن ڕابگرتایە و هەروا پێش وەخت پاداشتم نەبەخشیبایە...

**شەشی کوپ**

...وەک مانگ و خۆر ڕاستەقینەبوون...

**حەوتی کوپ**



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

...ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات...

**هەشتی کوپ**

...ئەم جیهانە چ پەرجویەکی مەزنە، نازانم بگریم یان پێبکەنم...

**نۆی کوپ**

...جیهان هێندە کرچ و کاڵە کە نایەوێت گوێ بۆ باسی کاغەزەکانی فرۆد شلبکات...

**دەی کوپ**

...هەمیشە زۆرزانێک بە جیهاندا دێت و دەڕوات کە دانەکانی کات ناتوانێت بیفەوتێنێت...

**کوڕی کوپ**

...پیاوێکی بچکۆلەمان لەناویدا بینی، خەریکی شتەکانی پشتەوەبوو و لەوە دەچوو بەدوای شتێکدا بگەڕێت...



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**کچی کوپ**

...لەپڕێکدا ئافرەتێکی بەتەمەن لەباڕە کۆنەکەوە هاتە دەرەوە...

**پاشای کوپ**

...یادوەریەکانیش زیاتر و زۆرتر لەو شتانە دووردەکەونەوە کە کاتی خۆی بوونەتە هۆی سەرهەڵدانیان...

---

شەش ساڵ لەمەوبەر لەناو پاشماوە دێرینەکانی پەرستگای "پۆسیدیۆن"دا وەستابووم و تەماشای دەریای "ئەدریانتیک"م دەکرد. سەد و پەنجا ساڵێک لەمەوبەریش "هانس"ی نانەوا گەیشتە سەر دوورگە سەیروسەمەرەکەی ئۆقیانوسی ئەتلەسی. ڕێک دوو سەد ساڵیش لەمەوبەر کەشتیەکەی "فرۆد" نقومبوو، ئەو لە مەکسیکۆوە بەرەو ئیسپانیا دەڕۆیشت.
من بۆئەوەی بزانم دایکم بۆچی بەجێیهێشتین و ڕووی لە ئەسیناکرد، دەبوایە هێندە زۆر بگەڕێمەوە دواوە...

حەزمدەکرد بیرم لە شتێکی تر بکردایەتەوە، بەڵام هەتاوەکو کەمێک لە منداڵیم تێدا ماوەتەوە، هەستدەکەم دەبێت هەموو چیرۆکەکەم بنووسمەوە.
ئێستاکە لەماڵەوە دانیشتووم و لە پەنجەرەکەوە تەماشای دارەکانی دەرەوە دەکەم،گەڵاکان هێدی هێدی دەوەرن. لەدارەکانەوە دەکەونە خوارەوە و وەک فەرشێک خۆیان بەسەر زەویەکەدا ڕادەخەن. کەستانەکانیش لەدارەکانەوە خۆیان هەڵدەدەنە خوارەوە و بەناو



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

پەرژینەکاندا پەرشوبڵاو دەبنەوە، کچێکی بچکۆلەش بەهێواشی بەناویاندا دەڕوات.
لەوەدەچێت کە هیچ شتێک چیتر پەیوەندی بەیەکەوە نەمابێت.
کاتێک بیر لە کاغەزەکانی "فرۆد" دەکەمەوە، وەک ئەوە وایە، سروشت تێکرای خۆی لە جومگەکانیەوە شلکردبێتەوە.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**بللی قەرە**

**...لەو کاتەدا سەربازێکی ئەڵمانی بەسواری پاسکیلەوە لەو ڕێگایەوە دێتە خوارەوە...**

سەفەرە گەورەکەمان بەرەو وڵاتی فەیلەسوفەکان لە شاری "ئارەندال"ی دێرینی قەراغ دەریاوە دەستیپێکرد. لە شاری "کریستیانساند"ەوە بە پاپۆڕ پەڕینەوە بۆ شاری "هیرتزهالز". دواتریش بەناو دانیمارک و ئەڵمانیادا تێپەڕین، بەڵام جگە لە "شاری لیگۆ"ی ناو دانیمارک و بەندەرە گەورەکانی هامبۆرگ، هیچی تر لەو بەشەی سەفەرەکەماندا شک نابەم کە شایانی باسکردن بێت، چونکە بەدرێژایی ئەو ڕێگایە تەنها جادەی قیرتاوی شارێگاکان و کێڵگەکانی ئەملاولامان دەدی. بەڵام کە گەیشتینە شاخەکانی "ئەلپ" ئەوجا بەڕاستی شتمان بینی. بەهەرحاڵ بەر لە سەفەرەکەمان من و باوکم شێوە پەیمان نامەیەکی بچکۆلەمان بەستبوو؛ من بەوە ڕازیبووم کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ماشێن لێبخوڕێت و ئەوجا بۆ مانەوەی شەومان لە شوێنێک لابدات، بەڵام لەبەرامبەردا ئەویش بۆی نەبوو لە ماشێنەکەدا جگەرە بکێشێت. هەردووکیشمان لەسەر ئەوە ڕێکەوتبووین کە بە ئارەزووی خۆی بۆ جگەرە کێشان بوەستێت. ئێستاکەش لە هەموو ئەو ڕێگایەدا بەر لەوەی بگەینە "سویسرا"، زیاتر ئەو ساتانەم دێتەوە یاد کە بۆ جگەرە کێشان دەوەستاین.
وەستانیشمان بۆ جگەرە کێشان هەمیشە بەم شێوەیە دەستیپێدەکرد؛ باوکم وتەیەکی کورتی دەربارەی شتێک دەگوت کە کەمێک لەوەوبەر لە کاتی لێخوڕینی ماشێنەکەیدا بیری لێکردبووەوە، هەڵبەتە من لەو



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەته بە پێگەی پەڕتووک

کاتانەدا لەسەر کوشنەکەی دواوە یان گۆڤاری "ئاندەرسی مراوی"م[1] دەخوێندەوە یان بۆ خۆم خەریکی یاری کاغەز بووم. زۆر جاریش باسی شتێکی دەکرد کە پەیوەندی بە دایکمەوە هەبوو، ئەگەر نا، ئەوا باسی شتێکی لەو شتە تایبەتیانەی دەکرد کە لەوەتەی من دەیناسم خولیای بووە.

هەر لەو کاتەوەی کە باوکم لە جیهانی دەریاوانی دوورکەوتەوە و هاتەوە ناو شار، سەرقاڵی دونیای ڕۆبۆت بوو. لەوانەیە ئەمە ئارەزوویەکی هێندە سەیر نەبێت، بەڵام باوکم تەنها وەک ئارەزوومەندێکی ئاسایی خولیای ڕۆبۆت نەبوو. بەڵکو ئەو بەتەواوەتی لەو بڕوایەدابوو کە زانست ڕۆژێک لە ڕۆژان بگاتە ئەوەی کە مرۆڤی دەستکرد بهێنێتە بوون. مەبەستیشی لەو "ڕۆبۆتە ئاسنینە" دەستکردانە نەبوو کە گڵۆپە سوور و سەوزەکانیان دادەگیرسێت و دەکوژێتەوە و بە دەنگێکی پچڕپچڕ قسەدەکەن. نەخێر... باوکم پێیوابوو ڕۆژێک لە ڕۆژان زانست بتوانێت مرۆڤی بیرکەرەوە و ڕاستەقینەی هەروەک خۆمان دروستبکات. نەک هەر ئەمەندە، بەڵکو ئەو هێشتام زیاتریش دەڕۆیشت؛ بەڕای ئەو مرۆڤی ڕاستەقینەش لە بنەڕەتدا شتێکی نەناسراوی دەستکردی وەک ڕۆبۆتەکانن. هەر بۆیە جارجارێک دەیگوت؛

«ئێمە جۆرە بووکەشوشەیەکی پڕ لە ژیانین».

باوکم زیاتر لەدوای خواردنەوەی یەک دوو پێکی پچکۆلە لەم جۆرە ڕستانەی دەردەپەڕاند.

[1] گۆڤارێکە وێنەی کارتۆنی تێدایە و تایبەتە بە منداڵان.



بیرم دێت ئەو کاتەی لە "شاری لیگۆ" بووین، لە شوێنی خۆیدا چەقیبوو و تەماشای ئەو لیگۆیانەی دەکرد کە شکڵی مرۆییان پێ دروستکرابوو. منیش هاتمە پێشەوە و لێمپرسی؛ بیر لەدایکم دەکەیتەوە؟ بەڵام ئەو سەرێکی ڕاوەشاند و لە وەڵامدا گوتی؛

«"هانس تۆماس"، بیر لەوە بکەرەوە کە لە پڕێکدا ئەم هەموو شکڵانە ببنە شتێکی زیندوو... مەزەنەی ئەوە بکە کە هەموو شێوەکان لەناکاودا بە هێواشی لەناو خانووە پلاستیکیەکاندا بێن و بچن... ئەوسا چیمان بکردایە؟».

منیش زۆر بە ئاسانی گوتم؛ «تۆ شێتیت»... چونکە من دەمزانی ئەو باوکانەی منداڵەکانیان دەهێننە "شاری لیگۆ" ئەم جۆرە باسانەیان بۆ ناکەن.

خەریک بوو داوای لێبکەم ئاسکریمێکم بۆ بکڕێت، بەڵام کەمێک دانم بەخۆمدا گرت. باوکی خۆمە و دەمناسی... من دەمزانی باشترێکە کە کەمێک چاوەڕوانبم هەتاوەکو هەموو بیرۆکە سەیر و نائاساییەکانی هەڵدەڕێژێت، ئەوجا داوای شتێکی لێبکەم. پێم وابێت جارجارێک ویژدانی کەمێک ئازاری دەدا، چونکە هەمیشە لەو جۆرە باسانەی بۆ دەکردم، زۆرجاریش کە کەسێک ویژدانی ئازاربیدات، دڵی نەرمتر دەبێت. پێشئەوەی داوای ئاسکریمەکەم بکەم، گوتی؛

«لە بنەڕەتدا ئێمە جۆرە لیگۆیەکی پڕ لەژیانی بەم شێوەیەین».

ئەوجا دڵنیابووم کە ئاسکریمەکەم مسۆگەرکردووە، چونکە باوکم خەریکبوو دەست بە باسە فەلسەفیەکانی بکات.

بەرەو شاری ئەسینا دەڕۆیشتین، بەڵام لەڕاستیدا سەفەرەکەمان بۆ بەسەربردنی پشوویەکی هاوینەی ئاسایی نەبوو. بەڵکو بەو مەبەستە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





ڕۆیشتبووین کە لە ئەسینادا ـیان لە شارێکی تری یۆناندا ـ دایکم بدۆزینەوە. ئێمە لەوە دڵنیانەبووین کە دەیدۆزینەوە، تەنانەت لە حاڵەتێکیشدا گەر بمان دۆزیبایەتەوە، دیسانەوە ئەو کاتەش دڵنیانەبووین کە لەگەڵماندا بگەڕێتەوە بۆ نەرویج. بەڵام سەرباری ئەمانەش باوکم دەیگوت دەبێت هەوڵێک بدەین، چونکە لەڕاستیدا نە من و نە باوکیشم پێمان خۆشنەبوو هەموو ژیانمان بەبێ دایکم بەسەربەرین.

من تەمەنم چوار ساڵان بوو کە دایکم من و باوکمی بۆ دواجار بەجێهێشت. ئەو دەیویست بەمەبەستی "خۆ دۆزینەوە" بەرەو شوێنێکی تری جیهان کۆچبکات. من و باوکیشم لەوە تێدەگەیشتین کە دایکم کاتی ئەوەی هاتووە کە بەدوای خۆیدا بگەڕێت و خۆی بدۆزێتەوە، چونکە گەیشتۆتە تەمەنێک و کوڕێکی چوار ساڵانیشی هەیە، لەبەرئەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان پشتگیری پرۆژەکەیمان کرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەرگیز لەوە تێنەگەیشتم بۆچی دەبوایە کۆچی بکردایە و دوور بکەوتایەتەوە بۆ ئەوەی خۆی بدۆزیبایەتەوە. بۆچی نەیدەتوانی لە شارەکەی خۆماندا لە "ئارەندالْ"دا ئەوە بکات، یان بەلایەنی کەمەوە بۆ نەچووە "کریستیانساند" و لەوێ خۆی بدۆزێتەوە؟ ئامۆژگاری من بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت خۆیان بدۆزنەوە، ئەوەیە کە ڕێک لەو شوێنەدا بمێننەوە کە تێیدا دەژین. ئەگەر نا، ئەوا بەڕاستی پێدەچێت ڕووبەڕووی مەترسی ونبوونی هەتاهەتایی ببنەوە.

هەر لەو ڕۆژەوەی کە دایکم بەجێیهێشتین، من کەوتمە گەڕان بەدوایدا. هەموو کەرەتێک کە دەرۆیشتمە گۆڕەپانەکەی "ئارەندالْ"، وام هەستدەکرد کە لە پرێکدا دەرکەوێت. هەموو جارێکیش کە





دەچوومە "ئۆسلۆ" بۆ سەردانی نەنکم، بە چواردەورمدا چاوم بۆ دەگێڕا. بەڵام هەرگیز نەمبینی. تەنها ئەو ڕۆژە بینیم کە باوکم بە خۆی و گۆڤارێکی جلی مۆدەی یۆنانییەوە هاتەوە ماڵەوە. وێنەی دایکم لەسەر بەرگەکەی و چەند لاپەڕەیەکی ناوەوەدا بوو. هەر لە ڕێگەی وێنەکانەوە بەئاشکرا دیاربوو کە هێشتام خۆی نەدۆزیوەتەوە، چونکە وێنەکانی ناو گۆڤارەکە لە دایکە ڕاستەقینەکەم نەدەچوون، بەڵکو بەڕوونی دیاربوو کە دەیویست لە کەسێکی دی بچێت. منیش و باوکیشم بەڕاستی بەزەیمان پێدا دەهاتەوە.

ماوەی ڕابووردو پورێکی باوکم لە سەفەرێکیدا بۆ یەکێک لە دوورگەکانی یۆنان چاوی بەو گۆڤارە کەوتبوو کە وێنەکانی دایکمی تێدابوو، لەڕاستیدا لە هەموو دوکانەکانی ڕۆژنامە فرۆشییدا بینیبووی. ئەویش دانەیەکی بە چەند دراخمایەک کڕیبوو و دواتریش لەگەڵ خۆیدا هێنابوویەوە بۆ نەرویج. تا ڕادەیەک پێکەنینم دێت کە بیر لەو حاڵەتە دەکەمەوە، چونکە ئێمە لێرە چەند ساڵێکە بەدوای دایکمدا دەگەڕێن و ئەویش لەو خوارانە بەدەموچاوێکی دەم بە پێکەنینەوە خۆی نیشانی هەموو ڕێبوارانی ئەو شارە دەدات.

«بزانە خۆی تووشی چ گێژاوێکی قوڕ کردووە»... باوکم تەنها ئەمەندەی گوت و سەرێکی بۆ خوراند. کەچی دواتر هەموو وێنەکانی دایکمی لە گۆڤارەکە کردەوە و لە ژووری نووستنەکەیدا هەڵیواسین. ئەو دەیگوت لە هەموو بارێکدا باشترە وێنەی یەکێکمان هەبێت کە لە دایکت بچێت وەک لەوەی هەر هیچ وێنەیەکمان نەبێت.

کەمێک دوای هاتنی گۆڤارەکە باوکم بڕیاریدا سەفەربکەین بۆ یۆنان و بەدوای دایکمدا بگەڕێین؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«هانس تۆماس، دەبێت هەوڵێک بدەین و دایکت بهێنینەوە ماڵەوە... ئەگەر نا، ئەوا دەترسم لەم گێژاوی خەیاڵی مۆدەیەدا بەتەواوەتی ونبێت».

من ڕاست و دروست لەمانای دوا ڕستەی باوکم تێنەگەیشتم. لەوەوبەر زۆر جار بیستبووم کە پیاو لەناو کراسێکی گەورەدا وندەبێت، بەڵام نەمبیستبوو کە لە خەیاڵیشدا ون ببین. ئەمڕۆکە هێندە دەزانم کە ئەم ونبوونە شتێکە کە هەموو کەسێک دەبێت وریای بێت.

دوای ئەوەی شاری "هامبۆرگ"مان جێهێشت، باوکم لایدا و دیسانەوە دەستی کردەوە بەباسکردنی باوکی. هەموو ئەو باسانەم لەوەوپێش گوێ لێبووبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گیڤە گیڤی ئەو هەموو ماشێنانەی بەلاماندا تێدەپەڕین باسەکەی باوکمی کەمێک جیاوازکردبوو.

لەڕاستیدا باوکم یەکێک بوو لەوانەی پێیان دەڵێن "کوڕە ئەڵمانی"ەکان. من چیتر هیچ شەرمێک ناکەم کە ئەم ڕاستیە بدرکێنم، چونکە ئێستاکە دەزانم کە "منداڵە ئەڵمانیەکان"یش دەکرێت وەکو هەموو منداڵانی تر باشبن. بێگومان بەلای منەوە ئاساییە ئاوها بڵێم، چونکە خۆم بەهیچ جۆرێک نازانم چ جۆرە هەستێکت دەبێت گەر بەبێ باوک لە شارێکی چکۆلەی خواروی نەرویجدا گەورە ببیت.

باوکم لە پرێکدا دەستیکردەوە بە باسکردنی بەسەرهاتی نەنە و باپیرەم، لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە بە ئەڵمانیادا تێدەپەڕین.

هەموو کەسێک دەزانێت کە پەیداکردنی خواردن لە کاتی جەنگی جیهانی دووهەمدا کارێکی ئاسان نەبووە. نەنەش ئەوەی دەزانی، هەر





بۆیە بە پاسکیلەکەی سەرکەوتبوو بۆ "فرۆلاند" بۆ ئەوەی تووی سوور لێبکاتەوە، بەڵام لەو ڕێگایەدا پاسکیلەکەی پەنچەر دەبێت... نەنە ئەو کاتە تەمەنی لە حەڤدە ساڵ تێنەپەڕیبوو.

گرنگترین ڕووداوی ژیانی من ئەو توو لێکردنەوەیەی نەنەیە. ئەمە لەوانەیە سەیر بێتە بەرگوێ؛ گرنگترین ڕووداوی ژیانم سی ساڵ لەمەوبەر و پێش ئەوەی من لە دایک ببم ڕوویداوە، بەڵام ئەگەر پاسکیلەکەی نەنە ئەو یەکشەممەیە پەنچەر نەبوایە، ئەوا باوکم لەدایک نەدەبوو. وە ئەگەر باوکیشم لەدایک نەبوایە، ئەوا منیش هەرگیز چاوم بەم ژیانە نەدەکەوت.

بەکورتی ئەو ڕۆژە نەنە سەبەتەیەک تووی سووری لێکردبووەوە و لە ڕێگای "فرۆلاند"دا پاسکیلەکەی پەنچەر بووە. بێگومان هیچ کەرەسەیەکی پەنچەریشی پێ نەبووە... بەڵام تەنانەت ئەگەر چاکترین کەرەسەی پەنچەریشی پێبوایە، ئەوا هەر نەیدەتوانی خۆی پاسکیلەکەی پەنچەری بکات.

لەو کاتەدا سەربازێکی ئەڵمانی بەسواری پاسکیلەوە لەو ڕێگایەوە دێتە خوارەوە. ڕاستە ئەڵمانی بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی شەڕانی نەبووە. بەڵکو بە پێچەوانەوە کە بینیویەتی ئەو کچە گەنجە بە خۆی سەبەتەیەک تووی سوورەوە لەو ڕێگایەدا پەکیکەوتووە و نەیتوانیوە بگەڕێتەوە ماڵەوە، زۆر بە دڵفراوانیەوە بەدەمیەوە چووە. لەسەرو ئەوەشەوە هەموو کەرەسەیەکی پەنچەریشی پێبووە.

زۆر جار وادەزانین هەموو سەربازە ئەڵمانیەکانی نەرویج دڵڕەق و شەڕانگیزبوون، بەڵام باپیرە لەو جۆرە کەسانە نەبووە. ئەگەر سەربازێکی ئاوها دڵڕەق بوایە، ئەوا هەر زۆر بەئاسانی بەلایدا تێدەپەڕی و ئاوڕشی لێنەدەدایەوە. بەڵام بێگومان خاڵە هەرە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



گرنگەکە لێرەدا نیە... بەهەرحاڵ نەنە لە هەموو بارێکدا دەیتوانی
لوتی خۆی بەرزبگرێت و یاریدەی ئەو سەربازە ئەڵمانیە ڕەتبکاتەوە.
گرفتەکە لەوەدابووە کە ئەو سەربازە ئەڵمانیە هێدی هێدی حەزی لەو
کچە گەنجە کردووە کە لە تەنگانە و ناخۆشیدابووە... بەڕاست،
گەورەترین ناخۆشی کە بەسەر ئەو کچە گەنجەدا هات، بەهۆی ئەو
سەربازەوەبوو، بەڵام ئەوەش چەند ساڵێک دواتر ڕوویدا...
زۆربەی جارەکان کە باوکم دەگەیشتە ئەم خاڵە، جگەرەیەکی
دادەگیساند... لە ڕاستیدا نەنەش حەزی لەو سەربازە ئەڵمانیە
کردووە، هەموو گرفتەکەش لێرەوە سەریهەڵداوە. نەنە هەر بەوەوە
نەوەستاوە کە سوپاسی باپیرەبکات، چونکە پاسکیلەکەی بۆ
پەنچەریکردووە... نا،نا، بەڵکو بەوەش ڕازیبووە هەتا ناو "ئارەنداڵ"
پێکەوە بڕۆن. بێگومان ئەو کچێکی بێئەقڵ بووە و گوێڕایەڵیش نەبووە.
لە هەر هەمووی خراپتریش ئەوە بووە کە ویستویەتی سەر لەنوێ
چاوی بە "لودفی مێسنەر" بکەوێتەوە.

بەم شێوەیەش نەنە و داپیرە بوون بە دەستگیرانی یەکتری. جێگەی
داخە کە هەمیشە ناتوانین ئەو کەسە هەڵبژێرین کە دەکەوینە
خۆشەویستیەوە لەگەڵیدا. بەڵام خۆ نەنە دەیتوانی بڕیاری ئەوە بدات
کە جارێکی تر نەیبینێتەوە، بەلایەنی کەمەوە دەیتوانی کەمێک دانی
بەخۆیدا بگرتایە هەتاوەکو ئەو کاتەی کە بەقوڵی دەکەوتە
خۆشەویستیەوە لەگەڵیدا. بەڵام نەنە ئەمەی دواتریانی نەکرد و
پاشانیش باجی هەڵبژاردنەکەی دا.
نەنە و داپیرە بەردەوام بە نهێنی یەکتریان بینیووە. وە ئەگەر
خەڵکی ئارەنداڵ دەیانزانی لەگەڵ ئەڵمانیەکدا ژوان دەگرێت، ئەوا





بێ سێ و دوو لە هەموو خۆشیەک بێبەریان دەکرد. چونکە تەنها
شێوەیەک بۆ بەرگریکردنی ئەڵمانیەکان ئەوەبووە کە خەڵکانی
ئاسایی بە هیچ جۆرێک پەیوەنیان پێوە نەگرن.
لە هاوینی 1944 دا "لودفی مێسنەر" بانگ دەکرێتەوە بۆ ئەڵمانیا، بۆ
ئەوەی لەبەرەی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەنگاری لە نازیەکان بکات. تەنانەت
کاتی ئەوەشی نەبووە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک خواحافیزبوون لە نەنە
بکات. هەر لەو کاتەوەی پێ لەناو قیتارەکەی ئارەنداڵدا دادەنێت
ئیدی لە ژیانی نەنەدا دێتە دەرەوە. لەو کاتەشەوە هەرگیز هیچ
هەواڵێکی نەبووە _هەرچەندە نەنە چەندین ساڵ لەدوای ئاشتیشەوە
هەوڵیدەدا سۆراغێکی بکات، بەڵام بێسوودبوو. دواتریش بەتەواوەتی
هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە لە شەڕی دژ بە ڕوسەکاندا کوژرابێت.
ئەگەر نەنە سکی نەبوایە، ئەوا لەوانەیە هەموو گەشتی پاسکیلەکەی
بۆ فرۆلاند و هەموو ڕووداوەکانی تری ئەو ناوەی لەیادبکرایە. بەڵام
ڕێک پێشئەوەی باپیرە ڕووەو بەرەی ڕۆژهەڵات سەفەربکات، نەنە
سکی پڕبووە. لەو کاتەدا تەنانەت خۆشی نەیزانیوە کە دوو گیانە،
بەڵکو پاش چەند حەفتەیەک بەدوای سەفەرەکەی باپیرەدا ئەوجا
بۆی دەرکەوتووە.
ئەو شتەی کە پاشتریش ڕوویدا، باوکم ناوی ناوە "بەدکاریەکانی
مرۆڤ" _لێرەشدا هەموو جارێک جگەرەیەکی تر دادەگیرسێنێت. باوکم
هەر ڕێک لەپێش سەربەستبوونی نەرویجدا لە مانگی پێنجی 1945 دا
لەدایک بووە. هەر خێرا پاش ئەوەی ئەڵمانیەکان خۆیاندا
بەدەستەوە، نەرویجیەکان نەنکمیان گرت. ئەوان ڕقیان لە هەموو ئەو
کەسانە بووە کە دەستیان لەگەڵ ئەڵمانیەکاندا تێکەڵکردبوو.
بەداخەوە کۆمەڵێک کچی زۆری لەو بابەتە هەبوون، بەڵام خراپترین



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



شت بەسەر ئەوانەدا شکایەوە کە منداڵیان لە سەربازە ئەڵمانیەکان هەبووە. نەنکم بە ڕاستی باپیرەمی خۆشدەویست. واتە نەنکم لەبەر خۆشەویستی لەگەڵ باپیرەمدابووە نەک لەبەرئەوەی کە نازیست بووبێت. لەڕاستیدا باپیرەشم نازیست نەبووە. پێش ئەوەی یەخەی بگرن و بینێرنەوە بۆ ئەڵمانیا، لەگەڵ نەنەدا نەخشەیان دانابوو کە بەرەو سوید ڕابکەن. بەڵام لەو کاتەدا دەیانگوت سەربازە سویدیەکانی سەر سنوور تەقە لە هەموو سەربازێکی هەڵهاتووی ئەڵمانی دەکەن کە بیانەوێت دزە بکەنە ناو سویدەوە، ئەمەش تەنها شتبوو کە ڕێگەی لێگرتبوون.

دواتریش خەڵکی ئارەندالٚ نەنکمیان گرت و بۆ ئەتک سەریان تاشی. هەرچەندە تازە منداڵی بوو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێریان لێدابوو. بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە "لودفی مێسنەر" لەوان جوانتر ڕەفتاری لەگەڵدا کردووە.

ئیدی ژیانی نەنکم لە ئارەندالٚدا کەوتبووە مەترسیەوە، هەر لەبەرئەوە ناچاربووە بەسەری تاشراوەوە بچێتە لای پورم لە "ئۆسلۆ". ڕاستە ئەو کاتە بەهارێکی گەرم و خۆشبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەنکم دەبوایە کڵاوی لەسەربکردایە، چونکە سەریان وەک پیاوێکی پیر تاشیبوو. دایکیشی هێشتام هەر لە ئارەندالٚ دەژیا، ئەوجا پاش پێنج ساڵێک گەڕاوەتەوە ئارەندالٚ و باوکمی وەک کلکێک بەدوای خۆیدا ڕاکێشاوە.

باوک و نەنکم پێیان وانیە کە ڕووداوەکەی "فرۆلاند" شایانی ئەوە بێت کە داوای بەخشینی بۆ بکرێت. بەڵکو زیاتر بیر لە چۆنیەتی و ماوەی سزادانەکە دەکەنەوە. بۆ نمونە پرسیارێکی بەجێیە گەر بڵێین چەند نەوە دەبێت بە سزای تاوانێکەوە بتلێنەوە؟ بێگومان نەنکم بەشی



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

خۆی خەتای لە سکپڕبوونەکەیدا هەبووە، خۆشی هەرگیز نکۆڵی لەوە نەکردوە. بەڵام ئەی منداڵەکەی بۆ سزا بدرێت؟ من پێم وایە بەئاسانی نەتوانین هەڵوێستێکی گونجاو لەم بارەیەوە وەرگرین.

من خۆم زۆر جار بیرم لەمە کردۆتەوە. باوکم لە ڕێگەی "گوناحێکی گەورەوە" هاتۆتە ئەم جیهانەوە. بەڵام ئایا هەموو کەسانێکی تریش ناتوانن ڕەگی بوونیان بگەڕێننەوە سەر ئادەم و حەوا؟ دەزانم بەراوردکاریەکەم زۆر ڕێک نیە، چونکە گوناحەکەی ئادەم و حەوا بەهۆی سێوێکەوە ڕوویدا و ئەوەی نەنە و باپیرەش بەهۆی تووی سوورەوە بوو، بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا مارێک فریویدان.

هیچ دایکێک نیە لە دونیادا بەدرێژایی ژیانی بێت و بڕوات و لۆمەی خۆی بکات، تەنها لەبەرئەوەی کە منداڵی بووە. بەبڕوای من نابێت لۆمەی منداڵەکەش بکرێت. مەبەستم لەوەیە کە "منداڵە ئەڵمانیەکان"یش مافی ئەوەیان هەیە چێژ لە ژیان ببینن. من و باوکم ڕێک لەم خاڵەدا کەمێک ناتەبابووین.

هەروەک گوتم باوکم وەک منداڵێکی ئەڵمانی گەورەبووە. ڕاستە لەو کاتەدا خەڵکە گەورەکانی ئارەندالٚ بەرە بەرە وازیان لە لێدانی "کچە ئەڵمانی"ەکان هێنا، بەڵام بەردەوام گاڵتەیان بە کوڕە ئەڵمانیەکان کردووە. بێگومان منداڵانیش هەر زۆر زوو فێری خراپەکاری دەبن لە گەورەکانەوە. واتە باوکم سەردەمێکی منداڵی سەختی بەسەربردووە. لەتەمەنی حەڤدا ساڵیدا چیتر توانای نامێنێت. هەرچەندە هەروەک هەموو کەسێکی تری خەڵکی شار ئەویش ئارەندالٚی خۆشدەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچاردەبێت ڕووبکاتە جیهانی کەشتیوانی و لەناو پاپۆڕێکدا کاربکات. پاش حەوت ساڵ ئەوجا دەگەڕێتەوە بۆ ئارەندالٚ. بەڵام پێش ئەو کاتە باوکم لە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





کریستیانساندا ئاشنایی لەگەڵ دایکمدا پەیداکردووە. پاش ماوەیەکیش پێکەوە گواستویانەتەوە بۆ خانوویەکی کۆنی شاری "هیسیو" و ڕێک لەو خانووەدا لە ڕۆژی 29 ی 2 ی 1972 دا من لەدایکبووم. کەواتە بەم شێوەیە منیش بەشی خۆمم لەو گوناحە هەڵگرتووە کە کاتی خۆی لە "فرۆلاند"دا ڕوویدا. ئەمەیە کە پێی دەڵێن گوناحی بۆماوە.

سەردەمێکی منداڵی سەخت و دواتریش بەسەربردنی چەند ساڵێک لە ناو پاپۆڕدا، وای لە باوکم کردبوو کە سەربکاتە سەر خواردنەوەی زۆر. پێم وابێت کەمێک زیاد لەڕادە سەری کردبووە سەر خواردنەوە. ئەو دەیگوت من بۆیە دەخۆمەوە بۆ ئەوەی دونیام بیربچێتەوە. بەڵام ڕێک لەو خاڵەدا بەهەڵەدا دەچوو، چونکە هەر کە دەیخواردەوە ئیتر بەچەپ و ڕاستدا دەکەوتە باسکردنی نەنە و باپیرە و سەردەمی سەختی منداڵی خۆی وەک منداڵێکی ئەڵمانی. جارجارێکیش دەگریا. وابزانم ئەو مەشروبە قورسانە وایان لێدەکرد کە باشتر شتەکانی بیربکەوێتەوە.

لەدوای شاری هامبۆرگەوە باوکم دیسانەوە لەسەر ئەو ڕێگاوبانە هەموو چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە، دواتریش گوتی؛

«ئەوجا دایکت بەجێیهێشتین. ئەو کاتەش کە تۆ چوویتە باخچەی ساوایان، دایکت دەستیکرد بە کارکردن. لەپێشدا بوو بە مامۆستای هەڵپەرکێ، دواتر بوو بە مۆدێلی جلوبەرگ. چەندین جاریش سەفەریکرد بۆ ئۆسلۆ، یەک دوو جارێکیش خۆی گەیاندە ستۆکهۆڵم، دواتریش ڕۆژێک ڕۆیشتە دەرەوە و ئیدی نەگەڕایەوە ماڵەوە. تەنها هەواڵێکیش کە بەدەستمان گەیشت، نامەیەک بوو؛ لەوێدا نووسیبووی کارێکم لەدەرەوەی نەرویجدا دۆزیوەتەوە و ناشزانم کەی بوارم دەبێت





بگەڕێمەوە. تەنها ئەوەندە و هیچی تر، هەروەک چۆن یەکێک بۆ ماوەی یەک دوو حەفتە سەفەرێک دەکات. بەڵام وا ئێستاکە هەشت ساڵێک زیاتر بەسەر کۆچەکەی دایکتا تێپەڕیووە...».

ئەمەشم بیستبوو، باوکم چەندین جار ئەو باسەی بۆ گێڕابوومەوە، بەڵام کەمێک دواتر درێژەی بەقسەکانیدا و گوتی؛

«هانس تۆماس، ئێمە هەمیشە لە خێزانەکەماندا کەسێکمان نوقسانبووە. هەمیشە یەکێکمان ونبووە. وابزانم ئەمە شێوە نەفرینێکە و بەسەر خانەوادەکەماندا کراوە».

یەکەم جار کە گوێم لە وشەی "نەفرین" بوو کەمێک ترسم لێنیشت. لە ماشێنەکەدا دانیشتبووم و هەر بیرم لەوە دەکردەوە، بەڵام پاشتر هاتمە سەر ئەو بڕوایەی کە ڕاست دەکات. چونکە هەر تەنها من و باوکم، باپیرە و دایک و هاوسەرمان لێڕۆیشتووە. بەڵام بێگومان باوکم کەسی تریشی لەخەیاڵدابوو؛ ئەو کاتەی کە نەنکم منداڵ بووە، باوکی لقی دارێکی گەورەی بەسەردا کەوتووە و کوشتویەتی. کەواتە نەنکیشم بەبێ باوک گەورەبووە. لەوانەشە هەر لەبەرئەوە بووبێت کە منداڵێکی لەو سەربازە ئەڵمانیە بووە و پاشان سەربازەکە لە شەڕدا کوژراوە. وە لەوانەشە هەر لەبەرئەم هۆیە بێت کە ئەو منداڵەی، ژنێک دێنێت و دواتر ژنەکەی سەفەردەکات بۆ ئەسینا بۆ ئەوەی خۆی بدۆزێتەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





**دووی قەرە**

**...خودا لە ئاسماندا دانیشتووە و بە مرۆڤ پێدەکەنێت، چونکە باوەڕی پێناکەن...**

لەسەر سنووری سویسرا لە بەنزینخانەیەکی سەیر لاماندا، تەنها یەک پەمپمی بەنزین تێکردنی هەبوو. لە خانووە سەوزەکەیەوە پیاوێکی پچکۆلە هاتە دەرەوە، هێندە پچکۆلەبوو هەر لە کورتەبنە دەچوو. باوکم نەخشە گەورەکەی دەرهێنا و داوای لێکرد باشترین ڕێگامان لە شاخەکانی ئەلپەوە بۆ شاری "ڤێنیسیا" نیشانبدات.

کورتەبنەکە دەستی بۆ نەخشەکە ڕاکێشا و بە نوزەنوزێکەوە چەند قسەیەک لەدەمیەوە هاتنە دەرەوە. ئەو تەنها زمانی ئەڵمانی دەزانی، بەڵام باوکم قسەکانی ئەوی بۆ وەرگێڕام و گوتی ئەو پیاوە پچکۆلەیە دەڵێت باشترە ئەم شەو لە لادێیەکدا لابدەین کە ناوی "دۆرف"ە.

کورتەبنەکە بەردەوام لەکاتی قسەکردنیدا تەماشای منی دەکرد. زۆر سەیر تەماشای دەکردم، هەر دەتگوت یەکەمین منداڵم کە لە ژیانیدا بینیبێتی. وابزانم هەر لەبەرئەوە بوو کە هەردووکمان باڵامان ڕێک وەک یەک بوو. لەو کاتەدا کە خەریک بوو بەڕێبکەوین، هاتە پێشەوە و زەرەبینێکی پچکۆلەی لەناو کیفێکدا دەرهێنا. ئەوجا بە هەناسە برکێیەکەوە گوتی؛

«ئەمە لەگەڵ خۆتا بەرە (باوکم قسەکانی ئەوی بۆ وەردەگێڕام)، من کەرەتێکیان پارچە شوشەیەکی چکۆلەم لەناو سکی ئاسکە کێویەکی کوژراودا دۆزیەوە، دواتر سافمکرد و بوو بەم زەرەبینەی کە دەیبینیت. من دەزانم کە گەیشتنە لادێی "دۆرف"، تۆ پێویستت بەم زەرەبینە



دەبێت... بەڕاستی پێویستت دەبێت کوری باش. حەز دەکەم شتێکت پێ بڵێم؛ هەر کە چاوم پێت کەوت، زانیم لە سەفەرەکەتدا پێویستت بە زەرەبینێکی پچکۆلە دەبێت».

لە دڵی خۆمدا دەمگوت بڵێیت "دۆرف" هێندە لادێیەکی بچکۆلە بێت کە بە زەرەبین بدۆزرێتەوە. بەڵام من پێش ئەوەی بچمە ناو ماشێنەکەوە تەوقەیەکم لەگەڵدا کرد و سوپاسی دیارییەکەیم کرد. دەستی نەک تەنها لە دەستی من بچکۆلەتربوو، بەڵکو هەر زۆر ساردیش بوو.

باوکم جامەکەی دایاپەوە و بەدەستی خواحافیزبوونی لە کورتەبنەکە کرد، ئەویش هەردوو دەستە کورتەکانی ڕاوەشاند. لەو کاتەشدا کە باوکم سلفی لێدا، کورتە بنەکە گوتی؛

«ئێوە خەڵکی ئارەنداڵن، وانیە؟»

«ڕاستە»... باوکم وەڵامی دایەوە و کەوتە لێخوڕین.

«بەڵام چۆن زانی ئێمە خەڵکی ئارەنداڵین؟» ...لە باوکمم پرسی.

باوکم لە ئاوێنەکەوە تەماشایەکی کردم و گوتی؛

«تۆ خۆت پێت نەگوت؟»

«نەخێر!»

«با... خۆت پێت گوت... بەهەرحاڵ من ئەوەم پێ نەگوت».

من دەمزانی کە ئەوەم پێ نەگوتبوو. لە ڕاستیدا هەرچەندە ئەگەر پێشم بگوتایە کە ئێمە خەڵکی ئارەنداڵین، ئەو هەر هیچم لێ تێنەدەگەیشت، چونکە تەنانەت یەک وشەی ئەڵمانیشم نەدەزانی.

ئەو کاتەی گەیشتینەوە سەر شارێگاکە، پرسیارێکم لە باوکم کرد؛

«بە بڕوای تۆ بۆچی هێندە بچکۆلە بوو؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«نازانیت بۆ؟ ئەو پیاوە بۆیە بچکۆلەیە، چونکە مرۆڤێکی دەستکردە. جادووگەرێکی جولەکە چەند سەد ساڵێک لەمەوبەر دروستی کردووە».
بێگومان دەمزانی گاڵتەم لەگەڵدا دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوتم؛
«کەواتە تەمەنی چەند سەد ساڵێک دەبێت؟»
«ئەمەشیان هەر نازانیت؟ ...مرۆڤە دەستکردەکان وەکو ئێمە پیر نابن. ئەمەش تەنها لایەنێکی باشیە کە شانازی پێوە بکەن. بەڵام لە ڕاستیدا زۆر گرنگە، چونکە مانای ئەوە دەبەخشێ کە ئەوان هەرگیز نامرن».
لە کاتی لێخوڕیندا، زەرەبینەکەم دەرهێنا، تەماشای قژی باوکمم دەکرد و بۆ کرێش دەگەڕام. هیچی تیا نەبوو، بەڵام پشتی ملی چەند موویەکی ناشیرینی پێوە بوو.
کە لە سنووری سویسرا تێپەڕین، لەسەر ڕێگاکە نیشانەیەکمان بینی کە ئاماژەی بۆ لادێی دۆرف دەکرد. بە لاڕێگایەکی باریکدا پێچمانکردەوە و بەرەو شاخەکانی ئەلپ سەرکەوتین. لەوێدا تا ڕادەیەک چۆڵەوانی بوو، تەنها ئەوەندە لێرەولەوێ چەند خانوویەکی بچوک و سادەی سویسریمان دەبینی کە لە نێوان دارەکانی شاخە بەرزەکاندا دروستکرابوون، دەنا هیچی تر نەدەبینرا.
دونیا بەرەو تاریکبوون دەچوو، منیش خەریک بوو لەسەر کوشنەکەی دواوە خەوم لێدەکەوت. خەریک بوو بە ڕاستی خەوم لێبکەوێت، لەو کاتەدا باوکم ماشێنەکەی وەستاند و گوتی؛
«کاتی جگەرە کێشانە!»
لە ماشێنەکە دابەزین و هەوایەکی پاکی شاخەکانی ئەلپمان هەڵمژی. دونیا بەتەواوەتی تاریک بووبوو، ئەستێرەکانی ئاسمانیش دەتگوت





فەرشێکی کارەباییە و هەزارەها گڵۆپی بچوک بچوکی پێوەیە و بە کزی دەسوتێن.
باوکم چووە قەراغی ڕێگاکەوە و میزی کرد. ئەوجا گەڕایەوە لام و جگەرەیەکی داگیرساند. دواتریش پەنجەی بۆ ئاسمان هەڵبڕی و گوتی؛
«من و تۆ چەندە بچکۆلەین. ئێمە چەند شکڵێکی لیگۆی چکۆلەین و دەمانەوێت بە ماشێنێکی فیاتی کۆنەوە لە ئارەنداڵەوە بگەینە ئەسینا. هووها! چەندە بچکۆلەین، لەسەر دەنکە نۆکێکی سەوز دەژین! لەدەرەوە _مەبەستم لەدەرەوەی ئەم تۆوە پچکۆلەیەیە کە لەسەری دەژین، هانس تۆماس_ چەندەها ملیارد گەلەهەسارەی (مەجەرە) لێیە. هەریەکەشیان لە سەدەها ملیۆن ئەستێرە پێکهاتووە. مەگەر هەر خوا بزانێت چەندە هەسارە لەو ئاسمانەدایە!»
جگەرەکەی تەکاند و ئەوجا بەردەوامی بە قسەکانی دا؛
«برادەر... من پێم وانیە تەنها بین، بە هیچ جۆرێک تەنها نین. گەردوون پڕە لە ژیان. تەنها ئەوەندەیە کە هەرگیز ناتوانین ڕاست و دروست لە تەنهایی خۆمان دڵنیابین. گەلەهەسارەکان لە چەند دوورگەیەکی دوور دەچن کە هیچ جۆرە پاپۆڕێک نایانگاتێ.
ڕاستە باوکم چەند لایەنێکی سەیری هەبوو، بەڵام من هەرگیز پێم وانەبووە کە قسەکردن لەگەڵیدا ناخۆشبێت. بەلایەنی کەمەوە دەبوایە هەرگیز بەوە ڕازی نەبوایە کە لەناو کەشتیەکدا کاری چەورکردنی ئامێرەکانی بکات. گەر بە من بوایە، دەبوایە موچەی فەیلەسوفییان بدایەتێ. خۆشی کەرەتێکیان ئاماژەی بۆ شتێکی نزیک لەم بابەتەوەکرد و گوتی؛ ئێمە وەزارەتمان بۆ چەندەها شتی جیاواز جیاواز داناوە، بەڵام هیچ وەزارەتێکمان نیە کە ناوی وەزارەتی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





فەلسەفە بێت. تەنانەت وڵاتە گەورەکانیش لەو بڕوایەدان کە پێویستیان بەو جۆرە وەزارەتانە نەبێت».

باوکم زۆربەی هەرە زۆری جارەکان کە باسی دایکمی نەدەکرد، باسێکی فەلسەفی دادەمەزراند. منیش هەروەک ئەوەی هەمان سیفاتی ئەوم بۆ مابێتەوە، جارجارێک بەشداری باسە فەلسەفیەکانیم دەکرد. لەپڕێکدا گوتم؛

«هەرچەندە گەردوون گەورەیە، بەڵام ئیدی ئەوە مانای ئەوە نیە کە ئەم زەویە دەنکە نۆکێکی سەوز بێت».

باوکم شانەکانی هەڵتەکاند، جگەرەکەی فڕێدا و دانەیەکی نوێی داگیرساند. بەشێوەیەکی گشتی باوکم کە باسی ژیان و ئەستێرەکانی دەکرد، گوێی بۆ ڕای خەڵکانی تر نەدەگرت. بەڵکو زیاتر لەسەر بۆچوونەکانی خۆی سووردەبوو. ئەوجا لەبری ئەوەی وەڵامم بداتەوە، گوتی؛

«بەڵام ئەی ئێمە لە کوێوە هاتووین، هانس تۆماس؟ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە؟»

زۆر جار بیرم لەوە کردبۆوە، بەڵام دەشمزانی کە گوێ بۆ وەڵامەکانی من شلناکات. هەر لەبەرئەوە وازم لێهێنا لەسەر قسەکانی بەردەوام بێت. باوکی خۆمە و باشم دەناسی، من ئەوەندە فێربووبووم کە بێ دەنگ بمێنمەوە باشترە. کەمێک دواتر گوتی؛

«دەزانیت نەنە کەڕەتێکیان چی گوت؟ ... گوتی لە ئینجیلدا خوێندومەتەوە کە خودا لە ئاسماندا دانیشتووە و بە مرۆڤ پێدەکەنێت، چونکە باوەڕی پێناکەن».

«ئەی بۆ باوەڕی پێناکەن؟» ...هەمیشە وا ئاسانتربوو کە پرسیاری لێبکەم وەک لەوەی وەڵامی بدەمەوە.





«باشە... ئەگەر خوایەک هەبێت و ئێمەی ئافەراندبێت، کەواتە ئێمە لەبەرچاوی ئەودا شتێکی دەستکردین... دەکرێت کەسێکی فرەبێژبین، لەگەڵ یەکتریدا ناتەبابین و شەڕبکەین. یەکدی بەجێبهێڵین و بمرین. تێدەگەیت؟ لە هەمان کاتیشدا زیرەکین، دەتوانین قومبەلەی ئەتۆمی دروستبکەین و موشەک بنێرینە سەر مانگ. بەڵام هیچ یەکێکمان ناپرسێت ئێمە لە کوێوە هاتووین. تەنها ئەوەندەیە کە لێرەداین و هیچی تر».

«بەو شێوەیەش خوا پێمان پێدەکەنێت؟»

«ڕێک تەواوە! هانس تۆماس، ئەگەر بمانتوانییایە مرۆڤی دەستکردمان دروستبکردایە و بیانتوانییایە بە ئارەزووی خۆیان قسە بکەن _بۆ نمونە دەربارەی بۆرسە و پێشبڕکێی ئەسپسواری_ وە لەهەمان کاتدا هەرە سادەترین و هەرە گرنگترین پرسیاریان نەکردایە، مەبەستم لەوەیە گەر نەیانپرسیایە بە چ شێوەیەک هاتوونەتە بوون... ئەوا بەڵێ، ئەوسا بەڕاستی دەبوونە مایەی پێکەنینمان».

ئەوجا پێش ئەوەی بەردەوامی بە قسەکانی بدات، تێر تێر پێکەنی؛

«برادەر، دەبوایە کەمێک زیاتر ئینجیلمان بخوێندایەتەوە. دوای ئەوەی خودا ئادەم و حەوای خولّقاند، لە باخچەکەدا دەهات و دەچوو و سیخوڕی دەکردن. مەبەستم لەوەیە بە مانای وشە سیخوڕی دەکردن. لەپشت پەرژینەکانەوە خۆی مات کردبوو و زۆر بەوردی چاوی لەسەر دانابوون، ئاگای لە هەموو شتێک بوو کە دەیانکرد. تێدەگەیت؟ بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی چاویان لەسەر بتروکێنێت... ئەو ئاوها سەرقاڵی ئافەریدەکانی بوو. هەڵبەتە من لێرەدا لۆمەی ناکەم، نەخێر، نەخێر... بەڵکو هەر زۆر باش لێی تێدەگەم».



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

ئەوجا جگەرەکەی کوژاندەوە و بەو شێوەیەش وەستانی ئەم جارەمان کۆتایی پێهات. لە دڵی خۆمدا دەمگوت؛ من کوڕێکی بەختەوەرم، چونکە پێش ئەوەی بگەینە یۆنان، سی چل کەرەتێک بەو شێوەیە بۆ جگەرەکێشان دەوەستین.

لەناو ماشێنەکەدا زەرەبینەکەم دەرهێنا، ئەو زەرەبینەی کە کورتەبنە سەیرەکە پێی بەخشیم. بڕیارمدا کە زەرەبینەکەم بۆ لێکۆڵینەوەی سروشتی بەکاربهێنم. گەر تەنها ئەوەندە بوارم هەبێت لەسەر زەوی پاڵبکەوم و بەوردی تەماشای مێرووڵەیەک بکەم یان بە جوانی لە گوڵێک ورد ببمەوە، ئەوا پێدەچێت چەند نهێنیەکی سروشت دەربخەم. ئەو کاتە دەمتوانی بیانکەم بە دیاری جەژنی لەدایکبوونی مەسیح و پێشکەشی باوکمی بکەم، لێرەشەوە لەوانەیە کەمێک ئارامیم پێببەخشیایە.

لێخوڕینمان بە شاخەکانی ئەلپدا درێژەی کێشا، هەر دەڕۆیشتین و دەڕۆیشتین، بەڕاستی زۆری پێچوو هەتا گەیشتینە دۆرف.

«هانس تۆماس، خەوتوویت؟» ... ئەو کاتە ماوەیەکی زۆر تێپەڕیبوو، ڕێک لەو کاتەدا کە باوکم ئەو پرسیارەی لێکردم، خەریک بوو بەڕاستی خەوم لێدەکەوت. بەڵام هەر کەوتم نەء نەخەوتووم، یەکسەر خەوەکەم زڕا. ئەوجا باوکم گوتی؛

«دەزانی چی، هانس تۆماس... وابزانم ئەو کورتەبنەیە هەڵیخڵەتاندین».

منیش بە منگەمنگێکەوە وەڵامم دایەوە؛

«مەبەستت لەوەیە کە بەڕاستی زەرەبینەکەی لە ناو سکی ئاسکە کێویەکدا نەدۆزیوەتەوە؟»



«تۆ ماندوویت هانس تۆماس... مەبەستم لە ڕێگاکەیە. تێناگەم بۆچی کورتەبنەکە ئەم لاڕێگا چۆڵەی نیشاندایین، خۆ بە شارێگاکەشدا هەر دەمانتوانی بە شاخەکانی ئەلپدا تێپەڕین. دواهەمین خانوو کە بینیبێتم، چل کیلۆمەترێک لەوەوپێش بوو ـ زۆر پێشتریش شوێنێکم بەرچاوکەوت کە بتوانین شەوی تێدا بکەینەوە».

لەبەر هیلاکی نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە. بەڵام هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە باوکمم زۆر خۆشدەوێت، پێم وابێت لەم بوارەدا کەس ناتوانێت شان بدات لە شانم. دەبوایە لەناو کەشتیەکدا کاری نەکردایە، نا، نا... بەڵکو دەبوایە ڕێگەیان پێبدایە لەگەڵ فریشتەکانی ئاسماندا باسی نهێنیەکانی ژیانی بکردایە. باوکم دەیگوت فریشتەکان لە مرۆڤ زۆر زیرەکترن. ئەوان وەک خودا دانا نین، بەڵام بەبێ ئەوەی پێویستیان بە بیرکردنەوە هەبێت، دەتوانن لە سەرجەمی هەموو ئەو شتانە تێبگەن کە مرۆڤ دەتوانێت لێیانتێبگات.

«بۆچی ناردینی بۆ دۆرف؟ گرەوەدەکەم بەرەو لادێی کورتەبنەکانمان دەنێرێت».

ئەوە دواهەمین ڕستەی بوو کە گوێم لێبوو، دواتر خەوم لێکەوت. خەونم بە لادێیەکەوە بینی کە پڕبوو لە کورتەبنە. هەمووشیان زۆر میهرەبان بوون. هەموویان لەیەک کاتدا دەربارەی شتی جۆراوجۆر قسەیان دەکرد، بەڵام کەسیان نەیاندەزانی لە چ شوێنێکدان و لە کوێشەوە هاتوون.

وەک خەوێک لەیادمە باوکم لە ماشێنەکەدا بەرزیکردمەوە و هەتا ناو جێگاکەم هەڵیگرتم. لەو ناوەدا بۆنی هەنگوین دەهات. گوێم لە دەنگی ئافرەتێکیش بوو کە گوتی؛ "بەڵێ، بەڵێ... بێگومان بەڕێز".



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**سێی قەرە**

**...بەڵام بەلاتەوە کەمێک سەیر نیە کە ئاوا ناو ئەم دارستانە لەدوری ئاواییەوە بڕازێننەوە...**

کە بۆ بەیانی خەبەرم بۆوە، ئەوجا زانیم کە گەیشتوینەتە دۆرف. باوکم لە جێگاکەی تەنیشتمەوە خەوتبوو. کاتژمێر هەشتی بەیانی بوو، بەڵام پێم وابێت هێشتام کاتی ئەوە نەهاتبوو کە باوکم هەستێت. ئەو هەمیشە پێش ئەوەی بخەوێت، هەرچەندە گەر زۆر درەنگیش بوایە، پێکێکی پچکۆلەی دەخواردەوە. ئەو خۆی پێی دەگوت «پێکێکی پچکۆلە»، دەنا لە ڕاستیدا پێکێکی هەر زۆر گەورەی دەخواردەوە. جاری واش هەبوو کە چەند پێکێکی وای یەک بەدوای یەکدا دەخواردەوە.

لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەمکرد و دەریاچەیەکی گەورەم بینی. یەکسەر جلەکانم لەبەرکرد و خۆم گەیاندە قاتی خوارەوە. لەوێدا ئافرەتێکی قەڵەو و ڕووخۆشم بینی، هەرچەندە یەک وشەی نەرویجیشی نەدەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڕاستی هەوڵیدەدا قسەم لەگەڵدا بکات.

لە نێوان قسەکانیدا چەند جارێک گوتی "هانس تۆماس"... کەواتە لەو کاتەدا کە دوێنێ شەو باوکم بردبوومیە سەرەوە، منی پێناساندبوون. من تەنها ئەوەندە تێگەیشتم.

چوومە سەر چیمەنەکەی بەردەم دەریاچەکە و سواری جۆلانەیەکی سەیروسەمەرەی تایبەت بە ئەلپەکان بووم. پەتەکانی هێندە



درێژبوون، کە بە ئاسانی لەکاتی جۆلانەدا دەمتوانی سەقفی خانووەکان ببینم. منیش هەر جۆلانێم دەکرد و تەماشای لادێ بچۆلەکەم دەکرد. هەتا بەرزتریش ببومایەتەوە، زیاتر و زۆرتری لادێکەم دەبینی.

حەزمدەکرد باوکم خەبەری ببوایەتەوە. بێگومان ئەگەر بەرۆژ "دۆرف"ی ببینیایە، ئەوا دەبورایەوە. بەڕاستی دۆرف لە لادێیەک دەچوو کە لە بووکەشوشە دروستکرابێت. لە نێوان کۆمەڵێک شاخی بەرزی بەبەفرداپۆشراوەوە چەند دوکانێک لەسەر یەک دوو کۆڵانی تەسکدا دروستکرابوون. لەو کاتانەدا کە بە جۆلانەکەمەوە دەچوومە ئاسمان، هەر دەتگوت تەماشای یەکێک لە لادێکانی "شاری لیگۆ" دەکەم. ئوتێلەکەش بینایەکی سپی سێ قاتی بوو، چەندین پەنجەرەی بچکۆلەی ڕەنگاوڕەنگی تێدابوو و هەر یەکەشیان چوارچێوەیەکی تەختەی پەمەیی هەبوو.

لەو کاتەدا کە لە جۆلانێ کردن بێزاربووم، باوکم هاتە دەرەوە و هاواریکرد؛ کاتی نان خواردنی بەیانیە.

بۆ نانخواردن چووینە شوێنێکەوە کە لەوانەیە بە پچوکترین شوێنی نانخواردنی جیهان دابنرێت. تەنها جێگەی چوار مێزی تێدا بوو، بەڵام جگە لە من و باوکم هیچ میوانێکی تری لێنەبوو. لەتەنیشت ئەو ژووری نانخواردنەوە، چێشتخانەیەکی گەورەی لێبوو، بەڵام ئەوکاتە داخرابوو.

هەستم دەکرد باوکم ویژدانی کەمێک ئازاریدەدات، چونکە لە من زیاتر خەوتبوو، هەرلەبەرئەوە داوام لێکرد لەبری شیر ساردیەکم بۆ بکڕێت و لەگەڵ نانی بەیانیدا بیخۆمەوە. بێ سێ و دوو ڕازیبوو، بەڵام لەبەرامبەردا ئەویش داوای پەرداخێک مەشروبی کرد. لەوانەیە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

کەمێک سەیر بێتە بەرگوێ، بەڵام خواردنەوەکەی ئەو تا ڕادەیەکی زۆر هەر لە شەرابی سوور دەچوو. لێرەشەوە دڵنیابووم کە تا سبەینێ بەیانی لەوێدا دەمێنینەوە.

باوکم دەیگوت ئەم شوێنەی کە ئێمەی تێداین، ناوی خانەی میوانە، بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە پەنجەرەکانی لە پەنجەرەی ئوتێلێکی ئاسایی دەچێت.

خانەی میوانەکەمان ناوی "ڤاڵدەمار" بوو، بە دەریاچەکەشیان دەگوت "ڤاڵدەمارسە". ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، هەردووکیان لە ناوی هەمان "ڤاڵدەمار"ەوە هاتوون.

باوکم قومێکی لە شەرابەکەی دا و گوتی؛

«هەڵی خڵەتاندین».

یەکسەر تێگەیشتم کە مەبەستی لە کورتەبنەکەیە. وابزانم ئەو ناوی "ڤاڵدەمار" بوو.

«بە ڕێگایەکی پێچ و پەنادا هاتووین؟»... لەباوکمم پرسی.

«هەر پێچ و پەنا؟ چ لێرەوە بۆ "فێنیسیا" و چ لە بەنزینخانەکەوە بۆ "فێنیسیا"، هەمان ماوەی پێدەچێت. لە هەردوو لاوە ڕێک هەمان بڕی کیلۆمەتر دوورە. بەکورتی لەدوای ئەوەی کە پرسیاری ڕێگاکەمان کرد، هەموو ئەو ڕێگایەمان هەتا ئێرە بە خۆڕایی بڕیوە».

ئەوجا منیش گوتم؛

«شەیتان!» ...من زۆربەی کاتەکانم لەگەڵ باوکمدا بەسەر دەبرد، هەر لەبەرئەوەش واملێهاتبوو کەمێک لاسایی زمانەکەی ئەو بکەمەوە کە لە جیهانی کەشتیوانیەوە فێربووبوو... پاشان باوکم گوتی؛

«تەنها دوو حەفتەمان لەبەردەستدا ماوەتەوە و پێشم وانیە هەر کە گەیشتینە ئەسینا ئیدی دەماودەم دایکت بدۆزینەوە»







بێگومان منیش هەروەک ئەو مەبەستم بوو کە بیدۆزینەوە، هەر لەبەرئەوە لێم پرسی؛

«ئەی بۆ ئەمڕۆ ناتوانین بەردەوام بین؟»

«تۆ لە کوێوە دەزانیت کە ئەمڕۆ بەردەوام نابین؟»

تاقەتم نەبوو وەڵامی بدەمەوە، بەڵام تەنها ئاماژەیەکم بۆ مەشروبەکەی کرد.

ئەوجا باوکم دەستی کرد بە پێکەنین. دەنگی قاقای پێکەنینی، ژنە قەڵەوەکەشی خستە پێکەنین، هەرچەندە بە هیچ شێوەیەک نەیدەزانی ئێمە باسی چ شتێک دەکەین... دواتر باوکم گوتی؛

«دوێنێ شەو نزیکەی کاتژمێری یەک گەیشتینە ئێرە، لەبەرئەوە پێموایە هەقی ئەوەمان هەبێت کە ڕۆژێکی پشوو بەخۆمان بدەین، مەبەستم ئەوەیە تەنها بۆئەوەی بێینەوە سەر خۆمان»

شانەکانم بۆ هەڵتەکاند. لەڕاستیدا من بووم کە پێم خۆش نەبوو بەردەوام هەر لێبخورین و لێبخورین، بەبێ ئەوەی لە شوێنێک لابدەین و بمێنینەوە. لەبەرئەوە نەمویست نارەزایی دەرببڕم. بەڵام بەردەوام بیرم لەوەش دەکردەوە کە بەڕاستی دەیەوێت «بێتەوە سەر خۆی»، یان نیازی هەیە بە درێژایی ڕۆژەکە خواردنەوەی قورس بخواتەوە.

باوکم جانتاکانی لەناو فیاتەکەدا دەرهێنا... دوێنێ شەو کە گەیشتبووینە ئوتێلەکە، جگە لە فلچەی دانەکانمان زیاتر، هیچی تری لەگەڵ خۆیدا نەهێنابووە سەرەوە.

کاتێک کە باوکی "بەڕێز"م هەموو شتەکانی ناو ماشێنەکەی دەرهێنا، هەردووکمان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە پیاسەیەکی تێروتەسەلی بۆ



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



بکەین. ئافرەتی ناو چێشخانەکە شاخێکی جوانی نیشانداین کە دەیڕوانەیە سەر ناوچەیەکی ئەفسوناوی، بەڵام گوتی ڕۆژەکە هێندەی نەماوە و ڕۆیشتنە سەرەوە و هاتنە خوارەوە شاخەکەش ماوەیەکی زۆری پێدەچێت.

ئەوجا باوکم بیرۆکەیەک لە بیرۆکە نایابەکانی بۆ هات؛ چی بکەین ئەگەر حەزبکەین لە شاخێکەوە بێینە خوارەوە و لەهەمان کاتیشدا نەمانەوێت بە شاخەکەدا سەربکەوین؟ ئەوسا پرسیاردەکەین و دەڵێین؛ ئایا هیچ ڕێگایەکی ماشێن هەیە کە بمانگەیەنێتە سەر شاخەکە؟ بێگومان ڕێگای ماشێن هەیە... ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە.

بەڵام ئەگەر بە ماشێن بچووینایەتە سەر شاخەکە و بە پێ بهاتینایەتە خوارەوە، ئەوا دواتر هەر ناچاردەبووین بچینەوە سەر شاخەکە، بۆ ئەوەی ماشێنەکەمان بهێنینەوە خوارەوە.

«بەتەکسی دەڕۆینە سەر شاخەکە و لەوسەرەوە بە پێ دێینە خوارەوە»... باوکم ئەوەندەی گوت و ڕێک واشمان کرد.

ئافرەتەکە تەلەفونی بۆ تەکسیەک کرد و پاش ماوەیەک گەیشتە لامان. لە پێشدا وایزانی کە شێتین، بەڵام باوکم چەند "فرانک"ێکی سویسری بۆ لەراندەوە و ئەویش کنتومت بە دڵی ئێمە جولایەوە.

ئافرەتی خانەی میوانەکەمان لە کورتەبنەکەی بەنزینخانەکە کارامەتربوو لە شارەزایی ڕێگاوبان و نیشاندانی ناوچەکەدا. هەرچەندە ئێمە خەڵکی نەرویج بووین[2] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز شاخێکی ئاوها و دیمەنێکی ئاوهامان نەبینیبوو.

[2] مەبەستی لەوەیە کە نەرویج وڵاتێکی شاخاویە.





لە خواری خوارەوە بە هەزارحاڵ دەریاچەیەکی بچکۆلەمان دەبینی، کۆمەڵێک خانووی هەر زۆر زۆر بچکۆلەش چواردەوریان گرتبوو. ئەوێ لادێی دۆرف و دەریاچەی "ڤاڵدەمارسە" بوو.

هەرچەندە ناوەڕاستی هاوین بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەر شاخەکە تەواو ساردبوو. باوکم گوتی ئێستاکە لەسەر ئاستی دەریاوە هەر زۆر بەرزین، زۆر بەرزتر لەوەی کاتێک لەسەر شاخەکانی نەرویج دەبین. هەتا بڵێیت دیمەنەکە بەلای منەوە جوان بوو، بەڵام باوکم نائومێدبوو. ئەو دەیویست وا بڕوابکەم کە هەموو پیلانی پیاسەکردنی شاخەکەمانی لەوەوپێش دارشتبێت، تەنها بەو ئومێدەی کە لەوێوە بتوانین دەریاری ناوەڕاست ببینین. پێم وابێت مەزەنەی ئەوی کردبوو کە لەوێوە بتوانێت دایکم ببینێت و بزانێت لە یۆناندا خەریکی چیە...

دواتر باوکم گوتی؛

«ئەو کاتەی لەناو دەریادابووم، ڕێک خۆمم لەسەر پێچەوانەی ئەم حاڵەتەی ئێستام ڕاهێنا. وام لێهاتبوو بۆ ماوەی چەندین سەعات و چەندین ڕۆژ لەناو پاپۆڕدا بمێنمەوە بەبێ ئەوەی بەتەواوەتی وشکانی ببینم».

هەوڵمدەدا مەزەنەی ئەو حاڵەتە بکەم. بەڵام باوکم هەروەکو ئەوەی بیرکردنەوەکانم بخوێنێتەوە گوتی؛

«ئێستاکە زۆر باشترە... هەمیشە ئەو کاتانەی کە ناتوانم دەریا ببینم، هەستدەکەم لە زینداندام».

هێدی هێدی بە شاخەکەدا هاتینە خوارەوە. بەناو چەند دەوەنێکی بەرزدا ڕێگایەکمان گرتەبەر. لەوێشدا دیسانەوە بۆنی هەنگوین دەهات.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

پاش ماوەیەک بۆ پشوودان دانیشتین. من زەڕەبینەکەم دەرهێنا و باوکیشم جگەرەیەکی داگیرساند. مێروولەیەکم بینی بەسەر چیلکەیەکدا دەهات و دەچوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەدەوەستا، لەبەرئەوە نەمتوانی بەتەواوەتی لێی وردببمەوە. دواتر مێروولەکەم لە چیلکەکە تەکاند و لەبری ئەو کەوتمە لێکۆڵینەوەی چیلکەکە. بە گەورەیی زۆر قەشەنگ دەهاتە بەرچاو ، بەڵام بەداخەوە هیچ شتێکی نوێم تێدا نەبینی.

لە پڕێکدا لەنێوانگەڵاکانەوە خشەخشێک هات. باوکم داچڵەکی، لەوەدەچوو پێی وابێت چەتە و شتی وا لەو ناوەدا هەبێت. بەڵام ئاسکە کێویەک بوو. بۆ ماوەی چەند چرکەیەک وەستا و تەماشای کردین، دواتر خۆیکردەوە بەناو دارستانەکەدا و ونبووەوە. تەماشایەکی باوکمم کرد، ئەویش هەروەک ئاسکەکە ترسی لێنیشتبوو. لەو کاتە بەدواوە هەمیشە هەستمدەکرد کە باوکم ئاسکە کێویە، بەڵام هەرگیز نەموێرا ئەو راستیەی پێبڵێم.

هەرچەندە باوکم ئەم پێش نیوەڕۆیە پەرداخێک مەشروبی خواردبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەواو چالاک و پر لە ژیان دەهاتە بەرچاو. بە نەرمە راکردنێک لە شاخەکەوە هاتینە خوارەوە و بەردەوام هێواش هێواش رامانەدەکرد، نەوەستاین هەتاوەکو لە پانتاییەکی پچکۆلەی ناو دارەکاندا چاومان بە کۆمەڵێک بەردی سپی کەوت کە بەڕیز لەسەر یەک هێڵ دانرابوون. چەند سەد دانەیەک دەبوون، هەمووشیان لوس و خڕبوون، هیچ یەکێکیشیان لە کلۆ شەکرێکی بچکۆلە گەورەتر نەبوو.

باوکم لە شوێنی خۆیدا وەستا و ملێکی بۆ خوراند، منیش لێم پرسی؛

«بڵێیت لێرەدا بروێن؟»



باوکم سەرێکی راوەشاند و گوتی؛

«لێرەدا بۆنی خوێنی مەسیحی دێت، هانس تۆماس».

«بەڵام بەلاتەوە کەمێک سەیر نیە کە ئاوا ناو ئەم دارستانە لەدوری ئاواییەوە برازێننەوە؟»

یەکسەر وەڵامی نەدامەوە، بەو شێوەیەش تێگەیشتم کە لەگەڵمدا تەبابوو.

باوکم تەنها رقی لەو حاڵەتانەبوو کە تێیدەکەوت و نەیدەتوانی لێکیبداتەوە. لەو کاتانەشدا کەمێک لە "شارلۆک هۆلمس" دەچوو.

«لە قەبرسان دەچێت. هەموو بەردێکی بچوک چەند سانتیمەترێکی دوجای گرتووە»...

وابزانم دەیویست بڵێت کە خەڵکی دۆرف لێرەدا چەند مرۆڤێکی لیگۆی بچکۆلەیان ناشتووە، بەڵام ئەمە تەنانەت بەلای باوکیشمەوە رێی تێنەدەچوو. هەربۆیە دواتر گوتی؛

«لەوانەیە چەند منداڵێک لێرەدا خاڵخاڵۆکەیان ناشتبێت».

لەوەدەچوو باوکم نەتوانێت لێکدانەوەیەکی باشتر بدۆزێتەوە.

منیش سەرم بەسەر یەکێک لە بەردەکاندا شۆڕکردەوە، بەزەڕەبینەکەم تەماشامکرد و گوتم؛

«لەوانەیە... بەڵام خاڵخاڵۆکەکان ئەو بەردانەیان دانەناوە».

باوکم دایە قاقای پێکەنین. دەستێکی خستە سەر شانم و ئەوجا کەمێک هێواشتر بە شاخەکەدا هاتینە خوارەوە.

پاش کەمێک بەلای کوخێکی دارینڈا تێپەڕین و لێم پرسی؛

«بڵێیت کەس لەوێدا بژی؟»

«بێگومان خەڵکی تێدا دەژی!»

«چۆن دەتوانی هێندە دڵنیابیت؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

پەنجەی بۆ دوکەڵکێشەکە ڕاکێشا. دوکەڵێکی لاوازی لێوە بەرزدەبووەوە.
ڕێک لەخوار کوخەکەوە کانیەکی بچکۆلەمان بینی، بۆریەکی لێوە هاتبووە دەرەوە و ئێمەش تێرمان لە ئاوەکەی خواردەوە. باوکم دەیگوت ئەوە "بەلوعەی ئاوە".





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**چواری قەرە**

**...لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە لە دەستمدابوو، کتێبێکی بچکۆلەبوو...**

عەسرێکی درەنگ گەیشتینەوە دۆرف و باوکم گوتی؛
«ئێستاکە کاتی نانخواردنێکی بەلەزەت هاتووە».
چێشتخانە گەورەکە کرابووەوە، لەبەرئەوە ناچارنەبووین دیسانەوە خۆمان بخزێنینەوە ناو ژووری نانخواردنە بچکۆلەکەوە. کۆمەڵێک خەڵکی لادێکە بە خۆیان و پەرداخە پڕ لە بیرەکانیانەوە، بەدەوری مێزێکدا خڕبووبوونەوە.
ئێمە باستورمە و کەلەرمی ترشی سویسریمان خوارد. بۆ دوای نانخواردنیش، کێکێکمان بەتامی سێو و کرێمی تایبەت بە ناوچەی ئەلپەکان داواکرد.
دوای نانخواردن باوکم گوتی دەمەوێت "مەشروبی ئەلپەکان" تاقیبکەمەوە، هەربۆیە لە شوێنی خۆی جوڵەی بۆ نەکرد. منیش بە خۆم و شوشەیەک ئاوی تووتڕکی سوورەوە بەرەو ژوورەکەی سەرەوە ملی ڕێگام گرت... من ئەو دیمەنەم بەلاوە جوان نەبوو. وابزانم لەوەوپێش بیست کەرەتێک گۆڤاری "ئاندەرسی مراوی"ی نەرویجیەکەم خوێندبۆوە، وا دیسانەوە بۆ دواجار دەستمکردەوە بە خوێندنەوەی. دواتر دەستمکرد بە یاری کاغەز. دوو کەڕەت "حەوت حەوت" کاغەزەکانم دانا، بەڵام هەردوو جارەکە لەگەڵ دانانی دوا کاغەزدا، یەکسەر یاریەکەم قفڵ دەبوو. پاشان بڕیارمدا سەرلەنوێ بەرەو چێشتخانەکە بڕۆمەوە.
ویستم پێش ئەوەی باوکم بەتەواوەتی سەرخۆشبێت، قەناعەتی پێبکەم لەگەڵمدا بێتەوە ژوورەکەی سەرەوە و چیرۆکی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



ئۆقیانووسەکانم بۆ بگێڕێتەوە. بەڵام بەئاشکرا دیاربوو کە هێشتام بەتەواوەتی تێری لە "مەشروبی ئەلپەکان"ی نەخواردبووەوە. جگە لەوەش بە ئەڵمانی کەوتبووە قسەکردن لەگەڵ خەڵکی لادێکەدا.
«ئێ دەبڕۆ بۆ خۆت پیاسەیەکی ناو لادێکە بکە»... ئاوها وەڵامی دامەوە. پێم ناخۆشبوو کە داواکەمی ڕەتکردەوە. بەڵام ئەمڕۆکە... ئای، ئەمڕۆکە زۆر زۆرم پێخۆشە کە ئەوکاتە ڕێک بەقسەی ئەومکرد. پێموابێت من، لەچاو باوکمدا، لەژێر ئەستێرەیەکی بەختەوەرتردا لەدایکبووم.

لادێکە هەر زۆر بچوک بوو، لەبەرئەوە "پیاسەی ناو لادێکە"م کتومت پێنج خولەکی خایاند. تەنها یەک شەقامی هەبوو و پێیان دەگوت شەقامی "ڤاڵدەمار". دیاربوو خەڵکی ئەم لادێیە زۆر داهێنەر نەبوون.
باوکم بەتەواوەتی پەستی کردم، چونکە لەگەڵ خەڵکی لادێکەدا مایەوە و مەشروبی ئەلپەکانی دەخواردەوە. ناوی «مەشروبی ئەلپەکان!»، کەمێک لە ناوی عارەق جوانتر دەهاتە بەرگوێ. کەرتێکیان باوکم گوتی «من بۆیە دەخۆمەوە، بۆ ئەوەی لەشم ساغبێت، هەر لەبەرئەوەشە ناتوانم واز لە خواردنەوە بهێنم». من چەندەها جار ئەو ڕستەیەم لەبەرخۆمەوە دەگوتەوە و دەگوتەوە، ئەوجا لێی تێگەیشتم. بەشێوەیەکی ئاسایی خەڵکی پڕاوپڕ پێچەوانەکەی دەڵێن، بەڵام خۆ ڕێشی تێدەچێت کە باوکم کەسێکی نائاسایی بەدەگمەن بێت. خۆ ئەو هەروا بە خۆڕایی "کوڕە ئەڵمانی" نەبوو.
هەموو دوکانەکانی لادێکە داخرابوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماشێنێکی شتومەک لەبەردەمی دوکانێکدا وەستا و شتی بۆ داگرت.





لەوناوەدا کچێکی سویسری یاری بە تۆپێک دەکرد و دەیگرتە دیوارەکەی بەرامبەری، پیاوێکی پیریش لەژێر دارێکی گەورەدا دانیشتبوو و پایپی دەکێشا... هەرئەمەندە بوو! هیچی تری لێنەبوو. ڕاستە خانووەکانی ئەم لادێیە جوان و ئەفسوناوییبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستم دەکرد لادێکە هەتا بڵێیت وشک و ناخۆش بێت... جگە لەوەش تائێستاش نەمدەزانی بۆچی کورتەبنەکە کاتی خۆی گوتی کە گەیشتیتە "دۆرف" پێویستت بە زەڕەبینێک دەبێت.
تەنها شتێکیش کە کەمێک دڵی خۆشدەکردم، ئەوەبوو کە بۆ بەیانی درێژەمان بە سەفەرەکەمان دەدا. بۆ سبەینێش، یان نیوەڕۆکەی یان ئێوارەکەی دەگەینە ئیتاڵیا. لەوێشەوە بەناو یوغسلافیادا بەرەو یۆنان لێدەخوڕین. لە یۆنانیشدا لەوانەیە دایە ببینین. بەتەواوەتی پەرۆشی ئەو کاتەم.
بەلارولەنجە بەرەو نانەواخانەیەک پەڕیمەوە جادەکەی ئەوبەر. نانەواخانەکە تەنها دوکانێک بوو کە تا ئەو کاتە نەمبینیبوو. لەناوەوەدا لەتەنیشت سینیەکی گەورەی پڕ لە کێکەوە، شوشەیەکی ماسی دانرابوو، تەنها یەک ماسی پرتەقاڵی تێدابوو. قەراغی سەری سەرەوەی شوشەکە پارچەیەکی گەورەی لێبووبووەوە. ڕێک بەهەمان ئەندازەی ئەو زەڕەبینە دەبوو کە کورتەبنە پڕ نهێنیەکەی بەنزینخانەکە پێی بەخشیم. زەڕەبینەکەم لە گیرفانم دەرهێنا، کیفەکەیم لێکردەوە و لێی وردبوومەوە. کەمێک لە پارچە شکاوەکەی شوشەی ماسیەکە پچکۆلەتربوو.
ماسیەکی چکۆلەی پرتەقاڵی لەناو شوشەکەدا لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر مەلەی دەکرد. بێگومان هەموو ڕۆژێک وردە کێکی دەدەنێ. لەدڵی خۆمدا گوتم لەوانەیە لەوەوپێش ئاسکە کێویەک ویستبێتی ماسیە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

پرتەقاڵیەکە بخوات و لەبری ئەو گازی لە شوشەکە گرتبێت و پارچەیەکی لێ خواردبێت.

لەناکاودا خۆری ئەو ئێوارەیە پەنجەرەکەی بڕی و شوشەی ماسیەکەی ڕووناککردەوە. ئەوجا بۆمدەرکەوت کە ڕەنگی ماسیەکە تەنها پرتەقاڵی نیە. بەڵکو لەڕاستیدا ڕەنگی سوور و زەرد و سەوزیشی تێدابوو. دواتر ڕەنگی شوشەکە و ئاوەکەش هەمان ڕەنگی ماسیەکەیان گرت، هەموو ڕەنگەکان تێکەڵبوون. هەتا زیاتریش لە ماسی و ئاو و شوشەکە ورددەبوومەوە، زیاتر و زۆرتر خەیاڵم دەڕۆیشت و نەمدەزانی لە چ شوێنێکی جیهاندام. بۆ چەند چرکەیەکیش هەستمدەکرد من ماسی ناو شوشەکەم و ماسیەکەش لە دەرەوەڕا تەماشام دەکات.

لەو کاتەدا کە ئاوها تەماشای ماسیەکەم دەکرد، لەپڕێکدا پیاوێکی پیری سەرسپیم لە پشت مێزی نانەواخانەکەوە بینی. تەماشایەکی کردم و بەدەستی ئاماژەی بۆ کردم کە بچمە ژوورەوە.

سەیربوو بەلامەوە کە بەو ئێوارە وەختەیە نانەواخانەیەکی ئاوها کراوەبێت. لەپێشدا ئاوڕێکی بەپەلەم لە چێشتخانەکە دایەوە. ویستم بزانم باوکم هێشتام هەر "مەشروبی ئەلپەکان" دەخواتەوە... بەڵام چاوم پێنەکەوت، ئەوجا دەرگاکەم کردەوە و چوومە ژوورەوە.

زۆر بەڕێزەوە بە زمانی سویسری سڵاوم لە پیاوەکەکرد، لەڕاستیدا ئەوە تەنها وشەبوو کە بە سویسری دەمزانی.

هەریەکسەر هەستمکرد کە نانەوایەکی ڕووخۆشە. منیش دەستم کێشا بە سنگی خۆمدا و گوتم نەرویجیم! تەنها بۆ ئەوەی تێیبگەیەنم کە هیچ لە زمانەکەی ئەو نازانم.



پیاوە پیرەکە خۆی بەسەر مێزە مەرمەڕەکەدا چەماندەوە و ڕێک تەماشای نێوچاوانی کردم و گوتی؛

- بەڕاستی خەڵکی نەرویجیت؟ منیش چەندین ساڵ لەوەوبەر لە نەرویجدا دەژیام، بەڵام پاش ئەو هەموو ساڵە، وا خەریکە بەتەواوەتی "نەرویجی زمانم" بیردەچێتەوە.

ئاوڕێکی دایەوە و دەرگای یەخچاڵێکی کۆنی کردەوە. پاش کەمێک شوشەیەکی ساردی ڕاکێشایە دەرەوە و هەڵیپچڕی، ئەوجا لەسەر مێزەکە داینا و گوتی؛

«دەزانم حەزت لە ساردیە... وانیە؟ بەڕاستی تامی ئەم ساردیە خۆشە، فەرموو برادەرە گەنجەکەم»

چەند قومێکم لە ساردیەکەدا. تامەکەی زۆر لە تامی ئەو ساردیە خۆشتربوو کە لە چێشتخانەکە خواردمەوە. پێموابێت ئاوی هەرمێ بوو.

پیاوە پیرە سەرسپیەکە دیسانەوە خۆی بەسەر مێزەکەدا چەماندەوە و بەچرپەیەک گوتی؛

«خۆشە؟»

«بەلەزەتە»

دیسانەوە چرپاندیەوە بەگوێمدا و گوتی؛

«وایە بەتامە. ڕاستە ئەم ساردیە زۆر خۆشە، بەڵام ئێمە لەم لادێیەدا جۆرە ساردیەکی تریشمان هەیە کە زۆر زۆر لەمە خۆشترە، تەنها ئەوەندەیە کە لە دوکانەکاندا نافرۆشرێت، نازانم لەمەبەستم تێدەگەیت یان نا؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

سەرێکم بۆ لەقاند. پیاوەکە زۆر سەیر دەیچرپاند و خەریکبوو ترسم لێبنیشێت. بەڵام کە سەرم هەڵبڕی و تەماشای چاوە شینەکانیم کرد، سیمای پیاوێکی میهرەبان هاتە بەرچاوم. پاشان پێم گوت؛

«من خەڵکی ئارەندالم. من و باوکم بەرەو یۆنان دەچین بۆ ئەوەی دایکم بدۆزینەوە. بەداخەوە ئەو لە جیهانی مۆدەدا ونبووە».

ئەوجا بە تیژی تەماشای کردم.

«برادەر... گوتت ئارەندال؟ وە جێشی هێشتووە؟ لەوانەیە چەندەها خەڵکی تریش لەوێوە رایانکردبێت. منیش کاتی خۆی چەند ساڵێک لەو "گریم"ە "ستاد"دا دەژیام[3] بەڵام وابزانم ئێستاکە خەڵکی ئەوێ منیان بەتەواوەتی لەیادکردووە».

سەیرێکم کرد. بڵێیت بەڕاستی لە "گریمستاد"دا ژیابێت؟ ئەو شارە لەتەنیشت شارەکەی خۆمانەوە بوو. زۆر جار من و باوکم لە هاویناندا بەبەلەم دەچووینە ئەوێ. دواتر بە پرتەپرتێکەوە گوتم؛

«ئەو شارە هێندە... هێندە لە ئارەنداڵەوە دوورنیە»

[3] لێرەدا نووسەر کەمێک یاری بە وشەکان دەکات؛ وشەی "گریم" واتە ناشیرین، وە وشەی "ستاد" واتە شار یان شارۆچکە، واتە وەک ئەوە وایە بڵێت "لەو شارە ناشیرینەدا" دەژیام. بەڵام لە راستیدا وشەی "گریمستاد" بەسەریەکەوە ناوی شارۆچکەیەکی نەرویجیە. هەروەک چۆن ئێمە لە کوردیدا ناوی "دێ کۆن"مان هەیە، واتە وەک ئەوە وایە بڵێت لەو "کۆنە" "دێ"یەدا دەژیام، بەڵام وشەی "دێ کۆن" بەسەریەکەوە ناوی لادێیەکی کوردستانە.و







«نا، نا، نزیکە[4]. من دەمزانی گەنجە کورێک رۆژێک لەرۆژان ئێرە دێت. برادەر، ئەو بۆ ئەوە دێت کە گەنجینەکەی بدەمێ. ئێستاکە گەنجینەکە بەتەنها هی من نیە»

لە پڕێکدا گوێم لەباوکم بوو بانگی دەکردم. هەر بەدەنگیا دیاربوو کە بڕێکی باشی ئارەقی ئەلپی نۆشکردووە.

«زۆر سوپاس بۆ ساردیەکەت. وا گوێم لە باوکمە بانگم دەکات، لەبەرئەوە ناچارم بەجێتبهێڵم».

«بابە، بەڵێ بەڵێ. فەرموو برادەر. بەڵام بەیارمەتیت کەمێک ناوەستیت. لەو کاتەدا کە تۆ ماسی تەماشات دەکرد، منیش ڕیزێک سەموونم خستە فڕنەکەوە. بینیمیت کە زەرەبینەکەت پێبوو. ئەوجا دڵنیابووم کە تۆ ئەو کوڕەیت کە من چاوەڕوانی بووم. بەڵام دواتر تێدەگەیت، کوڕەکەم... دواتر تێدەگەیت...».

نانەوا پیرەکە ڕۆیشتە ژوورەکەی ئەودیوو. کەمێک دواتر بەخۆی و چوار سەموونەوە گەڕایەوە، خستنیە ناو زەرفێکەوە. لەو کاتەدا کە زەرفەکەی دامێ، زۆر بە مەبەستەوە رووی تێکردم و گوتی؛

«دەبێت پەیمانێکی گرنگم بدەیتێ... پەیمانم بدەرێ کە گەورەترین سەموون بهێڵیتەوە و لەو کاتەدا بخۆیت کە بەتەنها بیت و کەسی ترت لەدەور نەبێت. وە هەروەها نابێت هیچ شتێک لای هیچ کەسێک بدرکێنیت. تێگەیشتیت؟»

منیش گوتم؛

«بەڵێ، بەڵێ... زۆر سوپاس بۆ هەموو شتێک».

[4] لێرەدا نانەواکە بە نەرویجیەکی خراپ قسەدەکات.و



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



چرکەیەک دواتر خۆم لەناو شەقامەکەی دەرەوەدا بینیەوە. شتەکان زۆر بەپەلە روویاندا، لەبەرئەوە تەنها ئەو کاتەم لەیادە کە باوکم لەنێوان نانەواخانەکە و "خانەی میوانی ڤاڵدەمار"دا بینی.

پێمگوت کە نانەوا پیرەکە کاتی خۆی لە "گریمستاد"دا ژیاوە، هەروەها پێشمگوت کە ساردیەک و چوار سەموونی داومەتێ. باوکم پێیوابوو هەموو ئەوانەم لە خەیاڵی خۆمەوە دروستکردبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە رێگەی گەڕانەوەماندا بۆ ئوتێلەکە، یەکێک لە سەموونەکانی خوارد. منیش خۆم دوانم خوارد. گەورەترینیشیانم لەناو زەرفەکەدا هێشتەوە.

باوکم هەر کە لەسەر جێگاکە پاڵکەوت، یەکسەر خەوی لێکەوت. منیش لەسەر جێگاکەی خۆم پاڵکەوتبووم و هەردوو چاوم زەقەی دەهات، بەردەوام بیرم لە پیاوە پیرەکە و ماسیە پرتەقاڵیەکە دەکردەوە. پاش ماوەیەکیش برسێتی زۆری بۆ هێنام و خۆم گەیاندە لای زەرفی سەموونەکە. لەسەر کورسیەکە دانیشتم و هەر بەو تاریکیە گازێکم لە سەموونەکە گرت.

لەناکاودا دانم بەر شتێکی ڕەق کەوت. هەموو هەویری چواردەوری شتە ڕەقەکەم لێکردەوە. دواتر ئەو شتە ڕەقەی کە لەدەستمدا مایەوە شتێک بوو کە لە ئەندازەی شقارتەیەک گەورەتر نەبوو. لەو کاتەدا باوکم بەقوڵی خەوتبوو و دەیپرخاند، منیش گڵۆپی لای کورسیەکەم بۆ داگیرساند.

لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە لە دەستمدابوو، کتێبێکی بچکۆلەبوو. لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو «ساردیە ئەرخەوانیەکە و دوورگە خەیاڵیەکە». لاپەڕەکانی کتێبەکەم هەڵدایەوە. ڕاستە زۆر بچوکبوو، بەڵام ژمارەی لاپەڕەکانی لە سەد تێدەپەڕی، پیتەکانیش زۆر زۆر بە وردی



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

نووسرابوون. یەکەم لاپەڕەم کردەوە و ویستم بیخوێنمەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێک نەمتوانی. لەپڕێکدا زەڕەبینەکەم بیرکەوتەوە... ئەوەی کە کورتەبنەکە لە بەنزینخانەکەدا پێی بەخشیم. دەستم کرد بە گیرفانی پانتۆڵەکەمدا و کیفەکەم بەردەست کەوت، زەڕەبینەکەم لەناو کیفە سەوزەکەدا دەرهێنا و خستمە سەر پیتەکانی یەکەمین لاپەڕە. هێشتام هەر زۆر بچوکبوون، بەڵام کاتێک بەسەر کتێبەکەدا خۆم چەماندەوە و لە زەڕەبینەکە نزیک کەوتمەوە، بەئاسانی دەمتوانی بیخوێنمەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



پێنجی قەرە

...لەوکاتەدا گوێم لێبوو ئەو پیاوە پیرە لەناو بۆشایی سەقفەکەدا دەهات و دەچوو...

ڕێگە بەخۆمدەدەم کە ناوت بنێم "کوڕە شیرینەکەم". من وا دانیشتووم و خەریکی نووسینەوەی چیرۆکی ژیانمم، هاوکات دەزانم ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆ ڕێت دەکەوێتە ئەم لادێیە. لەوانەیە بە ڕێکەوت بەلای نانەواخانەکەی سەر شەقامی "ڤالْدەمار"دا تێپەڕیت و تەماشای ماسیە پرتەقاڵیەکەی ناو شوشەکە بکەیت. تۆ خۆت نازانیت بۆ دێیت، بەڵام من دەزانم کە تۆ بەو مەبەستە دێیتە "دۆرف" کە بەردەوامی بە چیرۆکی دوورگەی خەیاڵی و خواردنەوە ئەرخەوانیەکە بدەیت.
من ئەم دێڕانە لە مانگی یەکی ساڵی **1946** دا دەنووسم و ئێستاکە پیاوێکی گەنجم. بەڵام بێگومان ئەو کاتەی لەپاش سی چل ساڵێکی تر دەمبینیت، سەرتاپای سەرم سپی بووە. بەم شێوەیەش من ئەم چیرۆکە تەنها بۆ کاتی ئێستاکە نانووسم، بەڵکو بۆ ڕۆژگارێکیشی دەنووسم کە لەپاش خۆم دێت.
کوڕە نەناسراوەکەم، ئەم پەڕانەی کە من چیرۆکەکەمی لەسەر دەنووسمەوە، وەک بەلەمێکی فریاگوزاری وایە. لەوانەیە بەلەمێکی ئاوها پێشئەوەی بەرەو بەندەرێکی دوور بڕوات، ناچاربێت بەناو ڕەهێڵە و باوبۆراندا تێپەڕبێت. بەڵام هەندێک لەو بەلەمانە بەئاڕاستەیەکی تەواو جیاوازدا دەڕۆن، ئەوان بەرەو "وڵاتی بەیانی" دەڕۆن. لەوێشەوە ئیدی هیچ ڕێگایەکی گەڕانەوە بوونی نیە.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

ئەی من بە چ شێوەیەک دەزانم کە تۆ (نەک کەسێکی تر) دێیت و بەردەوامی بە چیرۆکەکەم دەدەیت؟... کوڕەکەم، من ئەو کاتە دڵنیادەبم کە تۆ بەرەوڕووم دێیت. ئەو کاتە دەتوانم ئەو نیشانەیە ببینم کە تۆ لەگەڵ خۆتدا دەیهێنیت.
چیرۆکەکەم بە زمانی نەرویجی دەنووسمەوە، ئەمەش نەک تەنها بۆ ئەوەیە کە تۆ بتوانیت لێی تێبگەیت، بەڵکو لەهەمان کاتدا بۆ ئەوەشە کە خەڵکانی دۆرف نەتوانن چیرۆکی کورتەبنەکان بخوێننەوە. گەر بتوانن... بەڵێ، ئەو کاتە نهێنی دوورگە خەیاڵیەکە دەبێتە هەواڵێکی وروژێنەر. بەڵام هەواڵێکی وروژێنەریش هەمیشە وەک دەنگ و باسێکی خێراتێپەڕ وایە و هیچی تر، دەنگ و باسیش هەرچیەک بێت هەرگیز بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ نامێنێتەوە. بەڵکو تەنها بۆ ماوەیەک سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێت و پاشانیش لەیاددەکرێت. بەڵام من نامەوێت چیرۆکی کورتەبنەکان هەرگیز لەناو ڕووناکی کزی دەنگ و باسەکاندا ونببن. مەبەستم لەوەیە کە یەک کەس نهێنی کورتەبنەکان بزانێت، باشترە لەوەی هەموو خەڵکی لەیادی بکەن.

من یەکێک بووم لەو خەڵکە زۆرانەی کە لەدوای جەنگی جیهانی دووهەمەوە بەدوای داڵدەیەکدا دەگەڕام. ئەو کاتە لەپڕێکدا نیوەی ئەوروپا بووبە ئۆردووگای پەنابەران و بەشێکی گەورەی جیهان کەوتە بەر لێشاوی جوڵە و ڕۆیشتن. بەڵام ئێمە تەنها پەنابەری ڕامیاری نەبووین، بەڵکو هاوکات کەسانێکی بێ وڵات بووین و بەدوای خۆماندا دەگەڕاین.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



دواتر بۆ ئەوەی بتوانم ژیانێکی نوێ بۆ خۆم دابمەزرێنم، ناچاربووم ئەڵمانیا بەجێبهێڵم. بەڵام لەو ڕۆژانەدا من فەرماندەیەکی بچکۆلەی سوپای نازیەکان بووم، لەبەرئەوە هێندە بواری هەڵهاتنم لەبەردەستدا نەبوو.

من خۆم تەنها لەبەردەم نەتەوەیەکی تێکشکاودا نەبینیەوە، بەڵکو ئەو کاتەی لە باکورەوە گەڕامەوە، خۆشەویستیەکی دۆڕاویشم لەگەڵ خۆمدا هێنایەوە. هەموو جیهان لەبەرچاومدا وەک چەند بەشێکی بچوک بچوک، پەرش وبڵاو بووبووەوە.

دەمزانی کە ناتوانم لە ئەڵمانیادا بژیم، بەڵام لەهەمان کاتیشدا نەمدەتوانی بگەڕێمەوە بۆ نەرویج. دواتریش توانیم لەڕێگەی شاخەکانەوە خۆم بگەیەنمە سویسرا.

لەوێدا بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک بێهودە و سەرلێشێواو بۆ خۆم هەر دەخولامەوە، تا دواتر لە لادێی "دۆرف"دا ئاشناییم لەگەڵ نانەوایەکی بەتەمەندا پەیداکرد، ئەو ناوی "ئەلبێرت کلاگس" بوو.

لەشاخەکەوە هێدی هێدی دەهاتمە خوارەوە. برسێتی و ڕۆیشتنی بەردەوامی هەموو ڕۆژەکەش بە تەواوەتی شەکەت و ماندووی کردبووم. لەپڕێکدا چاوم بە لادێیەکی بچکۆلە کەوت. برسێتیەکەم پاڵی پێوەنام کە وەک دڕندەیەک بەخێرایی بەناو دارەکانی دارستانەکەدا بێمە خوارەوە. پاش کەمێک خۆمم لەبەردەم کوخێکی دارینی کۆندا بینیەوە. لەوێدا گوێم لە گیزەگیزی هەنگ بوو و بۆنی شیر و هەنگوینیش دەهات.

هەڵبەتە وای بۆ دەچم دواتر ئەو نانەوا پیرە منی بردبێتە ژوورەوە. کاتێکیش لەسەر جێگای خەوەکەی ژوورەوە خەبەرم بووەوە، چاوم بە پیاوێکی سەر سپی کەوت لەسەر لانکە کورسیەک دانیشتبوو و پایپی





دەکێشا. بەڵام هەر کە بینی من چاوم کردۆتەوە، خێرا خۆی گەیاندە لام و وەک ئەوەی بیەوێت دڵنەواییم بداتەوە گوتی؛

«هاتوویتەتەوە ماڵەوە کوڕە ئازیزەکەم. من دەمزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان دێیتە بەردەرگاکەم... بۆ ئەوەی گەنجینەکە وەرگریت، کوڕەکەم».

دەبێت پاش ئەوە خەوم لێکەوتبێتەوە، چونکە کە دواتر چاوم کردەوە هەر خۆم بەتەنها لە کوخەکەدابووم. لەسەر جێگاکە هەستام و چوومە بەر هەیوانەکەی دەرەوە. لەوێدا پیاوە پیرەکە دانیشتبوو و خۆی بەسەر مێزێکی بەردیندا چەماندبووەوە. شوشەیەکی جوان لەسەر مێزەکە دانرابوو و ماسیەکی پڕ ڕەنگیش لەناویدا مەلەی دەکرد.

سەرم سوڕما و لەدڵی خۆمدا گوتم چۆنە ماسیەکی بچکۆلەی دەریایەکی دوورەدەست، ئاوها بەئاسانی و پڕ لە چالاکیەوە دەتوانێت لێرەدا مەلەبکات، لەکوێشدا... لەسەر شاخێکی بەرزی ناوەڕاستی ئەورووپادا. وا دەهاتە بەرچاوم کە بەشێکی بچکۆلەی زیندووی دەریایان گواستبێتەوە بۆ سەر شاخەکانی سویسرا. ئەوجا سڵاوێکم لە پیاوە پیرەکە کرد و گوتم؛

«ئەم کاتەت باش!»

ئاوڕێکی لێدامەوە و زۆر بەنەرمی تەماشای کردم، منیش خۆم پێناساند؛

«من ناوم "لودفی"یە».

«منیش ناوم "ئەلبێرت کلاگس"ە».

دیسانەوە خۆیکردەوە بەناو کوخەکەیدا، بەڵام پاش کەمێک هاتەوە دەرەوە و لەگەڵ خۆیدا نان و شیر و پەنیر و هەنگوینی هێنا.

پەنجەی بۆ لادێکەی خوارەوە ڕاکێشا و گوتی؛ ئەو لادێیە ناوی "دۆرف"ە و لەوێدا من نانەواخانەیەکم هەیە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک لەلای ئەو پیاوە پیرە مامەوە. دواتر لەگەڵیدا دەچوومە نانەواخانەکەی[5]. ئەلبێرت فێری دروستکردنی نان و سەمون و چەندەها جۆری کێکی کردم. من لەوەوپێش بیستبووم کە سویسریەکان دەستێکی باڵایان لە دروستکردنی کێکدا هەیە. ئەلبێرتیش بەتایبەتی پێی خۆشبوو لە هەویرشێلاندا یاریدەی بدەم. وەکی تریش من ئەو کاتە پیاوێکی گەنجبووم و پێمخۆشبوو لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵبم، هەر لەبەرئەوە کەرەتێکیان سەردانی "خانەی میوانی ڤاڵدەمار"م کرد.

پێموابێت خەڵکی لادێکە منیان خۆشدەویست. ڕاستە دەیانزانی کە من لەوەوپێش سەربازێکی ئەڵمانی بووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس پرسیاری ڕابووردومی نەدەکرد.

ئێوارەیەکیشیان باسی ئەو "ئەلبێرت"ەیان کرد کە منی هەڵگرتەوە. جوتیارێک بەناوی "فریتز ئاندرێ"وە گوتی؛

«ئەلبێرت شێت بووە».

دوکاندارێکیش بەناوی "هێنریک ئەلبریتس"ەوە وەڵامی دایەوە و گوتی؛

«بەڵام نانەواکەی پێش ئەویش هەر شێتولکە بوو».

منیش خۆم لە باسەکەیان هەڵقورتاند و ویستم بزانم مەبەستیان لە "شێتی" چیە، بەڵام ڕاستەوخۆ وەڵامیان نەدەدامەوە. هاوکات چەند

---

[5] نانەواخانەکانی ئەورووپا جگە لە نان، چەندەها جۆری کێکیش دروستدەکەن و دەیفرۆشن.



پەرداخێک شەرابم خواردبۆوە و ڕوومەتەکانم گەرم داهاتبوون، ئەوجا گوتم؛

«ئاساییە پێم نەڵێن مەبەستتان چیە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەبێت بەو شێوەیە ئەو کەسە تاوانبار نەکەن کە نانتان بۆ دروستدەکات و ئێوەش دەیخۆن!»

ئەو ئێوارەیە چیتر دەربارەی "ئەلبێرت" باسنەکرا، بەڵام چەند حەفتەیەک دواتر "فریتز" دیسانەوە باسی ئەوی هێنایەوە پێشەوە و گوتی؛

«تۆ دەزانیت ئەو هەموو ماسیە پرتەقاڵیانەی لەکوێوە هێناوە؟»

سەرنجم دابوو کە زیاتر حەزیاندەکرد لەگەڵ مندا قسەبکەن، چونکە من لەگەڵ ئەلبێرتدا لە هەمان خانوودا دەژیام. پاشان لە وەڵامدا گوتم؛

«نەمزانیبوو کە لە یەک دانە زیاتری هەیە، بەڵام لەوانەیە لە دوکانی ماسی فرۆشەکەی "زیوریخ" کڕیبێتی»

هەر لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانمدا، هەم دوکاندارەکە و هەم جوتیارەکەش کەوتنە پێکەنین. ئەوجا جوتیارەکە گوتی؛

«زۆر زۆری هەیە. من باوکم خۆی بینیبوونی، کەرەتێکیان لەڕێگەی گەڕانەوەیدا لەڕاوەوە ئەلبێرتی بینیبوو هەموو ماسیە پرتەقاڵیەکانی هێنابووە دەرەوە. هەر هەموویانی خستبووە بەر هەتاوەکە. زۆر زۆریش بووبوون، دڵنیابە زۆر بووبوون، تێدەگەیت کوڕە نانەوا...»

پاش ئەوە دوکاندارەکە هەڵیدایە؛

«جگە لەوەش هەرگیز نەچۆتە دەرەوەی دۆرف. ئێمە ڕێک هاوتەمەنی یەکترین و هێندەی من ئاگاداربم، هەرگیز لە دۆرف دوور نەکەوتۆتەوە».



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

جوتیارەکەش بەچرپەچرپ گوتی؛
«هەندێ خەڵکیش دەڵێن جادووگەرە و پێیان وایە کە تەنها نان و کێک دروست ناکات، بەڵکو جگە لەوانەش ماسیەکانیشی دروستدەکات. بەلایەنی کەمەوە لە یەک شت دڵنیاین؛ ئەو ماسیانەی لەم ناوەدا نەگرتووە».
منیش هێدی هێدی کەوتمە گومانەوە و پرسیارم لە خۆم دەکرد؛ بڵێیت بەڕاستی ئەلبێرت نهێنیەکی شاردبێتەوە؟ تا ئێستاکەش هەندێ لە رستەکانی لە گوێمدا دەزرنگێنەوە؛ «هاتوویتەتەوە ماڵەوە کوڕە ئازیزەکەم. من دەمزانی رۆژێک لە رۆژان دێیتە بەردەرگاکەم... بۆ ئەوەی گەنجینەکە وەرگریت، کوڕەکەم».
بێگومان ئەگەر باس و خواسی سەر زاری خەڵکیم بگەیاندایەتە ئەو نانەوا پیرە، ئەوا هەستی بریندارەدەبوو. بەڵام ئەگەر نهێنیەکیشی هەبێت، ئەوا بەتەواوەتی دڵنیابووم کە لەکاتی گونجاودا بۆم دەدرکێنێت.

بۆ ماوەیەکی دورودرێژ پێموابوو خەڵکی بۆیە ئەو قسانە دەربارەی "ئەلبێرت" دەکەن، چونکە ئەو بەتەنها لە خانوویەکی سەرو ئاواییەکەدا دەژی. بەڵام لەڕاستیدا شتێک لە خانووە کۆنەکەیدا هەبوو کە سەرنجمی رادەکێشا.
کە دەچوویتە ناوەوە ژوورێکی دانیشتنی گەورە و ئاگردانێک دەهاتە بەردەمت. چێشتخانەیەکیش لەسوچێکی هەمان ژووردا دروستکرابوو. هەر ئەو ژوورە دوو دەرگای لەسەربوو، یەکێکیان دەچووە سەر ژووری خەوەکەی ئەلبێرت و ئەوی تریشیان دەچووە سەر ژوورێکی خەوی بچکۆلەتر. من پاش ئەوەی کە گەیشتمە دۆرف، لەو ژوورەدا دەخەوتم.



بنمیچی ئەو ژوورە بچکۆلەیە زۆر نزمبوو، بەڵام کە لەدەرەوەی خانووەکەوە تەماشام دەکرد، بەئاشکرا دەمبینی کە بۆشاییەکی گەورە لە نێوان بنمیچەکە و سەقفی خانووەکەدا هەبوو. لەسەرو ئەوانەشەوە کاتێک لەسەر گردەکەی پشت خانووەکەوە دەمڕوانی، بەئاسانی پەنجەرەیەکی چکۆلەم لە ناو سەقفی خانووەکەدا بەدیدەکرد.
بەلامەوە سەیربوو کە ئەلبێرت هەرگیز باسی ئەو بۆشاییەی نەدەکرد. هەرگیزیش لەوێدا نەمبینیبوو. بەڵام هەموو کەرەتێک کە برادەرەکانم ناوی ئەلبێرتیان دەهێنا، یەکسەر بیرم لەو بۆشاییە دەکردەوە.
بەڵام رۆژێکیان ئێوارە دەرەنگانێک لە دۆرفەوە هاتمەوە ماڵەوە. لەوکاتەدا گوێم لێبوو ئەو پیاوە پیرە لەناو بۆشایی سەقفەکەدا دەهات و دەچوو. بەتەواوەتی سەرم سوڕما (وابزانم کەمێکیش ترسام)، هەر لەبەرئەوەش خۆمگەیاندە کانیەکەی دەرەوە بۆ ئەوەی کەمێک ئاوم بهێنم. لە رێگادا هیچ پەلەم نەکرد، کە گەڕاشمەوە ئەلبێرت لەسەر لانکە کورسیەکەی دانیشتبوو و پایپی دەکێشا.
«درەنگ هاتیتەوە».
تەنها ئەوەندەی گوت، بەڵام هەستمکرد کە مەبەستی لە شتێکی ترە.
«لەسەرەوە بوویت؟»... لێم پرسی.
نازانم چۆن وێرام ئەو پرسیارەی لێبکەم، وشەکان خۆیان بۆ خۆیان لە دەممەوە هاتنە دەرەوە.
ئەلبێرت داچڵەکی، بەڵام پاش کەمێک هەروەک جاران بەشێوە نەرم و نیانەکەی تەماشای کردمەوە. هەمان ئەو دەموچاوەی هاتەوە بەرچاوم کە چەند مانگێک لەمەوبەر بینیم... ئەو کاتەی کە شەکەت و ماندوو لەبەردەم خانووە کۆنەکەیدا کەوتم و ئەو خزمەتی کردم.
پاش کەمێک پرسی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

«هیلاکیت لودفی؟»
سەرێکم بۆ ڕاوەشاند. ئێوارەی شەممەبوو و بۆ بەیانی دەمانتوانی تا ئەو کاتەی خۆر بەیارمان دەکاتەوە، بخەوین.
لەسەر لانکە کورسیەکەی هەستا و چەند پارچە دارێکی تری فڕێدایە ناو ئاگردانەکەوە. ئەوجا گوتی؛
«کەواتە ئەم شەو پێکەوە دادەنیشین»





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**شەشی قەرە**

**..ساردیەکی ترت بدەمێ کە تامەکەی هەزار جار لەم ساردیە خۆشتربێت...**

خەریکبوو بەسەر زەڕەبین و کتێبە بچکۆلەکەمدا خەوم لێبکەوێت. تا ئێستا هێندە تێگەیشتبووم کە سەرەتای حەکایەتێکی گەورەم خوێندبێتەوە، بەڵام هەستم نەدەکرد کە ئەو حەکایەتە هیچ پەیوەندیەکی بە منەوە هەبێت. پارچەیەکی بچوکم لە زەرفی سەمونەکە کردەوە و خستمە ناو ئەو لاپەڕەیەوە کە پێی گەیشتبووم.
لەوەوپێش کەڕەتێکیان لە یەکێک لە کتێبخانەکانی "ئارەنداڵ"دا کتێبێکی لەو بابەتەم بینی. کتێبێکی حەکایەتی هەر زۆر بچکۆلە بوو و لەناو قاوغێکی کەمێک لە خۆی گەورەتردا دانرابوو. بەڵام جیاوازیەکەی ئەوەبوو کە پیتەکانی ئەو کتێبە یەکجار گەورەبوون و لەیەک لاپەڕەدا تەنها پانزە بۆ بیست پیتێکی تێدا نووسرابوو. هەڵبەتە حەکەیاتێکی هێندە گەورەشی تێدا نەنووسرابووەوە.
کاتژمێر یەکی شەوبوو. پێش ئەوەی بخەوم، کتێبە بچکۆلەکەم خستە گیرفانێکی پانتۆڵەکەمەوە و زەڕەبینەکەشم لە گیرفانەکەی تردا دانا.
بەیانی زوو باوکم خەبەری کردمەوە. گوتی دەبێت کەمێک خێرابکەین و بکەوینەوە ڕێ. ئەگەر نا، ئەوا هەرگیز ناگەینە ئەسینا و ناچاردەبین بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. کەمێکیش توڕەبوو لێم، چونکە پارچە سەمونم لەسەر زەویەکە بڵاوکردبووەوە.
پارچەی سەمون! لە دڵی خۆمدا گوتم. کەواتە کتێبی ناو سەمونەکە خەون نەبوو. بەپەلە پانتۆڵەکەمم لەبەرکرد و لە هەردوو گیرفانەکەمدا هەستم بە شتێکی ڕەق دەکرد. دواتریش گوتم ئاخر نیوە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

شەو برسیمبوو و دواهەمین سەمونم خوارد، بەڵام نەمویست گلۆپەکە دابگیرسێنم. هەر لەبەرئەوەشە کە ئەو هەموو پارچە سەمونە لەسەر زەویەکە کەوتووە.
هەموو شتەکانمان کۆکردەوە و خستمانە ناو ماشێنەکەوە، ئەوجا بۆ نان خواردنی بەیانی بەپەلە خۆمان گەیاندە ژووری نانخواردنەکە. تەماشایەکی چێشتخانە بەتاڵەکەم کرد. کاتی خۆی لودفی لەوێدا دانیشتووە و شەرابی لەگەڵ برادەرەکانیدا خواردۆتەوە.
دوای نانخواردن "خانەی میوانی ڤاڵدەمار"مان بەجێهێشت و لەناو ماشێنەکەدا بۆی دانیشتین. کاتێکیش بەلای دوکانەکانی سەر شەقامی "ڤاڵدەمار"دا تێپەڕین، باوکم پەنجەی بۆ نانەواخانەکە ڕاکێشا و پرسی؛
«سەمونەکان هی ئەوێ بوون؟»
پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، نانەوا سەرسپیەکە خۆی هاتە سەر پلیکانەکانی دەرەوە و بەدەستی خواحافیزی لێکردین. دەستی بۆ باوکیشم ڕاوەشاند، باوکیشم بەهەمان شێوە دەستی بۆ ڕاوەشاندەوە.
پاش کەمێک گەیشتینەوە سەر شارێگاکە. بەئەسپایی زەڕەبین و کتێبە بچکۆلەکەم دەرهێنا و دەستم کردەوە بە خوێندنەوە. باوکم یەک دووجار پرسیاری لێکردم و دەیویست بزانێت لە دواوە خەریکی چیم. منیش گوتم بە زەڕەبینەکەم تەماشای کوشنەکەی دواوە دەکەم و بەدوای کێچ و ئەسپێدا دەگەڕێم. دواتریش کەڕەتێکی تر دیسانەوە پرسیاری لێکردمەوە، منیش گوتم بیر لە دایکم دەکەمەوە.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

بەرلەوەی ئەلبێرت بێتە پێشەوە و لەسەر لانکە کورسیەکەی دانیشت، لەناو قتوویەکی پچکۆلەی کۆندا هەندێ تووتنی دەرهێنا، خنیە ناو پایپەکەیەوە و دایگیرساند. ئەوجا دەستی بە قسەکرد و گوتی؛
«من لە ساڵی **1881** دا لەم لادێیەدا (لە "دۆرف"دا) لە دایکبووم. ئێمە پێنج خوشک و برا بووین و منیش بچوکترینیان بووم. لەوانەیە هەرلەبەر ئەم هۆیە بووبێت کە من لە هەموویان زیاتر هۆگری دایکم بووم. لەو سەردەمەدا کوڕان هەتا تەمەنی حەوت هەشت سڵان لەگەڵ دایکیاندا لەماڵەوە دەمانەوە، دواتریش هەر لە تەمەنی هەشت ساڵیەوە دوای باوکیان دەکەوتن و لە دارستان و کێڵگەکاندا یاریدەیان دەدان.
من هەموو ئەو ڕۆژە درێژ و ڕووناکانەم لەیادە کە لە چێشتخانەکەی ماڵەوەماندا کراسەکەی دایکمم دەگرت و دوای دەکەوتم. ئەو کاتە تەنها ڕۆژی یەکشەممان هەموو خێزانەکەمان کۆدەبووەوە. ئەو ڕۆژانەش هەموومان پێکەوە پیاسەیەکی دورودرێژمان بۆ دەکرد، کاتێکی زیاترمان بۆ نانخواردنی ئێوارە تەرخاندەکرد و شەویشمان بەدەم یاری "زار"ەوە بەسەردەبرد.
بەڵام پاش ماوەیەک کارەسات لەدوای کارەسات کەوتە ناو خێزانەکەمانەوە. هێشتام تەمەنم چوار سڵانبوو کە دایکم تووشی نەخۆشی سیل بوو. چەند ساڵێک لە ماڵەوەدا لەگەڵ ئەو نەخۆشیەدا ژیاین.
بێگومان ئەو کاتە من وەک کوڕێکی بچکۆلە لە هەموو شتێکی چواردەورم تێنەدەگەیشتم. بەڵام لەیادمە کە دایکم بەردەوام دەبوایە پشووی بدایە، بەرە بەرەش نەخۆشیەکەی ناچاریکرد بۆ ماوەیەکی دورودرێژ لە جێگادا بکەوێت. جار جارێکیش لەتەنیشت جێگاکەیەوە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



دادەنیشتم و حەکایەتم بۆ دەگێڕایەوە، هەڵبەتە هەر خۆشم هەموویم دەهۆنیەوە.

جارێکیان بینیم خۆی بەسەر مێزی نانخواردنەکەدا چەماندبۆوە و زۆر بە پیسی دەکۆکی. کە بینیشم خوێن دەهێنێتەوە، بەیەکجاری توڕەبووم و داروبەردی چێشتخانەکەم دا بەسەریەکدا. قاپ و سوراحی و پەرداخەکانم شکاند... هەر شتێک کە دەستم دەیگەیشتێ دەمشکاند. وا بزانم ئەوە یەکەمین جاربوو کە بیرم لەوە کردەوە کە دایکم ماوەیەکی تر دەمرێت.

هەروەها سەر لەبەیانی ڕۆژی یەک شەممەیەکیشم بە باشی لە بیرە... ئەو بەیانیە بەر لەوەی ئەوانی تر خەبەریان ببێتەوە، باوکم هاتە ژوورەکەم و گوتی؛

«ئەلبێرت، من و تۆ دەبێت کەمێک پێکەوە قسە بکەین... دایکت هێندەی نەماوە بمرێت».

منیش توڕەبووم و هاوارمکرد؛

«نامرێت... تۆ درۆ دەکەیت!»

بەڵام درۆی نەدەکرد. بۆ ماوەی چەند مانگێکی تریش پێکەوە بووین. هەرچەندە زۆر منداڵیش بووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پێش ئەوەی دایکم بمرێت، خۆمم لەسەر بیرۆکەی مردنی ئەو ڕاهێنابوو. هێدی هێدی دەمبینی دایکم لاوازتر و ڕەنگ زەردتر دەبوو. بەردەوامیش تای هەبوو.

کاتی سەر قەبران و ناشتنەکەشیم لە هەموو شتێکی تر باشتر لەیادە. منیش و هەردوو براکەشم ناچاربووین جلوبەرگی پرسە لە برادەرانی لادێکە بەقەرز وەرگرین. من تەنها کەس بووم کە نەگریام. من زۆر توڕەبووم لە دایکم، چونکە بەجێیهێشتین، هەر لەبەرئەوەش یەک





فرمێسکم بۆ هەڵنەڕشت. هەر لەو کاتەشەوە پێم وایە توڕەبوون باشترین دەرمان بێت دژی دڵتەنگی...».

لێرەدا پیاوە پیرەکە سەیرێکی کردم، وەک ئەوەی بزانێت کە منیش ماتەمینیەکی گەورەم لەناوەوەمدا هەڵگرتووە. دواتر بەردەوامی بە قسەکانی دا؛

«بەو شێوەیەش باوکم پێنج منداڵی بەسەردا کەوت. لەسەرەتادا توانیمان بەباشی ژیانمان بەڕێوە بەرین. جگە لە کارکردن لە کێڵگەیەکی بچوکدا، باوکم بوو بە پۆستەچی لادێکەش. ئەو کاتە هەموو دانیشتوانی "دۆرف" لە دووسێ سەد کەسێک زیاتر تێنەدەپەڕی. خوشکە گەورەکەشم کاری ماڵەوەی گرتبووە ئەستۆ، ئەو لەو کاتەدا کە دایکم مرد تەمەنی حەقدە سڵان بوو. ئەوانی تریش لە کێڵگەدا کاریاندەکرد، بەڵام من چونکە بچکۆلەبووم هیچ سوودێکی وام نەبوو و زۆربەی کاتەکان بەتەنها بۆ خۆم دەهاتم و دەچووم. زۆر جاریش دەچوومە سەر قەبرەکەی دایکم و دەگریام. ئەو کاتە هێشتام مردنەکەیم نەبەخشیبوو.

پاش ماوەیەک باوکم دەستیکرد بە خواردنەوە، لە پێشدا تەنها لە پشووی حەفتەکاندا و دواتریش بووە خویەکی ڕۆژانەی. وەک ئاکامێکی خواردنەوەکەشی، لە سەرەتادا کاری پۆستەچێتیەکەی لەدەستدا و دواتریش وردە وردە کێڵگەکەشمان دانا. هەردوو براکەم پێش ئەوەی بەتەواوەتی گەورەببن، بەرەو "زیوریخ" بۆی دەچوون. منیش هێشتام هەر دەخولامەوە و هیچ شتێکم نەدەکرد.

پاشان کە گەورەتریش بووم، گاڵتەیان پێدەکردم و پێیان دەگوت باوکت «خولیای ئاوی ترییە». هەر کەرەتێکیش باوکمیان بە بێ هۆشی لە شوێنێکی لادێکەدا دەدۆزیەوە، ڕێک دەیانهێنایەوە ماڵەوە و



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



دەیانخستە ناو جێگاکەیەوە. هەموو جارێک سزای منیان دەدا... هەمیشە پێم وابوو تەنها من دەبێت باجی مردنی دایکم بدەم.

دواجار برادەرێکی باشم بووبە تووشەوە، پێیان دەگوت "هانس"ی نانەوا. ئەو پیاوێکی پیری سەرسپی بوو و بۆ ماوەیەکی یەکجار دوورودرێژ نانەواخانەیەکی پچکۆلەی لە لادێکەدا دەبردبەڕێوە. هانس لە تەمەنی گەنجیدا هاتبووە دۆرف، مەبەستم لەوەیە لە دۆرفدا گەورە نەبووبوو، هەر لەبەرئەوەش هەمیشە وەک کەسێکی نامۆ تەماشایاندەکرد. سەرباری ئەوەش کەسێکی کەمدوو بوو. هیچ کەسێک لە لادێکەدا بەتەواوەتی نەیدەناسی.

کاتی خۆی "هانس"ی نانەوا دەریاوان بووە، بەڵام پاش چەندین ساڵ دەستی لە جیهانی دەریاوانی هەڵگرتووە و وەک نانەوایەک لەم لادێیەدا نیشتەجێبوو بوو... چەند کەرتێکی کەمیش لە نانەواخانەکەیدا بە دەرپێیەکی کورتەوە هات و چۆی کردووە و خەڵکی قۆڵە ڕووتەکانیان بینیبوو، لێرەشەوە هەر چوار خاڵەکوتراوەکەی کەوتبوونە بەرچاوی خەڵکی. هەر ئەمە خۆی لە خۆیدا کەمێک "هانس"ی نانەوای کردبووە کەسێکی سەیر، چونکە هیچ پیاوێکی تری ئاواییەکەمان خاڵیان لەسەر لەشیان نەکوتابوو.

من بەتایبەتی وێنەی ئەو ئافرەتەم دێتەوە بەرچاو کە لەسەر قۆڵی کوتابووی، ژنەکە لەسەر لەنگەرێکی گەورە دانیشتبوو و لەژێر وێنەکەدا ناوی "ماریا" نووسرابوو. خەڵکی چەندەها چیرۆکیان لەسەر ئەو ناوە هۆنیبووەوە. هەندێک دەیانگوت ئەو ئافرەتە دەستگیرانی بووە و پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە بیست ساڵ، بە نەخۆشی سیل مردووە. هەندێکی تریش دەیانگوت "هانس"ی نانەوا کەرەتێکیان





ئافرەتێکی ئەڵمانی کوشتووە کە ناوی "ماریا" بووە، وە هەر لەبەرئەوەش گواستوویەتیەوە بۆ سویسرا...»

ئەلبێرت تەماشایەکی کردم، هەستمدەکرد کە دەزانێت منیش لەدەست ئافرەتێک هەڵهاتووم. لەدڵی خۆمدا دەمگوت «خۆ لەو بڕوایەدا نیە کە منیش ئافرەتێکم کوشتبێت؟».

کەمێک دواتر درێژەی بەقسەکانیدا؛

«بەڵام چەند کەسێکی تر دەیانگوت "ماریا" ناوی ئەو کەشتیە بووە کە ئەم لەسەری بووە و پاشان لە شوێنێکی ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا نقومبووە».

ئالێرەدا ئەلبێرت هەستایە سەرپێ، چوو پارچەیەک پەنیری گەورە و نانێکی هێنا. ئەوجا دوو پەرداخ و بتڵێک شەرابیشی دانا و لێی پرسیم؛

«خۆ بێ تاقەتت ناکەم "لودفی"؟»

زۆر بە توندی سەرم بۆ ڕاوەشاند و نانەوا پیرەکەش کەوتەوە قسەکردن؛

«وەک گوتم من کوڕێکی فەقیربووم... جارجارێکیش ڕوویدەدا خۆمم لەبەردەم نانەواخانەکەی "ڤاڵدەما"دا دەبینیەوە. زۆربەی جارەکانیش کە دەچوومە ئەوێ برسیم بوو، بەڵام پێموابوو تەنها تەماشاکردنی ئەو هەموو نان و کێکانە یاریدەم بدات و کەمێک برسێتیەکەم بشکێنێت. بەڵام ڕۆژێکیان "هانس"ی نانەوا بەدەستی ئاماژەی بۆ کردم کە بچمە ناو نانەواخانەکەیەوە. پارچەیەک کێکی گەورەی دامێ، کشمیشی تێدابوو. لەو ڕۆژەوە دەمتوانی بڵێم برادەرێکم هەبوو. هەر لەو ڕۆژەشەوە مێژووی من دەستیپێکرد، لودفی.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



لەدوای ئەو ڕۆژەوە زیاتر و زۆرتر دەچوومە لای "هانس"ی نانەوا. پێم وابێت هەر لەسەرەتاوە دەیزانی کە من چەندە تەنیا و بێکەسم. هەرکاتێکیش برسیم بوایە، خێرا نانێکی گەرمی دەدامێ. هەندێ جاریش کێکێکی خۆشی پێدەبەخشیم، چەند جارێکیش ساردی بۆ هەڵدەپچریم. منیش لەبەرامبەردا کەمێک کۆمەکم دەکرد، دواتریش هێشتام سیانزە ساڵم پڕنەکردبۆوە و بوومە خەلفەی نانەوا. بەڵام بەرلەوەی ئەو ڕۆژە بێتە پێشەوە چەندەها ساڵی دوورودرێژم بەسەربرد. لەو کاتانەشدا دەمێک بوو ئەو وەک کوڕی خۆی تەماشای دەکردم.

باوکم لە هەمان ساڵدا مرد. ئەو بەمانای وشە بە خواردنەوە خۆیکوشت. هەتاوەکو دواهەمین ڕۆژیشی هەر دەیگوت «دەمەوێت لە ئاسماندا دایکت ببینم». هەردوو خوشکەکەشم لەدەرەوەی دۆرفدا شوویانکرد و ڕۆیشتن، لەدوای ئەو ڕووداوەشەوە ئیدی هەرگیز هیچ هەواڵێکی دوو براکەمم نەبیستەوە...».

پاش ئەم قسانە ئەوجا ئەلبێرت شەرابی کردە پەرداخەکانەوە. هەستا و چووە لای ئاگردانەکەوە و سوتووی پایپەکەی تەکاند، پڕیکردەوە لە تووتن و دایگیرساندەوە. پاشان دووکەڵێکی زۆری لەگەڵ هەناسەدانەوەیدا فڕێدایە ژوورەکەوە؛

«بەم شێوەیەش من و "هانس"ی نانەوا بووینە پاڵپشتی یەکتری. کەرەتێکیشیان وەک فریشتەیەک هات و ڕزگاریکردم. ئەو ڕۆژە هەر لەبەردەم نانەواخانەکەی ئەودا چوار پێنج کوڕی ئاوایی پەلاماریاندام. بەدەمدا خستیانم و بەئارەزووی خۆیان بە بۆکس تێمکەوتن. هەرچۆنێک بێت من بەو شێوەیە دێتەوە یادم. دەمێکبوو دەمزانی لەبەر چ هۆیەک پەلامارم دەدەن. لەڕاستیدا سزای ئەوە بوو





کە دایکم مردبوو و باوکیشم ئالودەی مەی بوو. بەڵام لەو کاتەدا "هانس"ی نانەوا هەر زۆر بەپەلە بۆیان دەرپەڕی، من ئەو وێنەیەم هەرگیز لەیاد ناچێت، لودفی. لەپێشدا منی لە ژێر دەستیان دەرهێنا و ئەوجا کەوتە کوتانی یەک بە یەکیان، هیچیان بەبێ لێدان بۆی دەرنەچوون. وابزانم زیاد لەڕادە لێیدان، بەڵام بەهەرحاڵ، لەو ڕۆژە بەدواوە ئیتر هیچ کەسێکی لادێکە نەیدەوێرا پەنجەیەکیشم بۆ بەرێت.

ئێ... ئەو شەڕەی ئەو ڕۆژە لەزۆر لایەنەوە بووبە خاڵێکی وەرچەرخانی ژیانم. "هانس"ی نانەوا بردمیە ناو دوکانەکەیەوە، کراسە سپیە درێژەکەی تەکاند و ساردیەکی بۆ هەڵپچریم، لەسەر مێزە مەرمەڕەکەی بەردەمم داینا و وەک فەرمانێک گوتی؛

«بیخۆرەوە!»

منیش ڕێک بەقسەی ئەوم کرد و هەر لەو کاتەدا هەستمکرد هەقی تێهەڵدانەکەم بەزیادەوە وەرگرتووە. هێشتام یەکەمین قوومی ساردیەکەم بەتەواوەتی نەچووبووە خوارەوە کە لێیپرسیم؛

«تامی خۆشبوو؟»

منیش هەر زۆر بەساکاری گوتم؛

«زۆر سوپاس».

هێشتام هەر کەمێک تورە و پەست دیابوو، دواتریش گوتی؛

«بەڵام ئەگەر ئەم ساریەت بەلاوە خۆش بێت، ئەوا پەیمانت دەدەمێ ڕۆژێک لە ڕۆژان ساردیەکی ترت بدەمێ کە تامەکەی هەزار جار لەم ساردیە خۆشتربێت».

بێگومان وامزانی ئەوە هەر قسەیەکە و هیچی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ئەو پەیمانەیەم لەبیرنەچووەوە. لە ڕاستیدا شێوەی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



گوتنەکەی وایلێکردم لەیادم بێت. جگە لەوەش کاتی وتنەکەشی هەر تایبەت بوو. ئەو هێشتام بەهۆی شەڕەکەی بەر دوکانەکەیەوە، ڕوومەتەکانی هەر سووربوون. بەدەر لەوانەش "هانس"ی نانەوا هیچ قسەیەکی هەروا بۆ خۆشی نەدەکرد...».

ئەوجا ئەلبێرت کلاگس "ئحم"ێکی بۆکرد و پاشانیش بۆی کۆکی. وابزانم دووکەڵەکە پەڕیە قورگی، بەڵام دیاربوو کە کەمێک پەستبوو. هەردووچاوە قورس و قاوەییەکانی بڕیبووە مێزەکە. ئەوجا گوتی؛

«هیلاکیت برادەر؟ حەزدەکەیت ڕۆژێکی تر باسەکەمان تەواوبکەین؟»

قومێکم لە شەرابەکەم دا و سەرێکم بۆ ڕاوەشاند، ئەویش بە ئەندێشەیەکی قووڵەوە بەردەوامبوو؛

«لەو کاتەدا تەمەنم دوانزە ساڵبوو. ڕۆژەکان هەروەک ڕۆژانی پێشوو تێدەپەڕین، بەڵام تەنها ئەوەندە بوو کە چیتر هیچ کەسێکی لادێکە نەیدەوێرا دەستم بۆ بەرێت. زۆربەی کات لە نانەواخانەکەدا بووم. هەندێ جار پێکەوە قسەماندەکرد و جارجارێکیش پارچەیەک کێکی بچکۆلەی دەدامێ و دەیگوت بۆ خۆت بڕۆرەوە دەرەوە. خەڵکی دەیانگوت "هانس"ی نانەوا کەسێکی بێدەنگە، منیش ئەو بێدەنگیەم تێدا دەبینی، بەڵام هەندێ جاریش چیرۆکی خۆش خۆشی دەریا گەورەکانی بۆ دەگێڕامەوە. بەو شێوەیەش شارەزاییەکی باشم دەربارەی وڵاتانی دەرەوە پەیدا کرد.

هەمیشە من دەچوومە لای "هانس"ی نانەوا و لەنانەواخانەکەیدا دەمبینی، هەرگیزیش لەدەرەوە ڕووبەڕووی نەدەبوومەوە. بەڵام ڕۆژێکی زستانی سارد لەسەر شەقامەکە دانیشتبووم و بەردم بەسەر سەهۆڵەکەدا فڕێدەدا. لەپڕێکدا لێم پەیدابوو، لە تەنیشتمەوە وەستا و گوتی؛





«خەریکە گەورە دەبیت».

منیش لەوەڵامدا گوتم؛

«مانگی دوو دەبمە سیانزە ساڵ».

«وایە، وایە. کەواتە کاتی خۆیەتی. باشە... پێت وایە کە تۆ هێندە گەورەبوویت کە بتوانیت نهێنیەک لای خۆت بهێڵیتەوە و نەیدرکێنیت؟»

«هەر نهێنیەک کە تۆ پێمی بڵێیت، هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرم لەلای خۆمی دەهێڵمەوە».

«منیش هەر وای بۆ دەچم. بەڵام ئەمە شتێکی گرنگە برادەر، چونکە زۆر دڵنیانیم ژیانم هێندەی مابێت».

منیش یەکسەر گوتم؛

«بێگومان ماوتە... زۆرت ماوە».

لە پڕێکدا هەستم کرد هەروەک سەهۆڵ و بەفرەکەی تەنیشتم ساردبوومەتەوە. لەم تەمەنە گەنجەمدا ئەمە دووهەم جارم بوو کە ڕووبەڕووی مردنی کەسێک ببمەوە.

ئەو واینیشاندا کە ئاگای لە قسەکانی من نەبوووبێت و گوتی؛

«ئەلبێرت، تۆ خۆت دەزانیت من لە کوێدا دەژیم. پێم خۆشدەبێت گەر ئەم ئێوارەیە بێیت بۆ لام».



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

**حەوتی قەرە**

**...ئەستێرەیەکی پڕ نهێنی...**

خوێندنەوە و حونجەکردنی ئەو هەموو پیتە پچکۆلانانەی ناو کتێبە بچکۆلەکە، چاومی بەتەواوەتی ماندووکرد و ئاویان پێدا دەهاتە خوارەوە. بچکۆلەیی پیتەکان جارجارێک گومانیان دەخستە دڵمەوە و لە خۆمم دەپرسی «بڵێیت خۆشم لەخەیاڵی خۆمەوە هەندێک وشەم نەخستبێتە سەری».

بۆ ماوەیەک بەلای چەند شاخێکی بەرزدا تێپەڕین، منیش لە ماشێنەکەدا دانیشتبووم و چاووم تێبڕیبوون. هاوکات بیرم لە ئەلبێرت دەکردەوە؛ ئەو دایکی مردووە و سەرباری ئەوەش باوکی ئالوودەی مەی بووە. پاش کەمێک باوکم گوتی؛

«خەریکە لە توونێلە بەناوبانگەکەی "سانت گۆتهارد" نزیکدەبینەوە. پێم وابێت ڕێک بەناو ئەو شاخە گەورەیەی بەردەمماندا دەڕوات کە تۆ سەیری دەکەیت».

ئەوجا کەوتە باسکردنی توونێلەکە و گوتی "توونێلی سانت گۆتهارد" درێژترین توونێلی جیهانە کە ماشێنی پێدا بڕوات. درێژیەکەی شانزە کیلۆمەترە و دوو ساڵێک دەبێت کراوەتەوە. بەڵام پێش ئەو کاتە (زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر) تەنها توونێلی شەمەندەفەربووە، وە پێش ئەو کاتەش قەشەکان و هەروەها چەتە و دزەکانیش کە لە نێوان ئیتاڵیا و ئەڵمانیادا سەفەریان دەکرد، ناچاربوون بەپێ بەتوولەڕێگەی "سانت گۆتهارد"دا بپەڕنەوە.

لەدواجاریشدا گوتی "مەبەستم لەوەیە کە خەڵکانێک لەپێش ئێمەدا لێرەدا هەبوون". چرکەی دوای ئەوە لەناو توونێلەکەدابووین.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

بڕینی توونێلەکە ماوەی چارەکێکی پێچوو. لەوسەری تونێلەکەوە بەناو شارۆچکەیەکی پچکۆلەدا تێپەڕین کە ناوی "ئایرۆلۆ" بوو. منیش گوتم "ۆلۆریاء". ئەوە جۆرە یاریەکی خۆمبوو، هەر لەو کاتەوەی کە بەناو دانیمارکدا تێپەڕین، هەموو ناوی شار و ناوەکانی سەر ڕێگام بەپێچەوانەوە دەخوێندەوە، تەنها بۆ ئەوەی بزانم وشەیەکی نهێنی یان شتێک لەو بابەتەیانی تێدا نەشاردراوەتەوە. هەندێ جاریش ئەوناوانەی هەڵمدەگێڕانەوە شتێکیان بۆ دەردەخستم. بۆ نموونە "ڕۆما" بووبە "امۆڕ"، من پێمابوو ئەو ناوە ڕێک لەشوێنی خۆیدابێت[6].

"ۆلۆریاء"ش زۆر خراپ نەبوو، هەر وەک ناوی وڵاتێکی خەیاڵی دەهاتە بەرگوێ. تەنانەت ئێستاکەش ئەگەر کەمێک چاومی بۆ بنوقێنم، ڕێک شارەکەم دێتەوە بەرچاو و دەتوانم بەخەیاڵ بەناویدا تێپەڕببم.

دواتر بەناو دۆڵێکدا چووینە خوارەوە، ئەو ناوە پڕبوو لە کێڵگەی بچوک بچوک و بە پەرژینی بەردین لەیەکدی جوداکرابوونەوە. پاش کەمێک ڕووبارێکمان بڕی کە ناوی "تیسینۆ" بوو. هەر کە باوکم ڕووبارەکەی بینی، هەردوو چاوی داپچڕی. لەو کاتەوەی کە بەلای بەندەرە گەورەکانی هامبۆرگدا تێپەڕین، باوکمم بەو شێوەیە نەبینیبوو.

زۆر بەتووندی ئیستۆپی گرت و پێچێکی کردەوە. بەپەلە لە ماشێنەکەدا هاتە دەرەوە و هەر بەپێوە وەستا. دەستی بۆ ڕووبارە پرشنگدارەکە ڕاکێشا. لەڕاستیدا لەنێوان چیا بەرزەکانەوە دەهاتە خوارەوە.

---

[6] پێچەوانەی "Roma" دەبێتە "amor"، "امۆر" لە ئەفسانە کۆنەکاندا خواوەندی خۆشەویستیە.و



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



هەتا من لە ماشێنەکەدا هاتمە دەرەوە و گەیشتمە لای، ئەو فریای ئەوە کەوتبوو جگەرەیەکی بۆ دابگیرسێنێت. ئەوجا گوتی؛
«برادەر، وا گەیشتینە دەریا... بۆنی گژوگیای دەریایی و قەتران دەکەم».
ئەوە یەکەمجار نەبوو کە باوکم شتێکی سەیر و سەمەرە بڵێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جارەیان بەڕاستی دەترسام کە ئەقڵی لەدەست دابێت. ئەوەی کە زیاتر منی دەترساند، ئەوەبوو کە تەنها هەر ئەوەندەی گوت و ئیدی بێدەنگ بوو. لەوەدەچوو هەموو وشەکانی ناخی هەرئەوەندە بووبێت کە بەدڵنیاییەوە بڵێت "وا گەیشتینە دەریا و تەواو".
من سوور دەمزانی کە هێشتام هەر لە سویسراداین، دەشمزانی ئەو وڵاتە هیچ جۆرە لێوارێکی سەر قەراغ دەریای نیە. ڕاستە من هیچ شتێک لە جوگرافیا تێنەدەگەیشتم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو شاخە بەرزانەی چواردەورمان دەیسەلماند کە لەدەریاوە دوورین.
«ماندوویت؟» ...لێم پرسی.
«بەهیچ جۆرێک»... دیسانەوە پەنجەی بۆ ڕووبارەکە ڕاکێشایەوە و گوتی «پێم وابێت بەپێی پێویست باسی ڕێگاوبانی کەشتیوانی ناو ناوەڕاستی ئەورووپام بۆ باسنەکردبیت، هەر لەبەرئەوە دەخوازم ئێستاکە شتێکت لەم بارەیەوە بۆ باسبکەم»
دەبێت لەو کاتەدا لە کەسێک چووبم کە لە مانگەوە کەوتبێتە خوارەوە، چونکە باوکم گوتی؛
«کەمێک ئارام بە هانس تۆماس. ئێرە هیچ دزێک و چەتەیەکی دەریایی لێنیە».
پەنجەی بۆ چیاکان ڕاکێشا و کەوتەوە قسەکردن؛





«کەمێک لەمەوبەر زنجیرە شاخی "سانت گۆتهارد"مان بڕی. زۆرینەی ڕووبارەکانی ئەورووپا لێرەوە هەڵدەقوڵێن. لێرەوە ڕووباری "ڕاین" دڵۆپە ئاوەکانی سەرەتای کۆدەکاتەوە، وە هەر لێرەشەوە ڕووباری "ڕۆنە" (واتە تیسینۆ) هەڵدەقوڵێت و دواتریش لەگەڵ ڕووباری گەورەی "پۆ"دا تێکەڵدەبێت و دەڕژێنە دەریای "ئەدریاتیک"ەوە[7].
سەیربوو بەلامەوە کە لە پڕێکدا کەوتە باسکردنی دەریا، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر سەرم لێبشێوێنێت، گوتی؛
«گوتم کە ڕووباری "ڕۆنە" لێرەوە هەڵدەقوڵێت».
دیسانەوە دەستی بۆ شاخەکان ڕاکێشایەوە؛
«ئەو ڕووبارە بەناو شاری "جنێف"دا دەڕوات و دواتر بەناو فەرەنسادا تێدەپەڕێت، دواتریش چەند کیلۆمەترێک لە ڕۆژئاوای شاری "مارسیلیا"وە دەڕژێتە ناو دەریای ناوەڕاستەوە. هەرچی ڕووباری "ڕاین"یشە، بەناو ئەڵمانیا و هۆڵەندادا تێدەپەڕێت و دواتر دەڕژێتە ناو "دەریای باکور"ەوە. چەندەها ڕووباری تریش دەگەنە ئەوێ، بەڵام هەموویان یەکەمین قەترەی ئاویان لە شاخەکانی "ئەلپ"ەوە دەخۆنەوە».
«چەندەها کەشتیش لەناو ئەو ڕووبارانەدا دەڕۆن؟»... ئەو پرسیارەم لێکرد و وامزانی دەتوانم دەستپێشکەی لێبکەم.
«بەڵێ، باشترە ئەمە وەک تێبینیەک لای خۆت بیهێڵیتەوە و لەیادت بێت، بەڵام کەشتیەکان تەنها بەناو ڕووبارەکاندا تێناپەڕن، بەڵکو بەنێوان ڕووبارەکانیشدا دەڕۆن».

[7] بەشێکە لە دەریای ناوەڕاست و دەکەوێتە نێوان ئیتاڵیا و ئەلبانیا و سەرایڤۆ و کرواتیاوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



دیسانەوە جگەرەیەکی تری داگیرساند، سەرلەنوێ منیش پێموابوو ئەقڵی لەدەست دابێت. جارجارێک زۆر دەترسام ئەو هەموو مەشروبە قورسانە ئەقڵی بفەوتێنن. پاش نەختێک درێژەی بە قسەکانیدا؛

«بۆ نمونە ئەگەر بە کەشتیەک بەناو "راین"دا بڕۆیت، ئەوا بەشێوەیەک لە شێوەکان بەناو رووباری "ساین" و "لۆرێ"شدا دەڕۆیت. هەروەها وەک ئەوەش وایە کە بەناو رووبارە گرنگەکانی تریشدا بڕۆیت. بەو شێوەیەش رێگەی هەموو شارە بەندەریە گەورەکانت لەبەردەستایە، بۆ وێنە شارە بەندەریەکانی دەریای باکور و دەریای ئەدریاتیک و دەریای ناوەڕاستیش».

منیش پرسیم؛

«بەڵام ئایا چیا بەرزەکان رووبارەکان لە یەکتر جودا ناکەنەوە؟»

«بەڵێ، بەڵام ئەگەر بتوانین بە کەشتی بەنێوانیاندا بڕۆین، ئەوساکە نابنە رێگر».

«ئەم قسە بێمانایە چیە دەیکەیت؟»... بەو پرسیارە قسەکانیم پێبڕی.

من زۆر جار بە قسە پڕ نهێنیەکانی بێزار دەبووم.

«مەبەستم لە کەناڵەکانە، تۆ دەزانیت کە لە دەریای "بەڵتیک"ەوە دەتوانیت بە کەشتی هەتا دەریای "ڕەش" بڕۆیت، بەبێ ئەوەی ناچاربیت بەناو دەریای ناوەڕاست یان دەریای " ئەدریاتیک"دا بڕۆیت؟»

سەرێکم بۆ راوەشاند، ئەویش بەدەنگێکی پەست و بە چرپە گوتی؛

«هەتا دەریای "قەزوین" دەتوانیت بڕۆیت، واتە هەتا ناو جەرگەی ئاسیا».

«بەڕاست؟»... پرسیم.





«بەڵێ! ئەو راستیە هیچی لەو راستیە کەمتر نیە کە کەمێک لەمەوبەر بەناو توونێلی "سانت گۆتهارد"دا تێپەڕین».

هەروا وەستابووم و دەمڕوانیە رووبارکە، منیش پێموابوو بۆنێکی کەمی گژوگیای دەریایی و قەتران بێت. لەو کاتەدا باوکم لێی پرسیم؛

«بەڕاست ئێوە لە قوتابخانە فێری چیتان دەکەن، هانس تۆماس؟»

منیش لە وەڵامدا گوتم؛

«فێری ئەوەمان دەکەن کە بە ئاقڵی دانیشین. فێربوونی ئەوەش کارێکی هێندە سەختە، کە دەبێت چەندەها ساڵی پێوە بکوژین».

«باشە... بەڵام بەبڕوای تۆ ئەگەر مامۆستاکەت باسی رێگاوبانی دەریایی ناو ئەوروپای بۆ بکردیتایە، ئەو کاتە بەبێ دەنگی دانەدەنیشتیت؟».

«بێگومان، بەڵێ... بەتەواوەتی دڵنیام کە بە بێدەنگی دادەنیشتم».

لێرەدا ئیدی کۆتایمان بە باسەکە هێنا و بەدرێژایی رووباری "تیسینۆ"دا بەرەوخوار کەوتینەوە رێ. لەپێشدا بەلای شاری "بیلینزۆنا"دا تێپەڕین، ئەو شارەی گەورەیەی کە هێشتام سێ قەڵای سەدەکانی ناوەڕاستی تێدایە. پاش ئەوەی باوکم وتەیەکی کورتی دەربارەی سەدەکانی ناوەڕاست و سەلیبیەکان پێشکەشکرد، ئەوجا بەردەوامی بە قسەکانی دا و گوتی؛

«تۆ خۆت دەزانیت کە من کەمێک خولیای گەردوونم، هانس تۆماس. بەتایبەتیش گرنگی دەدەم بە ئەستێرەکان، وە دیسانەوە بەتایبەتی ئەو ئەستێرانەی ژیانیان لەسەردایە».

وەڵامم نەدایەوە. هەردووکمان دەمانزانی کە ئەو خولیای ئەو جۆرە شتانەبوو. لەبەرئەوە پاش نەختێک درێژەی بەقسەکانی دا؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«دەزانیت کە لەم ماوەیەی پێشوودا ئەستێرەیەکی پڕ نهێنی دۆزراوەتەوە، لەوێدا چەند ملیۆنێک بوونەوەری بیرکەرەوەی لەسەر دەژی. بەهێواشی لەسەر دوو قاچ دەسوڕێنەوە و لە ڕێگەی دوو چاوی زیندووەوە تەماشای ئەستێرەکەیان دەکەن».

دانم بەوەدا نا کە ئەوە شتێکی نوێ بوو بۆم.

«ئەو ئەستێرە بچکۆلەیە لە ڕێگەی تۆڕێکی ئاڵۆزی هاتوچۆوە پێکەوە گرێدراوە. لەو تۆڕەشەوە بەردەوام خەڵکە زیرەکەکانی سەر ئەستێرەکە بەهۆی هەندێ ماشێنی بریقەدارەوە لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر دێن و دەڕۆن».

«بە ڕاست؟»

«بەڵێ، گەورەم! هەر لەسەر هەمان ئەستێرە، ئەو خشۆکانە چەند بینایەکی گەورەیان بنیادناوە کە لە سەد قات تێپەڕدەبێت، وە لەژێر ئەو دەزگایانەشدا چەندەها توونێلی درێژیان لێداوە و دەتوانن بە خێرایی بەهۆی چەند ئامێرێکی ئەلەکترۆنیەوە کە لەسەر سکە دەڕوات، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر خۆیان بگوێزنەوە».

«بەتەواوەتی دڵنیایت لەوە؟»... لێم پرسی.

«بەڵێ، بەتەواوەتی دڵنیام».

«ئەی... ئەی بۆچی من هەرگیز باسی ئەو ئەستێرەیەم بەرگوێ نەکەوتووە؟».

«ئمم... یەکەم لەبەرئەوەی هێندە نابێت دۆزراوەتەوە و دووهەمیش پێموابێت جگە لە من کەسی تر بەمە نازانێت».

«ئەی باشە ئەو ئەستێرەیە لە کوێدایە؟».

باوکم دەستی کێشا بە ئامێرەکانی بەردەمیدا و گوتی؛



«ئائەمەیە. ئەستێرە سەیرەکە ئەمەیە هانس تۆماس. ئێمەش ئەو خەڵکە زیرەکەین کە بە فیاتێکی سوورەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر خلدەبینەوە».

بۆ چەند چرکەیەک گرژی و مۆنی گرتمی، چونکە هەڵیخڵەتاندم. بەڵام دواتر تێگەیشتم کە ئەم زەویە چەندە سەیر و سەمەرەیە، ئیدی یەکسەر لێیبووورام.

دواجاریش باوکم گوتی؛

«ئەگەر ئەستێرەناسەکان ئەستێرەیەکی تری زیندوو بدۆزنەوە، ئەوا خەڵکی دەبوورێنەوە. کەچی خەڵکی سەریان لە ئەستێرەکەی خۆیان ناسوڕمێت».

بۆ ماوەیەکی دورودرێژ لە جێی خۆیدا دانیشتبوو و هیچی نەدەگوت، منیش دواتر کتێبە پچکۆلەکەم دەرهێنا و دەستمکردەوە بە خوێندنەوە. جیاکردنەوەی هەموو نانەواکانی "دۆرف" لەیەکتری کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام لەیادمە کە "لودفی" کتێبە پچکۆلەکەی نووسیوە و "ئەلبێرت"یش باسی ئەو کاتە بۆ لودفی دەکات کە گەنجبووە و سەردانی "هانس"ی نانەوای کردووە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



هەشتی قەرە
...لە گەردەلوولی وڵاتێکی نامۆ دەچوو...

"ئەلبێرت کلاگس" پەرداخی شەرابەکەی بەرزکردەوە و قومێکی لێدا. تەماشایەکی دەموچاوە پیرەکەیم کرد، سەیربوو بەلامەوە کە ئەم مرۆڤە هەمان ئەو کوڕە بێکەسەبووە کە کاتی خۆی دایکی بەنەخۆشی مردووە. هەروەها هەوڵمدەدا ئەو برادەرایەتیە تایبەتیە بهێنمە بەرچاوم کە لە نێوان ئەم و "هانس"ی نانەوادا سەریهەڵدابوو.
من خۆم ئەو کاتەی کە هاتمە دۆرف کەسێکی تەنها و بێکەسبووم و ئەم پێشوازی لێکردم، بەڵام ئەمیش کاتی خۆی هەروەک من بێکەس و بێدەرەتان بووە.
ئەلبێرت پەرداخەکەی لەسەر مێزەکە دانایەوە، بە مقاشێک کەمێک دارەکانی ناو ئاگردانەکەی هەڵگێڕایەوە و گوتی؛
«هەموو کەسێکی لادێکە دەیزانی کە "هانس"ی نانەوا لە کوخێکی دارینی سەرو ئاواییەکەدا دەژی. دەربارەی شێوەی ژیانیشی لەوێدا، چەندەها قسە و قسەلۆکیان بۆ هەڵبەستبوو، بەڵام من پێموانیە هیچ کەسێک لە خانووەکەیدا سەردانی کردبێت. ئەو ئێوارەی زستانەم زۆر بەباشی لەیادە، بەفرێکی زۆر بارییوو و منیش بەپەرۆشەوە بەرەو کوخەکەی "هانس"ی نانەوا سەردەکەوتم. من یەکەمین کەسبووم کە سەردانی ئەو نانەوا پرنهێنیەم کرد...
مانگی چواردە لەسەرو شاخەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵهاتبوو، ئەستێرەکانیش نەختە نەختە بەئاسمانەوە دەبینران.
لەو کاتەدا کە بەسەر گردۆڵکە بچوکەکەی نزیک ماڵەکەیدا سەردەکەوتم، دیسانەوە قسەکەی "هانس"ی نانەوام هاتەوە بیر





کەکاتی خۆی لەدوای شەڕە گەورەکەی بەردەم دووکانەکەیدا پێی گوتم؛ "ڕۆژێک ساردیەکت دەدەمێ کە تامەکەی هەزار جار لەم ساردیە خۆشتربێت". لەدڵی خۆمدا گوتم "بڵێیت ئەو ساردیە پەیوەندیەکی بە نهێنیە گەورەکەوە هەبێت؟".
پاش کەمێک خانووەکەی سەر تەپۆڵکەکەم لێوە دەرکەوت، بێگومان خۆت دەزانیت کە هەمان ئەو خانوویە کە ئێستاکە تێیدا دانیشتووین».
بەخێرایی سەرێکم بۆ لەقاند و نانەوا پیرەکەش درێژەی بەقسەکانی دا؛
«بەلای کانیەکەدا تێپەڕیم، بە هێواشی بەسەر بەرهەیوانە بەبەفر داپۆشراوەکەیدا ڕۆیشتم و لەدەرگامدا. گوێم لە "هانس"ی نانەوابوو هاواریکرد و گوتی "وەرە ژووورەوە کوڕم!"
گرنگە بڵێم ئەو کاتە من هێشتام تەمەنم لە دوانزە سیانزە ساڵێک تێنەپەڕیبوو. وە هێشتام هەر لەماڵی خۆماندا لەگەڵ باوکمدا دەژیام. لەبەرئەوە کەمێک بەلامەوە ناخۆشبوو کە پیاوێکی تر بەو شێوەیە بانگم بکات و پێم بڵێت "کوڕم".
بەهەرحاڵ چوومە ژوورەوە... هەر دەتگوت پێم ناوەتە ناو جیهانێکی تەواو جیاوازەوە. "هانس"ی نانەوا لەسەر لانکە کورسیە قوڵەکەی دانیشتبوو، لە هەموو سوچ و قوژبنێکی ژوورەکەدا شوشەی ماسی دانرابوو و ماسی پرتەقاڵی تێیاندا مەلەی دەکرد. لە هەموو گۆشە و قوژبنێکی بچوکی ژوورەکەدا بەشێکی ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە دەهاتە بەرچاو.
بەڵام لە ژوورەکەدا تەنها ماسی پرتەقاڵی لێنەبوو... نەخێر، بۆ ماوەیەک هەر وەستابووم و تەماشای ئەو هەموو شتانەم دەکرد کە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



هەرگیز لەوەوبەر وێنەیانم نەبینیبوو. چەند ساڵێک دواتر ئینجا ناوی ئەو شتانە فێربووم کە بینیمن.

لەناو چەند شوشەیەکدا پاپۆڕی بچکۆلە بچکۆلەی تێدابوو، چەندەها گوێچکەماسیش لە ژوورەکەدا دانرابوون. جگە لەوانەش پەیکەری بودا و بەردی بەنرخ و گەوهەر، بوومەڕەنگ[8] و بووکەشوشەی دروستکراو لەشێوەی زنجیدا، شمشێری کۆن و چەقۆ و دەمانچە، سەرینی مەغریبی و فەرشی هیندی لە خوری مەڕ دروستکراو، هەموو ئەمانەشی لێبوو.

من بەتایبەتی سەرنجم چووە سەر شکڵی ئاژەڵێکی سەیر کە لە شوشە دروستکرابوو، سەرێکی بچکۆلەی درێژکۆلە و شەش قاچی هەبوو. لە گەردەلوولی وڵاتێکی نامۆ دەچوو. لەوانەیە ناوی هەندێ لەو شتانەم بیستبێت کە بینیمن، بەڵام ئەم بەسەرهاتە زۆر پێشئەوەی فۆتۆگراف هەبێت ڕوویدا.

دیمەنی ناو کوخە بچکۆلەکە بەتەواوەتی جیاوازتربوو لەوەی کە من مەزەندەم دەکرد. لەپڕێکدا لەوە دەچوو لەلای "هانس"ی نانەوا نەبم، بەڵکو هەر دەتگوت هاتوومەتە لای دەریاوانێکی پیر. لە چەند شوێنێکیشدا چرای داگیرساندبوو، بەڵام وەک ئەو چرایانە نەبوو کە من لەوەوپێش بینیبوومن، پێم وابێت چرای تایبەت بە جیهانی دەریاوانی بوون.

پیاوە پیرەکە داوای لێکردم لەسەر کورسیەکی بەردەم ئاگردانەکە دابنیشم، ڕێک ئەو کورسیەیە کە ئێستاکە تۆی لەسەر دانیشتوویت، لودفی... دەزانیت؟»

دیسانەوە سەرم بۆ لەقاندەوە.

[8] دارێکی چەماوەیە کە هەڵیدەدەیت، بۆ خۆت دەگەڕێتەوە.





«پێش ئەوەی دابنیشم، بە ژوورە پچکۆلەکەدا خولامەوە و تەماشای هەموو ماسیە ڕەنگاوڕەنگەکانم کرد. هەندێکیان سوور و زەرد و پرتەقاڵی بوون، هەندێکی تریان سەوز و شین و مۆر بوون. لەوەوپێش تەنها یەک ماسی لەو جۆرەم بینیبوو، ئەویش لە ژوورەکەی پشتەوەی نانەواخانەکەی "هانس"ی نانەوادا بوو، لەوێدا لەسەر مێزێکی چکۆلە دایانابوو. زۆرجار کە "هانس"ی نانەوا خەریکی هەویر شێلان دەبوو، من دەوەستام و تەماشای ئەو ماسیە پچکۆلەیەم دەکرد، لەم سەری شوشەکەوە بۆ ئەوسەری مەلەی دەکرد».

لەو کاتەدا کە بە ژوورەکەیدا دەخولامەوە پێم گوت؛

«چەندە ماسی ڕەنگاوڕەنگت زۆرە، پێم دەڵێیت لە کوێوە هێناوتن؟»

وەکو پیاوێکی پیر پێکەنی و گوتی؛

«هەر شتەو کاتی خۆی هەیە، برادەر. هەر شتەو کاتی خۆی. بەڵام پێم بڵێ... ئەگەر من بمرم، حەز دەکەیت لە "دۆرف"دا ببیتە نانەوا؟»

ڕاستە من ئەو کاتە هێشتام منداڵ بووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەندێشەیەک بەمێشکمدا دەهات و دەچوو؛ جگە لە "هانس"ی نانەوا، هیچ کەسێکی ترم شک نەدەبرد. دایکم مردبوو و باوکیشم چیتر هیچ پرسیارێکی لێنەدەکردم، بەئارەزووی خۆم دەهاتم و دەچووم. هەموو خوشک و براکانیشم لە دۆرف دوور کەوتبوونەوە. لەبەرئەوە زۆر بەڕێزەوە گوتم؛

«من هەر خۆم بڕیارم دابوو ببم بە نانەوا».

پیاوە پیرەکە بە ئەندێشەیەکی قوڵەوە گوتی؛

«منیش هەر لەو بڕوایەدابووم. ئمم... کەواتە دەبێت بەباشی ماسیەکانیشم بۆ بەخێوبکەیت. بەڵام بەدەر لەوەش، هێشتام شتی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





تریشمان هەیە؛ تۆ دەبیتە ئەو کەسەی کە دواتر دەبێت نهێنی ساردیە ئەرخەوانیەکە بپارێزیت».

«ساردی ئەرخەوانی؟»

«تەواوە... جگە لەوە شتی تریشمان هەیە، برادەر»

منیش گوتم؛

«باسی ساردیە ئەرخەوانیەکەم بۆبکە»

برۆ سپیەکانی هەڵتەکاند و بە چرپەیەک گوتی؛

«دەبێت تام بکرێت، برادەرە»

«ناتوانیت پێم بڵێیت تامی چی دەدات؟»

بەبێزاریەکەوە سەرە پیرەکەی ڕاوەشاند و گوتی؛

«ساردی ئاسایی یان تامی هەرمێ یان پرتەقاڵ یان تووە سوورە دەدات و هیچی تر. بەڵام ساردیە ئەرخەوانیەکە بەو جۆرە نیە، ئەلبێرت. ئەو ساردیە لە هەمان کاتدا تامی هەموو ئەو شتانە دەدات، وە لەگەڵ ئەوەشدا تامی جۆرە توویەک و میوەیەک دەدات کە تۆ هەرگیز لەوەوپێش زمانت بەریان نەکەوتووە».

منیش گوتم؛

«کەواتە بە دڵنیاییەوە تامی خۆشە».

«هەر خۆش!! زۆر زیاتریش. تامی ساردی ئاسایی تەنها لە دەمدایە... لەپێشدا لەسەر زمان و مەڵاشوو، دواتریش کەمێک لە قورگدا. بەڵام ساردیە ئەرخەوانیەکە جگە لەوانە لە لوت و سەریشدا تامی خۆی دەدات، دواتریش بە قاچەکاندا دەڕوات و بەناو دەستەکانیشدا تێپەڕدەبێت».

ئەوجا گوتم؛

«پێم وانیە ڕاست بکەیت»



«لەو بڕوایەدات؟»

لێرەدا پیاوە پیرەکە کەمێک سەرسوڕما و سەرلێشێواو دەهاتە بەرچاو، لەبەرئەوە ویستم پرسیاری شتێک بکەم کە وەڵامدانەوەی ئاسانتر بێت؛

«باشە ڕەنگی ئەو ساردیە چۆنە؟»

"هانس"ی نانەوا دایە قاقای پێکەنین؛

«کوڕە تۆ پرسیاری سەیر دەکەیت... هەڵبەتە پرسیارەکەت لەجێی خۆیدایە، بەڵام وەڵامدانەوەی هێندە ئاسان نیە. بەهەرحاڵ دەبێت ساردیەکەت نیشانبدەم، دەزانی..»

"هانس"ی نانەوا بەرەو ئەو دەرگایە ڕۆیشت کە دەچووە سەر ژوورێکی بچکۆلەی خەوتن. لێرەشدا دیسانەوە شوشەیەکی گەورەی ماسی دانرابوو و ماسیەکی پرتەقاڵی تێدابوو. لەژێر جێگای خەوەکەدا پەیژەیەکی دەرهێنا و بەدیوارەکەوە هەڵیسپارد. ئالێرەدا سەرنجم چووە سەر دەرگایەکی بچکۆلە کە بە بنمیچەکەوە بوو، قفڵێکی ئەستوریشی لێدرابوو.

نانەواکە بە پەیژەکەدا سەرکەوت، لە گیرفانی کراسەکەیدا کلیلێکی دەرهێنا و قفڵەکەی کردەوە. پاشان ڕووی تێکردم و گوتی؛

«وەرە برادەر، وەرە. لەماوەی پەنجا ساڵی ڕابووردودا، جگە لە من هیچ کەسێکی تر نەهاتۆتە ئێرە».

منیش دوای کەوتم و چوومە سەرەوە بۆلای.

لەسەقفەکەدا پەنچەرەیەکی بچکۆلەی تێدابوو، هەر لەوێوە تریفەی مانگەشەو دەهاتە ژوورەوە. تیشکەکان چەندەها سندوق و کاتژمێری دەریایی دەخستە ڕوو کە بە گەرد و تەونی جاڵجاڵۆکە داپۆشرابوون. بەڵام ژوورە پچکۆلەکە تەنها بەهۆی تیشکی مانگەوە ڕووناک



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



نەدەبووەوە. چونکە تیشکی مانگ شینبوو، بەڵام لەوێدا شەپۆلی
تیشکێکی هێمنی هەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەش دەبینرا.
لە بنی بنەوەی ژوورەکەدا "هانس"ی نانەوا پەنجەی بۆ گۆشەیەکی
ژوورەکە ڕاکێشا. لەوێدا ڕێک لەژێر سەقفە لارەکەی ژوورەکەدا،
بتڵێکی کۆن دانرابوو. لە شوشەکەوە تیشکێکی هێندە ڕووناک و جوان
دەهاتە دەرەوە، بۆ ماوەیەک ناچاربووم چاوم بنوقێنم. شوشەی بتڵەکە
ئاوی بوو، بەڵام شلەکەی ناوی ڕەنگی سوور و زەرد و سەوز و
وەنەوشەیی بوو... هەموو ئەو ڕەنگانەم لەیەک کاتدا دەبینی.
"هانس"ی نانەوا بتڵەکەی بەرزکردەوە. لەوێدا شلەکەی ناویم
بەجوانی بینی و وەک مرواریەکی شل دەدرەوشایەوە.
بەدەنگێکی گوماناویەوە چرپاندم؛
«ئەوە چیە؟»
نانەوا پیرەکە دەموچاوی گرژبوو؛
«ئەوە "ساردی ئەرخەوانی"یەکەیە، برادەر. ئەو چەند دڵۆپەش،
دواهەمین دڵۆپی ئەو ساردیەیە کە ماوەتەوە و لە هیچ شوێنێکی تری
جیهاندا دەست ناکەوێت».
پاش نەختێک لێم پرسی؛
«ئەی ئەوە چیە؟»... ئاماژەم بۆ قتوویەکی بچکۆلەی کۆنکرد، کە
هەندێ کاغەزی یاری کۆن و گەردگرتووی تێدابوو. ڕزیوو و پەرپووت
دەهاتنە بەرچاو. هەشتی قەرەش لەسەری سەرەوەدابوو. زۆر جوان
نەمدەبینی، بەڵام وابزانم ژمارە هەشتێک لەلای چەپی کاغەزەکەوە
نووسرابوو.
پەنجەیەکی خستە سەر دەمی و بە ئەسپایی گوتی؛
«ئەوە کاغەزەکانی "فرۆد"ە، ئەلبێرت».





«فرۆد؟»
«بەڵێ "فرۆد". بەڵام ئەو باسەم داناوە بۆ ئێوارەیەکی تر. ئێستاکەش
بە خۆمان و ئەم بتڵە ساردیەوە دەچینەوە ژوورەکەی خوارەوە».
بە بتڵەکەی دەستیەوە هاتە خوارەوە. لە یەکێک لەو "جنۆکانەی
جەژنی لەدایکبوونی مەسیح" دەچوو کە لەگەورەکەدا چرایان
بەدەستەوەیە. تەنها جیاوازیش ئەوەبوو کە چراکەی دەستی ئەم
ڕەنگێکی دیاریکراوی پەرش نەدەکردەوە، بەڵکو جارجارێک سوور و
سەوز، کەمێک دواتر زەرد و لەپڕێکدا دەبوو بە شین. بتڵەکە خاڵ
خاڵی ڕەنگی چکۆلە چکۆلەی بەهەموو لایەکی ژوورەکەدا
بڵاودەکردەوە... هەر دەتگوت لە ژوورەکەدا سەدان چرای بچکۆلە
داگیرساوە و تیشکەکانیان سەمادەکەن.
کە گەیشتینەوە ژوورەکەی خوارەوە، بتڵەکەی لەسەر مێزی بەردەم
ئاگردانەکەدا دانا. لەوێشدا ڕەنگی هەموو شتە سەیر و نامۆکانی
ژوورەکە وەک ڕەنگە جیاوازەکانی شلەکەی لێهات. پەیکەرەکەی بودا
ڕەنگی سەوزی گرت و دەمانچەیەکی کۆن شین بوو، "بوومەڕەنگ"ێکیش
هەروەک ڕەنگی خوێن سوور هەڵگەڕا.
دیسانەوە لێم پرسیەوە؛
«ئەمەیە ساردی ئەرخەوانی؟»
«بەڵێ، ئەمە دواهەمین دڵۆپە کە ماتەوە. بەڵام باشتر، ئەلبێرت...
چونکە ئەم خواردنەوەیە هێندە باشیەکەی ترسناکە، ئەگەر لە
دوکانەکاندا بفرۆشرایە شتێکی خراپدەبوو».
لە شوێنی خۆی هەستا و پەرداخێکی بچکۆلەی هێنا، پاشان چەند
دڵۆپێکی کردە ناو پەرداخەکەوە. بەئاستەم بە بنەکەیەوە دیاربوو،
بەڵام وەک بەفرێکی کریستاڵ دەدرەوشایەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«هێندەت بەسە»... نانەوا پیرەکە گوتی.
منیش بەسەرسامیەوە لێم پرسی؛
«لەوەندە زیاترم نادەیتێ؟»
پیاوە پیرەکە سەری ڕاوەشاند؛
«لەڕاستیدا دوو دڵۆپیش زۆرە، چونکە تامی تەنها دڵۆپێکی ئەم ساردیە ئەرخەوانیە بۆ ماوەی چەند سەعاتێک دەمێنێتەوە».
ئەوجا وەک پێشنیارێک گوتم؛
«کەواتە لەوانەیە واباشتربێت کە ئێستاکە دڵۆپێک بخۆمەوە و بەیانی زوش دڵۆپێکی تر».
"هانس"ی نانەوا بە بێزاریەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی؛
«نا، نا. ئێستاکە یەک دڵۆپ بخۆرەوە و تەواو، دواتر پێویستت پێ نیە. پاش ئەوەی کە دەیخۆیتەوە، هێندەت بەلاوە خۆشدەبێت کە هەوڵی دزینی ئەو کەمە دەدەیت کە ماوەتەوە. لەبەرئەوە هەر کە ڕۆیشتیتە دەرەوە، دەبێت خێرا بییەمەوە سەرەوە و قفڵی بکەمەوە. دڵنیاشم پاش ئەوەی کە باسی کاغەزی یاریەکانی "فرۆد"ت بۆ دەکەم، شاگەشکە دەبیت کە هەموو بتڵەکەم نەدایتێ».
«تۆ خۆت ئەو ساردیەت خواردۆتەوە؟»
«بەڵێ، یەک جار خواردومەتەوە. بەڵام پەنجا ساڵێک لەمەوبەر بوو».
"هانس"ی نانەوا لەسەر لانکە کورسیەکەی بەردەم ئاگردانەکە هەستا، بتڵی ساردیەکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و بردیە ژووری خەوە بچکۆلەکەوە.
کە گەڕایەوە دەستێکی خستە سەرشانم و گوتی؛
«بیخۆرەوە. ئەمە گەورەترین ساتی ژیانتە، برادەر. بۆ هەتاهەتایە لەیادت دەبێت، بەڵام ئەم چرکەیە هەرگیزا و هەرگیز ناگەڕێتەوە».





پەرداخە پچکۆلەکەم بەرزکردەوە و دڵۆپە پرشنگدارەکانی ناویم خواردەوە. هەر کە یەکەمین دڵۆپ کەوتە سەر زمانم، شەپۆلێکی پڕ لە خۆشی بەناو لەشمدا تێپەڕی. لە سەرەتادا تامی هەموو ئەو شتانەم کرد کە لەو تەمەنە گەنجەمدا تامم کردبوون، پاشانیش بە هەزاران تامی نوێ بە ناو لەشمدا دەهاتن و دەچوون.
ڕاستبوو، هەر وەک "هانس"ی نانەوا گوتی، تامەکەی لەپێشدا لەدەممەوە دەستیپێکرد، لەپێش هەموو شتێکدا لە سەری زمانمەوە. بەڵام دواتر لە قوڵەکانم و قاچەکانمدا تامی شلیک و تووی سوور و سێو و مۆزم دەکرد. لەسەری پەنجە تووتەیەکمدا تامی هەنگوینم دەکرد، لە پەنجەیەکی قاچیشمدا تامی مرەبای هەرمێم دەکرد و لە خواری خوارەوەی پشتیشمدا تامی کرێمی کێکم دەکرد. لە هەموو لەشمدا هەستم بە بۆنی دایکم دەکرد. بۆنێک بوو کە بیرم چووبووەوە، بەڵام بەدرێژایی ئەو سڵانەی پاش مردنی هەر بیرم دەکرد.
لەدوای ئەوەی شەپۆلی یەکەمی تامەکان هێوربووەوە، هەستمدەکرد هەموو جیهان لە لەشمدا بێت. بەڵێ، هەستم دەکرد من خۆم لەشی جیهانبم. هاوکات پێموابوو هەموو دارستانەکان و شاخەکان و کێڵگەکان و دەریاکان، بەشێک بن لە لەشی من. هەرچەندە دایکم مردبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەچوو لەشوێنێکی ئەو ناوەدا بێت...
کە سەیری پەیکەرە سەوزەکەی بودام کرد، وا دەهاتە بەرچاوم کە پێبکەنێت. دیسانەوە تەماشای دوو شمشێرە هەڵواسراوەکەی سەر دیوارەکەم کردەوە، ئەوانیش وا دەردەکەوتن کە شەڕە شیربکەن. لەسەر دۆڵابێکی گەورە، کەشتیەکی بچکۆلە لە ناو بتڵێکدا دانرابوو، هەر هەمان ئەو کەشتیەبوو کە لەگەڵ هاتنە ژوورەوەمدا سەرنجم



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



چووە سەری، بەڵام لەپڕێکدا وادەهاتە بەرچاوم کە لەسەر ئەو کەشتیە کۆنە وەستابم، هەستیشم دەکرد کەشتیەکە بەرەو دوورگەیەکی جوان و بەپیتی دوور ببەم.

لەپڕێکدا گوێم لەدەنگێک بوو گوتی؛
«تامەکەی خۆش بوو؟»
دەنگی "هانس"ی نانەوا بوو. خۆی بەسەرمدا چەماندبووەوە و قژی ڕادەکێشام.
منیش لەوەڵامدا گوتم؛
«ئمم...»
لەڕاستیدا نەمدەزانی بە چ جۆرێک وەڵامی بدەمەوە.
تەنانەت ئەمڕۆکەش نازانم. ئێستاکەش نازانم ئەو ساردیە ئەرخەوانیە تامی چی دەدا، تەنها ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە تامی هەموو شتەکانی سەر ئەم زەویەی دەدا. بەڵام یەک شت دەزانم؛ ئێستاکەش کە بیر لە خۆشی ئەو ساردیە دەکەمەوە، فرمێسک بە چاوەکانمدا دێتە خوارەوە.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

نۆی قەرە

...ئەو دەیگوت من ئەو شتە سەیر و نائاساییانە دەبینم کە خەڵکی لە ئاستیاندا کوێرن...

لەو کاتانەدا کە من دەربارەی ساردیە ئەرخەوانیەکەم دەخوێندەوە، باوکم بەردەوام دەیویست قسەم لەگەڵدا بکات، بەڵام باس وخواسی ساردیەکە داگیریکردبووم و هەروا بەئاسانی نەمدەتوانی کتێبە بچکۆلەکە دابخەم. باوکم باسی ئەو شوێنانەی بۆ دەکردم کە پێیاندا تێدەپەڕین، منیش جارجارێک هەر تەنها لەبەر ڕێزگرتنی باوکم لە جامی ماشێنەکەوە تەماشایەکی دەرەوەم دەکرد و دەمگوت؛
«جوانە» یان دەمگوت «قەشەنگە».
ڕێک لەو کاتەدا کە من "بەدزیەوە" لە ژوورەکەی سەرەوەی "هانس"ی نانەوادا دەخولامەوە، باوکم ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ناوی هەموو شارەکان بە درێژایی ڕێگاکە بە زمانی ئیتاڵی نووسراون. چونکە لەو کاتەدا بەناو بەشی ئیتاڵی سویسرادا تێدەپەڕین. بەڵام لە ڕاستیدا هەر تەنها ناوەکان ئیتاڵی نەبوون. هەر لەو کاتەوەی کە من دەستمکرد بە خوێندنەوەی باسی "ساردیە ئەرخەوانیەکە"، سەرنجمدا کە ئەو دۆڵەی بەناویدا تێدەپەڕین، پڕبوو لەو گوڵ و درەختانەی کە لە وڵاتەکانی سەر دەریای ناوەڕاستدا دەڕوێن.
باوکیشم بەو سیفەتەی کە هەموو بەشە جیاوازەکانی جیهانی بینیبوو، کەوتە ناوبردنی ئەو دار و ڕووەکانەی کەلەو ناوەدا دەڕوێن و گوتی؛
«میمۆسا! ماگنۆلیا! ڕۆدۆدیندرۆن! ئەزالیا! داری گێلاسی یابانی!».



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



بەڵام زۆر پێش ئەوەی بگەینە سەر سنووری ئیتاڵیا، چەندەها دار خورماشمان بینی.

کتومت لەو کاتەدا کە من کتێبە بچکۆلەکەم دانا، باوکم گوتی؛

«خەریکە دەگەینە شاری "لوگانۆ"».

من پێشنیارم کرد کە بۆ مانەوەی شەومان لەوێدا لابدەین، بەڵام باوکم سەرێکی بۆ ڕاوەشاند و گوتی؛

«ئێمە وا ڕێکەوتین کە لە سنووری ئیتاڵیا تێپەڕین و ئەوجا لابدەین. بەڕاستیش هێندەمان نەماوە، جگە لەوەش هێشتام پاشنیوەڕۆیە و کاتێکی باشمان لەبەردەستدایە».

وەک دڵدانەوەیکیش بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە شاری "لوگانۆ"دا لاماندا. لەپێشدا کەمێک بە شەقامەکاندا خولاینەوە، دواتر بەناو بەندەرەکان و پارکە زۆرەکانی شارەکەدا پیاسەمان کرد، بەڕاستی ئەو شارە پڕبوو لە پارک و بەندەری جوان. باوکم ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزی کڕی و جگەرەیەکی بۆ داگیرساند، منیش بەخۆم و زەڕەبینەکەمەوە کەوتمە پشکنینی رووەک وگەڵاکان.

دوو درەختی زۆر جیاوازم بینی. یەکێکیان گوڵی گەورە گەورەی سووری گرتبوو، ئەوی تریشیان گوڵی بچکۆلە بچکۆلەی زەردی پێوەبوو. شێوەی گوڵەکانیش بەتەواوەتی جیاوازبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێموابوو کە هەردوو درەختەکە سەربە هەمان خێزانبن، چونکە کاتێک بە زەڕەبینەکەم بەجوانی لەگەڵاکانیان وردبوومەوە، بینیم خەتە باریکەکانی سەر هەردووگەڵاکە تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر هاوجووتی یەکن.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەناکاودا گوێمان لە دەنگی "کوللەخۆر"ێک[9] بوو. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دەیجریواند و دەیخوێند... چەهچەهەی خۆشی ئەو بولبولە خەریکبوو بمخاتە گریان. باوکیشم بەهەمان شێوەی من مەستی بووبوو، بەڵام ئەو تەنها پێکەنی.

بە بۆنەی ئاووهەوای گەرمی ناوچەکەوە باوکم دوو ئاسکریمی بۆ کڕیم (پێویستیشی نەکرد بیخەمە ناو گفتوگۆیەکی فەلسەفیەوە). هەوڵمدا سیسرکێکی گەورە ڕابکێشمە سەر چلورەکەم، بۆئەوەی بیخەمە ژێر زەڕەبینەکەمەوە و سەیری بکەم، بەڵام لەوەدەچوو ڕێک ئەو سیسرکە لە دکتۆر بترسێت. لەوکاتەدا باوکم گوتی؛

«هەرکاتێک پلەی گەرما لە پلەی "سی" تێپەڕبێت، خێرا ورووژم دەهێننە دەرەوە».

منیش گوتم؛

«وە هەرکاتێک سێبەری چلورەیەک ببینن، خێرا ورووژم دەبەنەوە ناوەوە».

پێش ئەوەی بڕۆینەوە ناو ماشێنەکە، باوکم دەستەیەک یاری کاغەزی کڕی. هەروەک چۆن هەندێ کەس هەموو حەفتەیەک گۆڤاری حەفتانە دەکڕن، ئەویش ئاوها زوو زوو دەستەیەک یاری کاغەزی دەکڕی. ئەو زۆر گرنگی بە یاری کاغەز نەدەدا، تەنانەت "ناپلیۆن"یشی پێنەدەکردن... لەڕاستیدا تەنها من یاریم بە کاغەزەکان دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێ هۆ نەبوو کە ئەو هەموو دەستە کاغەزانەی دەکڕی.

[9] کوللەخۆر یان هوزار؛ جۆرێکە لە بولبول، بەشی سەرەوەی لەشی قاوەیی و سەوزە، خوارەوەشی سپیە و کلکی قاوەیی کاڵە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



باوکم لە "ئارەندالّ"دا لە وەرشەیەکی گەورەدا کاری دەکرد، ئەو کاری چەورکردنی ماتۆڕی کەشتیەکانی لەئەستۆدابوو. بەڵام جگە لەوەی کە دەڕۆیشتە سەرکارەکەی و دەگەڕایەوە، هەمیشە خولیای پرسیارە هەتاهەتاییەکان بوو. کتێبخانەکەی پڕبوو لە کتێبی کەم تا زۆر باش و جیاواز جیاوازی فەلسەفی. بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئارەزوویەکی ئاساییشی هەبوو. ئممم... نازانم تا چ ڕادەیەک ئارەزووەکەی بە ئاسایی دابنرێت، بەڵام بێگومان ئەوەش شتێکە کە دەکرێت باسی لەسەر بکرێت.

چەندەها خەڵکی شتی سەیروسەمەرە کۆدەکەنەوە، هەروەک بەردی بەدەگمەن و پارەی ئاسن و پول، هەندێ کەسیش پەپولە کۆدەکەنەوە. باوکیشم ئارەزوویەکی ئاوهای هەبوو؛ ئەو جۆکەری یاری کاغەزی کۆدەکردەوە. من هێشتام لەدایک نەبووبووم کە ئەو خولیای کۆکردنەوەی جۆکەری هەبووە. وابزانم لەو کاتەدا دەستی پێکردووە کە پەیوەندی بە جیهانی دەریاوانیەوە کردووە. جانتایەکی گەورەی پڕ لە جۆکەری کۆکردبووەوە.

بەشێوەیەکی گشتی باوکم کە خەڵکی دەبینی یاری کاغەز دەکەن، هەروەک سواڵکەرێک دەچووە پێشەوە و داوای جۆکەرەکەی لێدەکردن. ئاسایش بوو بەلایەوە بڕوات و داوای جۆکەرێک لەو کەسانە بکات کە بە هیچ جۆرێک نەیدەناسین، بۆ نمونە ئەوانەی لەلای بەندەرەکاندا دادەنیشتن و یاری کاغەزێنیان دەکرد، یاخود دەڕۆیشتە لای ئەوانەوە کە لە قاوەخانەکاندا یاریان دەکرد و پێدەگوتن "من حەزم لە جۆکەرە و کۆیاندەکەمەوە، لەبەرئەوە زۆر خۆشحاڵدەبم ئەگەر جۆکەرەکەم پێببەخشن، هەڵبەتە ئەگەر خۆتان یاری پێناکەن". زۆربەی خەڵکی یەکسەر جۆکەرەکەیان دەردەهێنا و دەیاندایە، هەندێکیش





تەماشایەکیان دەکرد و لەوەدەچوو حەزبکەن بڵێن "سواڵکردنیش جۆری زۆری هەیە". چەند کەسێکیش بەڕێزەوە دەیانگوت "خۆمان پێویستمانە"، هەندێکی تریش بەشێوەیەکی ڕەقتر وەڵامیان دەدایەوە. جارجارێک منیش هەستمدەکرد کوڕە قەرەجێکم و هەروەک ئەو بەبێ ویستی خۆم دەخرامە ناو بازنەی سواڵکردنەوە.

بێگومان من بۆم پرسیاربوو کە ئەو ئارەزووە کەم تازۆر تایبەتەی ئەو بە چ شێوەیەک سەریهەڵداوە... بەهەرحاڵ بەو شێوەیە باوکم جۆکەرێکی لە هەموو دەستە یاریەک دەردەهێنا کە دەستی پێبگەیشتایە. بەشێوەیەک لە شێوەکانیش ئارەزووەکەی هەروەک ئەوە وابوو کە پۆست کارتێک لە هەموو شارەکانی جیهانەوە کۆبکاتەوە. بێگومان نەشیدەتوانی جگە لە جۆکەر هیچ کاغەزێکی تر کۆبکاتەوە. بۆ نمونە نەیدەتوانی نۆی قەرە یاخود "پیاوی سینەک" کۆبکاتەوە، چونکە نەدەلوا لەگەرمەی یاریەکی خۆشدا لە کۆمەڵێک خەڵک نزیک بکەوێتەوە و داوای "پیاوی سینەک" یان "نۆ"ی قەرەیان لێبکات، ئەو کاتە بێگومان داواکەیان ڕەتدەکردەوە.

هەموو خاڵە گرنگەکە لەوە دایە کە دوو جۆکەر لە هەموو دەستەیەکی یاری کاغەزدا هەیە. جارجارێکیش سێ جۆکەر یان چواریشمان لە دەستەیەکدا دەبینی، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هەموو دەستەیەک دوو جۆکەری لەگەڵدایە. لەسەرو ئەوەشەوە ئەو یاریانەی کە جۆکەری تێدا بەکاردێت، هێندە زۆر نین وە زۆرجاریش لەو یاریە کەمانەشدا کە جۆکەری تێدا بەکاردێت، تەنها یەک دانە یاریەکە دەبات بەڕێوە. بەڵام بەدەر لەم لایەنە کرداریەی کە بەئاسانی دەستدەکەوت، باوکم مانایەکی قوڵتری لە جۆکەردا دەبینی.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



ئەو خودی خۆی وەک جۆکەرێک دەبینی. بەڵام بەدەگمەن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەو ڕاستیەی دەدرکاند، بۆیە من دەمێکبوو دەمزانی کە خۆی وەک جۆکەرێکی یاری کاغەز تەماشادەکات.

کاغەزی جۆکەر زۆرزانێکی بچکۆلەیە و جیاوازترە لە هەموو کاغەزەکانی تر. ئەو نە سینەکە و نە دینار، نە کوپە و نە قەرە. ئەو نە هەشتە و نە نۆ، نە پیاوە و نە کوڕ. ئەو کاغەزێکە کە لە دەرەوەی ئەو شتەدایە کە هەموو ئەوانی تر بەشێکن لێی. ئەویش وەک هەموو کاغەزەکانی تر خراوەتە ناو هەمان دەستەوە، بەڵام شوێنی ڕاستەقینەی ئەو لەوێدا نیە. لەبەرئەوە دەکرێت بەبێ ئەوەی شوێنی دیاربێت، لەناو دەستەکەدا دەربهێنرێت.

پێمواببێت باوکم لەو کاتەدا کە لە "ئارەندال"دا گەورەبووە، هەروەک جۆکەرێک هەستیکردبێت. جگە لەمانەش شتێکی تریش هەبوو؛ باوکم وەک فەیلەسوفێکیش هەر لە جۆکەر دەچوو. ئەو دەیگوت "من ئەو شتە سەیر و نائاساییانە دەبینم کە خەڵکی لە ئاستیاندا کوێرن".

بەو شێوەیەش کە باوکم ئەو دەستە کاغەزەی لە شاری "لوگانۆ"دا کڕی، بەو مەبەستە نەبوو کە حەزی لە یاری کاغەز بێت. ئەو بەتایبەتی دەیویست شێوەی جۆکەری ئەو دەستە یاریە ببینێت. هەر لەبەر پەرۆشیشی یەکسەر دەستەکەی کردەوە و جۆکەرەکەی دەرهێنا و دواتر گوتی؛

«هەر خۆم زانیم... ئەم شێوە جۆکەرەم هەرگیز لەوەو پێش نەبینیوە».

جۆکەرەکەی خنیە گیرفانی کراسەکەیەوە و ئەوجا نۆبەی من هات و گوتم؛

«کاغەزەکانی تری دەدەیت بە من؟».





پاش کەمێک هەموو دەستەکەی بۆ درێژکردم. ئەوە وەک ڕێکەوتنێکی بەیاننەکراوی بەینی من و ئەو وابوو؛ کە دەستەیەک کاغەزی دەکڕی، جۆکەرەکەی بۆ خۆی گلدەدایەوە (ئەگەر لە یەک دانە زیاتریشی تێدا بوایە، ئەوا ئەو هەر یەک دانەی هەڵدەگرت). دوای ئەوەش هەموو کاغەزەکانی تر دەبوونە موڵکی من، ئەمە بەمەرجێک ئەگەر فریا بکەوتمایە و داوام لێبکردایە، دەنا بەشێوەیەکی تر دەیفەوتاندن. کەچی هێشتاش سەدان دەستە یاری کاغەزم هەبوو. هەر لەبەرئەوەش کە تاقانە و تەنهابووم (وە لەهەمان کاتدا دایکم لەماڵەوە نەبوو)، زۆر حەزمدەکرد یاری بە کاغەزەکان بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی من کاغەزی یاریم کۆنەدەکردەوە، پێم وابوو زیاد لە پێویست دەستەی یاریم هەبێت. لەبەرئەوە جارجارێک باوکم کە دەستەیەکی دەکڕی جۆکەرەکەی بۆ خۆی دەردەهێنا و ئەوانی تری فڕێدەدا. تا ڕادەیەک لەوە دەچوو کە مۆزێک پاک بکات؛ توێکڵەکەی لێدەکردەوە و فڕێیدەدا. جارجارێکیش هەروەک ئەوەی شتێک بژاربکات، شتە باشەکەی بۆ خۆی هەڵدەگرت و ئەوانی تری فڕێدەدایە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە و دەیگوت؛

«توێکڵە توێکڵ!».

بەشێوەیەکی گشتی باوکم بەجۆرێکی باشتر دەستەی یاریەکانی لەکۆڵی خۆی دەکردەوە. ئەگەر من دەستەکەم نەویستایە، دەچوو هەندێ گەنجی دەدۆزیەوە و هەروا بەبێئەوەی هیچان پێبڵێت، پێیدەبەخشین. بەو شێوەیەش شتێکی لەبری ئەو جۆکەرانەی کە سواڵی دەکردن لە خەڵکی، دەدایەوە بە مرۆڤایەتی. پێم وابێت لەو بەینەدا مرۆڤایەتی ئاڵوگۆڕیەکی باشی دەکرد.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ... باوکم باسی جوانی سروشتی ئەو ناوچەیەی بۆکردم و پێیوابوو هێندە بهێنێت کە کەمێک لە ڕێگاکەمان لابدەین، لەبەرئەوە بڕیارماندا لەبری ئەوەی بەشاڕێگاکەدا لە "لوگانۆ"وە بۆ "کۆمۆ" بڕۆین، بە لاڕێگاکەی تەنیشت دەریاچەی "لوگانۆ"دا ملی ڕێگابگرین. پاشئەوەی نیوەی دەریاچەکەمان بڕی، هاتینە ناو سنووری ئیتاڵیاوە.
دواتر تێگەیشتم بۆچی باوکم ئەو ڕێگایەی هەڵبژارد؛ هەر دوای ئەوەی کە دەریاچەی "لوگانۆ"مان بەجێهێشت، هاتینە سەر دەریاچەیەکی زۆر گەورەتر، ناوی دەریاچەی "کۆمۆ"بوو، لەوێدا بەڕاستی جموجۆڵی کەشتیەکان دەهاتنە بەرچاو. کەمێک دواتر بەشارێکدا تێپەڕین کە ناوی "میناگیۆ" بوو. منیش گوتم "ۆیگانیم". ئەوجا چەند کیلۆمەترێک بەدرێژایی دەریاچە گەورەکەدا ڕێگامان گرتەبەر و دەمەوئێوارە گەیشتینە "کۆمۆ".
لەو کاتانەشدا کە باوکم ماشێنی لێدەخوڕی، ناوی هەموو ئەو دارانەی دەهێنا کە بەلایاندا تێدەپەڕین؛
« Cupressus sempervirens، Pinus pinea[10]، دار هەنجیر، دار زەیتون ».
نازانم ئەو هەموو ناوانە لە کوێوە فێربووبوو. هەڵبەتە من هەندێک لەو ناوانەم لەوەوپێش بەر گوێ کەوتبوو، بەڵام زۆربەی زۆریان بەلامەوە هەروەکو ئەو وشانەوابوو کە هەروا جارجارێک بۆ خۆشی دەیگوتن.

[10]دوو جۆری دار سنەوبەرە و لە وڵاتەکانی سەر دەریای ناوەڕاست دەڕوێن.و



لە ناوەڕاستی ئەو سروشتە دڵفڕێنەدا دەستمکردەوە بە خوێندنەوەی کتێبە بچکۆلەکەم. بە پەرۆشبووم بزانم "هانس"ی نانەوا ئەو ساردیە ئەرخەوانیەی لە کوێوە دەستکەوتووە، هەروەها حەزیشم دەکرد بزانم ماسیە پرتەقاڵیەکانی لەکوێوە هێناوە.

پێش ئەوەی دەستبکەمەوە بە خوێندنەوە، هەندێ لە کاغەزی یاریەکانم لەبەردەمی خۆمدا دانا. بەو شێوەیەش ئەگەر باوکم لێی بپرسیمایە "چۆنە وا بێدەنگیت"، بەجۆرێکی باش دەمتوانی وەڵامی بدەمەوە. بێگومان من کاتی خۆی لە "دۆرف"دا پەیمانم بەو نانەوا ڕووخۆشەدا کە کتێبە پچکۆلەکە وەک نهێنیەک لەنێوان خۆم و خۆیدا بپارێزم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

دەی قەرە

...ئەستێرەکانی ئاسمان وەک کۆمەڵێک دوورگەی دوور دەدرەوشانەوە و منیش بەو بەلەمە بچکۆلەیەوە نەمدەتوانی پێیان بگەم...

ئەو شەوە ماڵی "هانس"ی نانەواوەم بەجێهێشت و بەرەو ماڵەوە کەوتمە رێ، بەڵام هێشتام تامی ساردیە ئەرخەوانیەکە هەر لە لەشمدا مابوو. لە پڕێکدا لەبەشی سەرەوەی گوێچکەیەکمدا تامی گێلاسم دەکرد، یان کەمێک تامی هەڵاڵە بە ئانیشکمدا تێدەپەڕی. جارجارێکیش تامێکی ترشی رێواس لە ئەژنۆمەوە دەهات.

مانگ ئاوابووبوو، بەڵام هێشتام لەسەر شاخەکانەوە پرشنگی هەندێ ئەستێرەی پەرشوبڵاو دەبینرا... هەر دەتگوت لە خوێدانێکی ئەفسوناویەوە رژێنراون.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت "من مرۆڤێکی بچکۆلەی سەر ئەم زەویەم". بەڵام هێشتام ساردیە ئەرخەوانیەکە لە لەشمدا مابوو، لەبەرئەوە بیرکردنەوەکەشم هەر تەنها ئەندێشەیەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو لە هەموو لەشمدا هەستمدەکرد کە ئەم زەویە ماڵی من بێت.

هەر لەو کاتەوە تێگەیشتم بۆچی ساردیە ئەرخەوانیەکە "خواردنەوەیەکی ترسناکە". قورگم وشکبووبوو، بەهیچ شتێک تینوێتیم نەدەشکا و حەزمدەکرد زیاتری لێبخۆمەوە.

لەو کاتەدا کە بەشەقامی "ڤاڵدەمار"دا دەهاتمە خوارەوە، چاوم بە باوکم کەوت. سەرخۆشبوو و بەلەنجەولار لە "خانەی میوانی ڤاڵدەمار"ەوە دەهاتە دەرەوە. چوومە لایەوە و پێمگوت کە سەردانی نانەواکەم کردووە. ئەویش زۆر تورەبوو و زللەیەکی کێشا بەلاسەرمدا.



هەتا ئەو کاتەی زللەکەی لێدام هەموو شتێک بەلامەوە خۆشبوو، بەڵام لێدانەکەی ئێشی کردە دڵمەوە و دەستمکرد بە گریان. ئەوجا باوکیشم دایە پرمەی گریان و لێیپرسیم «قەت دەتوانیت لێم ببووریت؟»... بەڵام من وەڵامی پرسیارەکەیم نەدایەوە و هەروا بەرەو ماڵەوە دواي کەوتم.

پێش ئەوەی باوکم وەک تیشکێک بکوژێتەوە، رووبەتێکردم و گوتی دایکت فریشتەیە و عارەقیش نەفرینی کورتەبنەکانە. وابزانم بەرلەوەی عارەق خواردنەوە بۆ هەتاهەتایە باوکم لێزەوتکات، ئەوە دواهەمین قسەبوو کە پێیگوتم.

بۆ بەیانی زوو خۆم گەیاندە نانەواخانەکەی "هانس"ی نانەوا. نەئەو هیچ شتێکی دەربارەی ساردیە ئەرخەوانیەکە باسکرد و نەمنیش. لەوەدەچوو کە ساردیە ئەرخەوانیەکە شتێک بێت کە سەر بەدنیای لادێکە نەبێت (بەتەواوەتی سەر بە جیهانێکی تر بوو). بەڵام هەردووکیشمان دەمانزانی کە لەدوای ساردیە ئەرخەوانیەکەوە نهێنیەکی قووڵ لە نێوانماندا دروستبووە.

بێگومان ئەگەر کەرەتێکی تر لێی بپرسیمایەتەوە «دەتوانیت نهێنیەک لەلای خۆت بهێڵیتەوە؟»، ئەوا بەتەواوەتی دڵشکاو و نائومێد دەبووم، بەڵام ئەو نانەوا پیرە دەیزانی کە پێویست ناکات ئەو پرسیارە بکاتەوە.

هانس"ی نانەوا هەویرەکەی بردە ژوورەکەی پشتەوە بۆ ئەوەی کێکێکی تایبەتی دوو ئەڵقەیی پێ دروستبکات. لەو کاتەدا من لەسەر کورسیەکی پچکۆلە دانیشتبووم و چاوم بڕیبووە ماسیە پرتەقاڵیەکە. هەرگیز لە تەماشاکردنی ئەو ماسیە بێتاقەت نەدەبووم. ئەو تەنها



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



چەند ڕەنگێکی جوانی پێوە نەبوو، بەڵکو لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر مەلەی دەکرد و لەناو ئاوەکەدا بەئارەزووی خۆی بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە جرت و فرتی دەکرد. سەرتاپای لەشی بە جۆرە پوولەکەیەکی پچکۆلە و پڕ لە ژیان داپۆشرابوو، دوو خاڵی ڕەشی گەورەش چاوەکانی دیاریکردبوون و هەرگیز دایندەخستن. بەردەوامیش دەمە چکۆلەکەی دادەپچڕی و دایدەخستەوە.

لەدڵی خۆمدا گوتم «هەموو گیانەوەرێکی بچکۆلە کەسێکە بۆ خۆی».

ئەم ماسیە پرتەقاڵیەی لەم سەری شوشەکەوە بۆ ئەو سەری مەلە دەکات، تەنها ئەم کەرەتە دەژی. هەر کاتێکیش ژیانی تەواو ببێت، ئیدی هەرگیز ناگەڕێتەوە.

من وا ڕاهاتبووم هەموو پێش نیوەڕۆیەک سەردانێکی "هانس"ی نانەوا بکەم و دواتر بەجێی بهێڵم، هەر لەو کاتەدا کە خەریک بوو بڕۆم، ئاوڕێکی لێدامەوە و گوتی؛

«ئەلبێرت... ئەم ئێوارەیە سەرێکم لێدەدەیت؟»

سەرێکم بۆ لەقاند و ئەویش درێژەی بە قسەکانی دا؛

«هێشتام باسی دوورگەکەم بۆ نەکردوویت... ناشزانم چەند ڕۆژی تر دەژیم».

ئاوڕم لێدایەوە و توند دەستم کردە ملی و گوتم؛

«نابێت بمریت... هەرگیز نابێت بمریت!».

ئەویش گوتی؛

«هەموو مرۆڤێکی پیر دەبێت بمرێت»

زۆر بەتووندی باوەشی بە شانە لاوازەکانمدا کردبوو و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛





«بەڵام هەر خۆشە هێندە بزانم کە یەکێک بەدوای منی پیردا دێت و لەو شوێنەوە بەردەوام دەبێت کە من دەستی لێهەڵدەگرم».

بۆ ئێوارە سەرکەوتمە لای خانووەکەی "هانس"ی نانەوا و لەلای کانیەکەوە بەیەک گەیشتین. ئەو گوتی؛

«خستمەوە شوێنی خۆی».

زانیم کە باسی ساردیە ئەرخەوانیەکە دەکات، لەبەرئەوە پرسیم؛

«ئیدی هەرگیز بۆم نیە تامی بکەمەوە؟»

مرخەمرخێک لە لوتی "هانس"ی پیرەوە هاتە دەرەوە و گوتی؛

«نا، هەرگیز!»

هەستمدەکرد بە شێوەیەکی توندوتیژ و دەسەڵاتدارانە قسەدەکات، بەڵام دەشمزانی کە هەقی خۆیەتی. من هێندە تێگەیشتبووم کە چیتر نەدەبوو کەرەتێکی تر تامی ئەو خواردنەوە ئەفسوناویە بکەمەوە... ئەوجا گوتی؛

«دەبێت بتڵەکە لە ژوورەکەی سەرەوەدا بێت و تا نزیکەی پەنجا ساڵێکی تر نابێت دەربهێنرێتەوە دەرەوە. ئەو کاتە کوڕێکی گەنج دێت و لەدەرگاکەت دەدات، ئەوجا نۆبەی ئەو دێت کە ئەو خواردنەوە گران بەهایە تامبکات. بەو شێوەیەش ئەو هێندە کەمەی کە لە بتڵەکەدا ماوەتەوە، دەڕژێتە ناو چەندین نەوەوە. وە ڕۆژێک لە ڕۆژانیش ئەو چەمە سەیروسەمەرەیە ڕێک دەڕژێتە ناو "وڵاتی بەیانی"یەوە. لێم تێدەگەیت کوڕم؟ یان پێت وایە قسە بۆ کەسێکی گەورە دەکەم؟»

منیش لە وەڵامدا گوتم «بەڵێ تێدەگەم»، پاشان پێکەوە ڕۆیشتینە خانووەکەیەوە کە پڕبوو لە شتگەلی جۆراوجۆری هەموو سوچوقوژبنێکی جیهان. دوو پەرداخ و شوشەیەکی ملباریکی کۆن



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





لەسەر مێزەکە دانرابوو، شەربەتی ترێی تێدابوو. "هانس"ی نانەوا هەندێ شەربەتی کردە پەرداخەکانەوە و کەوتە قسەکردن؛

«من لە ساڵی **1811**دا لە شاری "لیوبیک" لە شەوێکی زستانی ساردی مانگی یەکدا لەدایکبووم. لە ناوەڕاستی شەڕە دوورودرێژەکانی "ناپلیۆن"دابوو. من و باوکم نانەوابووین، بەڵام من هەر لە تەمەنی گەنجییەوە بڕیارمدا پەیوەندی بە جیهانی دەریاوانییەوە بکەم. لەڕاستیشدا لە ناچاریدابووم؛ ئێمە هەشت منداڵبووین و نانەواخانە پچکۆلەکەی باوکیشم بەتەواوەتی بەشی بژێوی ژیانی هەموومانی نەدەکرد. لەساڵی **1826**دا، هێشتام شانزە ساڵم پڕنەکردبووەوە، کارێکم لەناو کەشتییەکی گەورەی "هامبۆرگ"دا دۆزییەوە. کەشتییەکە لەشاری "ئارەندال"ی نەرویجییەوە هاتبوو و ناوی "ماریا"بوو.

"ماریا" بۆ ماوەی زیاتر لە پانزە ساڵ بووبە جێگەی ماڵ و ژیانم. بەڵام لە پایزی ساڵی **1842**دا بە بارێکی شتومەکی وردەواڵەوە لە شاری "هامبۆرگ"ەوە بەرو "نیۆرک" کەوتینە ڕێ. تاقمی کەشتییەکەمان کەسانێکی زیرەکبوون، بەڵام ئەو جارەیان دەبێت قیبلەنوماکەمان هەڵیخەڵەتاندبین و لە ژماردنی گۆشەکانیشدا دەبێت بە هەڵەدا چووبین. پێموابێت هەر لەدوای ئەوەی لە کەناڵی بەریتانیەوە دەرچووبووین، ئاڕاستەیەکی زیاد لە پێویستمان بەرەو باشوور گرتبێت. دەشێت ڕێگەی دەریاییمان بەرەو کەنداوی مەکسیکی گرتبێت. بەڵام چۆنیەتی ڕوودانی ئەو هەڵەیە هەتا ئێستاکەش وەک مەتەڵێک لەلام ماوەتەوە.

پاش حەوت هەشت حەفتە لەناو دەریادا، دەبوایە بەپێی هەموو حیساباتێکمان بگەشتینایەتە بەندەر، بەڵام لە هیچ لایەکەوە وشکاییمان نەدەدی. لەوانەیە لەو کاتەدا لە شوێنێکی خواری



خوارەوەی دوورگەی "بەرمۆدا"دا بووبین. دواتریش بەیانیەکیان ڕەشەبا هەڵیکرد و تا دەهات توندتر دەبوو، هەتا لەپاشاندا بووبە گەردەلوول.

ڕاست و دروست نازانم چی ڕوویدا، بەڵام دیارە کەشتیە گەورەکەمان لەناو تۆفانێکی مەزندا لەت و پەت بوو. هەموو شتێک زۆر بە خێرایی ڕوویدا، لەبەرئەوە تەنها هەندێک وردەکاری کەمم دەربارەی تێکشکاندنەکە دێتەوە یاد. بیرمە کەشتیەکە کەوتە سەرلا و ئاویش هاتە ناویەوە. هەروەها لەیادمە یەکێک لە هاوەڵەکانم بەسەر مێزێکدا کەوت و ئیدی لەناو ئاوە زۆرەکەدا ونبوو. من هەر ئەوەندەم دێتەوە یاد. بەڵام دەشزانم دواتر لەناو بەلەمێکی پچکۆلەی فریاگوزاریدا خەبەرم بووەوە، ئەو کاتەش... ئەو کاتەش دەریاکە بەتەواوەتی هێمن بووبووەوە.

نازانم چەندێک بەبێ هۆشی مابوومەوە. لەوەیە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک بووبێت، بەڵام ڕێشی تێدەچێت چەند ڕۆژێک بێهۆشبووبم. بەهەرحاڵ ڕۆژژمێری من چووەوە سەر سەرتای سەرەتا و لەو چرکەیەوە دەستپێکردەوە کە لە ناو بەلەمەکەدا چاوم کردەوە. دواتریش بۆمدەرکەوت کە کەشتیەکەمان نقوومبووە و هیچ شوێنەوارێکی دیار نەماوە، جگە لەمنیش هیچ کەسێکی تری تێدا دەرنەچووبوو... من تەنها کەسبووم کە لەدوای ڕووداوەکەوە بە زیندوویی مامەوە.

بەلەمەکە کۆڵەکەیەکی پێوەبوو و منیش لە ژێر دارەڕاکانی پێشەوەی بەلەمەکەدا چارۆکەیەکی کۆنم دۆزیەوە. چارۆکەکەم هەڵدا و هەوڵمدەدا بەپێی شوێنی خۆر و مانگ ئاڕاستەی کەشتیەکەم



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





دیارییکەم. مەزەندەم دەکرد لە شوێنێکی نزیک قەراغ دەریاکانی ئەمریکادا بم و بەپێی توانا هەوڵمدەدا بەرەو ڕۆژئاوا لەنگەربگرم.
بەو شێوەیەش بۆ ماوەی زیاتر لە حەفتەیەک بەناو دەریادا خولامەوە، لە ئاو و پسکیت زیاتریش هیچی ترم پێنەبوو. جگە لە چارۆکەی بەلەمەکەشم، هیچی ترم نەبینی.
من بەتایبەتی دواهەمین شەوم بەباشی دێتەوە یاد. ئەو شەوە ئەستێرەکانی ئاسمان وەک کۆمەڵێک دوورگەی دوور دەدرەوشانەوە و منیش بەو بەلەمە بچکۆلەیەوە نەمدەتوانی پێیان بگەم. سەیربوو بەلامەوە کە لەژێر هەمان ئەو ئەستێرانەدابم کە دایک و باوکم لە "لوبیک"دا لەژێریدابوون. هەرچەندە هەردوولامان هەر هەمان ئەستێرەمان دەدی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکجار دووربووین لەیەکەوە. ئەلبێرت... ئەستێرەکان قسە ناکەن، بەلایانەوە گرنگ نیە ئێمە بە چ شێوەیەک ژیانی سەر زەویمان دەبەینە سەر.
بیرم لەوە دەکردەوە کە پاش ماوەیەک دایک و باوکم ئەو هەواڵە ناخۆشەیان پێدەگات کە من لەگەڵ "ماریا"دا تیاچووم.

بۆ بەیانی زوو، هەر لەگەڵ ئاوابوونی تاریکی شەو و دەرکەوتنی تیشکی خۆر لە ئاسۆوە، لەدوورەوە چاوم بە خاڵێک کەوت. لەپێشدا وامزانی خاڵەکە بەچاومەوەیە، بەڵام پاشئەوەی چاوم هەڵگلۆفی و گریاشم، خاڵەکە هەروەک پێشوتر هەر لە شوێنی خۆیدابوو. ئەوجا دڵنیابووم کە خاڵەکە دوورگەیەکی ڕاستەقینەیە.
هەوڵمدا بەلەمەکەمی لێ نزیک بکەمەوە، هاوکات هەستمکرد باهۆزێکی توند دەوروبەری دوورگە بچکۆلەکەی گرتووە و بەلەمەکەم بەرەوڕووی دەبووەوە. چارۆکەی بەلەمەکەم لێکردەوە، دوو سەوڵی



نایابم دۆزیەوە و خستمنە شوێنی خۆیان. دواتر بۆی دانیشتم و پشتم کردە دوورگەکە.
بەبێ وەستان بەردەوام هەر سەوڵم لێدەدا و سەوڵم لێدەدا، بەڵام هەستمدەکرد لە شوێنی خۆمدا چەقیوم. لەبەردەممدا دەریایەکی بێسنوورم دەبینی و لە دڵی خۆمدا دەمگوت "ئەگەر نەتوانم بگەمە دوورگەکە، ئەوا بێگومان گۆڕەکەم لەناو دەریاکەدا دەبێت". دواهەمین دڵۆپی ئاویشم نزیکەی ڕۆژێک لەمەوبەر خواردبۆوە. بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک بەردەوام سەوڵم لێدەدا، لەپی دەستەکانم خوێنیان پێدا دەهاتە خوارەوە، بەڵام دواهەمین دەرفەتی ژیانم لەوەدا دەبینیەوە کە بگەمە قەراغ ئاوی دوورگەکە.
پاش چەند کاتژمێرێکی سەختی سەوڵلێدان، دیسانەوە ئاورێکم لە خاڵە بچکۆلەکە دایەوە. ئەوجا بینیم کە خاڵەکە بۆتە دوورگەیەک و بەرزی و نزمایییەکەیم بەئاسانی دەبینی. لە قەراغ ئاوەکەیدا چاوم چووە سەر چەند دارخورمایەک. بەڵام هێشتام بەتەواوەتی نەگەیشتبوومە دوورگەکە و دەبوایە بەردەوام بەو سەختیە هەر سەوڵ لێبدەم.
دواتریش بەرهەمی ڕەنج و کۆششەکەمم بینی. بۆ درەنگانێک گەیشتمە ئاوی قەراغ دوورگەکە و گوێم لێبوو کە بەلەمەکەم بەهێواشی بەر قەراغی دەریاکە کەوت.
خۆم هەڵدایە دەرەوەی بەلەمەکە و بەتەواوەتی ڕامکێشایە قەراغ ئاوەکەوە. پاش ئەو هەموو ڕۆژە دوورودرێژانەی ناو دەریا پێم لەسەر وشکانی دانا... هەروەک شتێکی خەیاڵی وابوو بەلامەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

پێش ئەوەی بەلەمەکەم ڕابکێشمە ناو دار خورماکانەوە، دواهەمین بەشی پسکیتەکانم خوارد. هەبوون و نەبوونی ئاویش لەسەر دوورگەکە، یەکەمین شتبوو کە بە خەیاڵمدا هات.

ڕاستە گەیشتبوومە سەر دوورگەیەکی خواروی ناو ئۆقیانووسی "ئارام"، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێندە گەشبین نەبووم. هەر زوو وایبۆچووم کە کەس لەسەر ئەو دوورگەیەدا ناژی، زۆر بچکۆلەش دەهاتە بەرچاو. هەر لەو شوێنەوەی کە منی لێوە وەستابووم، شێوەی چەمانەوەی دوورگەکەم دەبینی. هەستمدەکرد لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری ببینم.

لەوێدا هێندە داری زۆری لێنەبوو، بەڵام باڵندەیەک لەسەر ترۆپکی یەکێک لە دار خورماکانەوە دەیخوێند. دەنگی زۆر خۆشتربوو لە هەموو ئەو پەڕەندانەی لەوەوپێش گوێم لێیان بووبوو. من بەتایبەتی دەنگی ئەو باڵندەیەم بەلاوە خۆشبوو، چونکە یەکەمین نیشانەی هەبوونی ژیانبوو لەسەر دوورگەکە. پاش ئەو هەمووساڵەش لەناو دەریادا، بێگومانبووم کە باڵندەیەکی دەریایی نەبوو.

بەلەمەکەم بەجێهێشت و بە توولە ڕێگایەکدا ڕۆیشتم، دەمویست لە باڵندەکە نزیک ببمەوە. ئا لەوێدا بۆ یەکەمین جار لەوەدەچوو دوورگەکە گەورەتر بێت، وە هەتاوەکو زیاتریش دەچوومە ناوەوەی، زیاتر و زۆرتر گەورەدەبوو. لەپڕێکدا بۆمدەرکەوت کە چەندەها داری تریشی لێبوو، هەروەها گوێم لە دەنگی چەندەها باڵندەی تریشبوو کە لەناوەوەی دوورگەکەوە دەیانجریواند. هاوکاتیش (پێموایە هەر لەسەرەتاوە یەکسەر هەستم بەوە کردبوو) سەرنجمدا هەموو گوڵەکان و دەوەنەکان جیاوازترن لەوانەی لەوەوپێش لە ژیانمدا بینیبووم.







لەلای قەراغ دەریاکەوە تەنها حەوت هەشت دارخورمایەکم بینی. بەڵام ئەو توولە ڕێگایەی کە پێیدا دەڕۆیشتم، بەردەوام درێژدەبووەوە و بەنێوان چەند دار گوڵەباخێکی بەرزدا دەڕۆیشت، زیاتریش توولە ڕێگاکە بەرەو دارستانێکی بچکۆلەی دارخورما دەڕۆیشت.

بە نەرمە ڕاکردنێک بەرەو دارستانە بچکۆلەکە ڕۆیشتم، دەمویست بزانم دوورگەکە چەندە گەورەیە. کە گەیشتمە ناو دارستانە بچکۆلەکە، ئەوجا تێگەیشتم کە ئەو دار خورمایانە تەنها بەر دەرگایەکی دارستانێکی چڕتر پێکدەهێنن و هیچی تر. ئاوڕێکم دایەوە و هێشتام قەراغی دەریاکەم لێوە دیاربوو کە لەوەوبەر بە بەلەمەکەم هاتمە ناویەوە. بەلای ڕاست و چەپیشمدا ڕوانیم و بە سەختیەکەوە ئۆقیانووسم دەبینی، لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕۆژدا دەدرەوشایەوە و بەڕەنگێکی ئاڵتونی داپۆشرابوو.

بیرم لە هیچ شتێکی تر نەکردەوە. تەنها ئەوەندەم دەویست کە کۆتایی ئەو دارستانە ببینم. لەبەرئەوە بەڕاکردن بەناو دارەکانی دارستانە چڕەکەدا کەوتمە ڕێ. کاتێکیش لەوسەرەوەی هاتمە دەرەوە، ڕووبەڕووی هەندێ تەپۆڵکەی نشێو بوومەوە، بەلای چەپ و ڕاستدا بەرزبووبوونەوە. لەوێوە ئیدی چیتر نەمدەتوانی دەریا ببینم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

**کوڕی قەرە**

**...هەردوو چاوە قەرەجیە ڕەشەکانی هەروەک دوو دەنکە کەستانەی لووس دەبریسکانەوە...**

هێندەی لە توانای چاوەکانمدا بوو بەردەوام لە کتێبە بچکۆلەکەدا هەر دەمخوێندەوە، بەڵام دواتر ئیدی پیتەکانم دوو دوو دەبینی و دەستم لێهەڵگرت. پاشتریش لەسەر کوشنەکەی دواوە و لەژێر گۆڤارەکەی "ئانەس"ی مراویدا شاردمەوە. بۆ خۆم دانیشتبووم و تەماشای دەریاچەی "کۆمۆ"م دەکرد.

بیرم لە پەیوەندی نێوان زەڕەبینەکە و کتێبە بچکۆلەکە دەکردەوە کە نانەواکەی دۆرف لەناو سەمونێکدا حەشاری دابوو؛ بڵێیت چ پەیوەندیەکیان پێکەوە هەبێت؟ ئەی چۆن توانیبویان ئاوها بە بچکۆلەیی بینووسن؟ ئایا ئەوەش خۆی بۆ خۆی مەتەڵێک نیە؟

لەو کاتەدا شەومان بەسەرداهات کە گەیشتینە ئەو سەری دەریاچەکەی "کۆمۆ" و چووینە ناو شاری "کۆمۆ"وە. بەڵام لەو کاتەی ساڵدا خۆرئاوابوون لە ئیتاڵیا و نەرویجدا جیاوازیەکی زۆری هەیە؛ لە ئیتاڵیادا کە دونیا تاریدەبێت، ئیدی هەروەکو نەرویج مانای ئەوە نابەخشێت کە درەنگ وەختبێت، چونکە لەوێ زۆر زووتر دونیا تاریکدەبێت. لە راستیدا لەگەڵ هەموو رۆژێکدا کە بەرەو خوارەوە دەڕۆیشتین، سەعاتێک زوتر دونیا تاریکدەبوو.

گڵۆپەکانی سەر شەقامەکان لەگەڵ چوونە ژوورەوەی ئێمەدا بۆ ناو ئەو شارە جوانە داگیرسان، لەوێدا لەناکاودا چاوم بە شارێکی یاری کەوت. وابزانم بەدرێژایی سەفەرەکەمان ئەوە تەنها جاربوو کە



تایبەته بە پێگەی پەڕتووک

ویستم هەموو توانایەکی خۆم بەکاربهێنم تا داخوازیەکی خۆمی پێ بهێنمە دی. لەبەرئەوە لەپێشدا گوتم؛

«ئەڕۆین بۆ ئەو شاری یاریە».

باوکیشم گوتی؛

«بابزانین چۆن دەبێت»... هاوکات سەیری ئەملاولای دەکرد و بەدوای شوێنێکی باشدا دەگەڕا کە شەوی تێدا بکەینەوە. ئەوجا من گوتم؛

«با بزانین و شتی وا نیە! دەبێت بڕۆینە ئەو شاری یاریە».

باوکم لەدواجاردا رازیبوو، بەڵام بەو مەرجەی لەپێشدا شوێنێک بۆ مانەوەی شەومان بدۆزینەوە. جگە لەوەش باوکم بەر لە هەموو شتێک داوای بیرەیەکی کرد. واتە بەکورتی لەسەر ئەوە رێکەوتین کەپاش پشوویەکی بچکۆلە بڕۆینە شاری یاریەکە.

خۆشبەختانە ئوتێلێکی بچکۆلەمان رێک لەتەنیشت شاری یاریەکەوە دۆزیەوە. ناوی "ئوتێلی بارادیللۆ" بوو.

منیش گوتم؛

«ۆللیداراب بلیێتوە».

باوکم گوتی ئەی بۆچی لە پرێکدا بە عەرەبی قسەدەکەی، منیش ئاماژەم بۆ نووسراوی سەر ئوتێلەکە کرد و دایە قاقای پێکەنین.

شتەکانمان بردە ژوورەکەی سەرەوەی ئوتێلەکە و باوکم لە ژووری پێشوازیدا بیرەیەکی خواردەوە، پاشان بەرەو شاری یاریەکە کەوتینە رێ. لەرێگادا باوکم بەپەلە خۆی کرد بە دووکانێکی بچکۆلەدا، دوو بتڵی چکۆلەی مەشروبی قورسی کڕی.

هەموو یاریەکانی ناو شاری یاریەکە خۆشبوو، بەڵام من تەنها توانیم باوکم بخەمە ناو شەمەنەفەری ترسناک و کورسی کورسیەکەیەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

جگە لەوانەش خلیسکێنەیەکی گەورەم تاقیکردەوە کە بەرزی نزمی زۆری تێدابوو.

لەسەری سەرەوەی کورسی کورسیەکەوە هەموو شارەکەمان لێوە دیاربوو، تەنانەت دەریاچەی "کۆمۆ"شمان دەبینی. کەرەتێکیش لەسەری سەرەوەدا کورسی کورسیەکە وەستا، چونکە لەو کاتەدا خەڵکی تر لەخوارەوە سواردەبوون و ئێمەش لە شوێنی خۆماندا لەناو کورسیەکەدا تەنها جۆلانەمان دەکرد. لەو کاتەدا کە لە نێوان زەوی ئاسماندا دەهاتین و دەچووین، چاوم بە پیاوێکی بچکۆلە کەوت... لەخوارەوە وەستابوو و تەماشای دەکردین. هەستامە سەرپێ و پەنجەم بۆ پیاوە پچکۆلەکە ڕاکێشا و گوتم؛

«ئەوەتا، وا دیسانەوە دەرکەوتەوە!».

«کێ؟»... باوکم پرسی.

«کورتەبنەکە... ئەوەی کە لە بەنزینخانەکەدا زەرەبینەکەی دامێ».

ئەوجا باوکم گوتی؛

«قسەی قۆڕ مەکە!»... بەڵام لە هەمان کاتدا تەماشایەکی خوارەوەی هەر کرد.

بەڵام من لەسەر قسەکەم سووربووم؛

«خۆیەتی، ئەو... هێشتام هەر هەمان کڵاویشی لەسەردایە. جگە لەوەش خۆ کورتەبنە دیارە».

«کورتەبنە لە ئەوروپادا زۆرە، هانس تۆماس. هەروەها لەو کڵاوەش زۆر هەیە. لەبەرئەوە باشترە دابنیشیتەوە».

من زۆر دڵنیابووم کە هەمان کورتەبنەبوو. بێجگە لەوەش بەئاشکرا دیاربوو کە تەماشای ئێمەی دەکرد. پاش ئەوەی دیسانەوە کەوتینەوە





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

جوڵە و بەرەو زەوی هاتینەوە خوارەوە، چاوم لێبوو هەر زۆر بەپەلە ڕایکردە پشتی دووکانە بچکۆلەکانەوە.

من چیتر هیچ شتێکی تری شاری یاریەکەم بەلاوە مەبەست نەبوو.

ئەوجا باوکم لێی پرسیم؛

«دەڵێیت چی سواری ماشێنە کارەباییەکان ببین؟».

منیش زۆر بە ئەدەبەوە وەڵامم دایەوە و گوتم؛

«نا، سوپاس... دەمەوێت هەر پیاسەبکەم و سەیری ئەملاولا بکەم».

بەڵام پێم نەگوت کە لەڕاستیدا بەدوای کورتەبنەکەدا دەگەڕێم.

وابزانم باوکم گومانی کردبوو، چونکە هەر زۆر بەتاسووقەوەبوو کە من شتێک لە شتە جیاوازەکانی تری شاری یاریەکە تاقیبکەمەوە.

لەو کاتەدا کە پیاسەمان دەکرد، یەک دوو کەرەتێک باوکم پشتی لە خەڵکەکە کرد و قومێکی لە مەشروبی ناو شوشە پچکۆلەکەدا.

پێموابێت وای بەباش دەزانی ئەو قومە لەو کاتەدا هەڵبدات کە من سەرقاڵی یاریەک لە یاریەکان دەبووم.

لەناوەڕاستی شاری یاریەکەدا خێمەیەکی پێنج گۆشەیی هەڵدرابوو، لەسەری نووسرابوو "سیبیللا"، منیش ناوەکەم بەپێچەوانەوە خوێندەوە و گوتم؛

«اللیبیس».

«بەڵێ؟»... باوکم پرسی.

ئاماژەم بۆ نووسراوی سەر خێمەکە کرد و گوتم؛

«لەوێدا نووسراوە!».

«سیبیللا... واتە ئافرەتێک کە بەختدەگرێتەوە. ئەتەوێت بەختت بگریتەوە؟»

هیچ گومانێکم نەبوو، لەبەرئەوە ڕێک بەرەو خێمەکە ملم نا.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

لەبەردەمی دەرگای خێمەکەدا کچێکی زۆر جوانی هاوتەمەنی خۆم دانیشتبوو. قژێکی ڕەشی درێژی هێنابووە خوارەوە و دوو چاوی ڕەشیشی پێوەبوو. بێگومان کچە قەرەج بوو. جوانیەکەی هێندەی تر پەرۆشی کردم.

کچەکە زیاتر سەیری باوکمی دەکرد. تەماشایەکی کرد و بە ئینگلیزیەکی هەر زۆر شەقوشڕ گوتی؛

«بەڕێز... داهاتووت دەبینیت؟ تەنها 5000 لیرە».

باوکم پارەیەکی کاغەزی دەرهێنا، ئاماژەی بۆ من کرد و پارەکەی دا بە کچەکە. ڕێک لەو کاتەدا ژنێکی بەتەمەن سەری لە خێمەکەوە هێنایە دەرەوە. ئەو بوو بەختگرەوەکە نەک کچە گەنجەکە. منیش کەمێک نائومێدبووم، چونکە ئەو کچە گەنجەکەی پارەکەی وەرگرت، بەختی بۆ نەگرتمەوە.

منیان خستە ناو خێمەکەوە. گڵۆپێکی سوور لە سەقفی خێمەکەوە شۆڕبووبووەوە. ئافرەتە بەختگرەوەکە لەبەردەم مێزێکی خڕدا دانیشتبوو. تۆپێکی کریستاڵیش لەسەر مێزەکە دانرابوو، لە تەنیشتیشیەوە شوشەیەکی ماسی بچکۆلەی لێبوو، ماسیەکی ڕەنگ زیووینی تێدا بوو. جگە لەوانەش دەستەیەک کاغەزی یاریش لەسەر مێزەکە دانرابوو.

لەپێشدا لێی پرسیم؛

«ئینگلیزی دەزانیت، ئازیزم؟»

منیش لەوەڵامدا بە ئینگلیزی گوتم؛

«بێگومان»

کاغەزەکانی هەڵگرت و دانەیەکی دەرهێنا. کوڕی قەرەبوو و خستیە سەر مێزەکە. ئەوجا داوای لێکردم بیست کاغەز لە دەستەکە



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

دەربهێنم. دوای ئەوەی کە دەرمهێنان، گوتی "دە ئینجا باش تێکیان بدە". پاش ئەوەی داواکەیم جێبەجێکرد، گوتی "ئێستاکە کوڕی قەرەکە تێکەڵی کاغەزەکانت بکە". ئەوەشم کرد و دواتر دەستگرەوەکە هەر 21 کاغەزەکەی لەسەر مێزەکە دانا و بەردەوام سەیری ناوچاویشی دەکردم.

کاغەزەکانی لە سێ ڕیزدا دانا، هەر ڕیزەو حەوت کاغەزی بەرکەوت. پەنجەی بۆ ڕیزەکان ڕاکێشا و گوتی "ڕیزی سەری سەرەوە باسی ڕابووردو دەکات، ئەوەی ناوەڕاستیش باسی کاتی ئێستاکە دەکات و ڕیزی خواری خوارەوەش باسی داهاتوو دەکات. کوڕی قەرە کەوتبووە ڕیزی ناوەڕاستەوە و لەتەنیشت جۆکەرەوە بوو. پاشان ژنەکە لەبەرخۆیەوە گوتی؛

«سەرسوڕهێنەرە... هەتا بڵێیت دابەشکردنێکی تایبەتیە».

بۆ ماوەیەک بێدەنگ مایەوە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت بڵێیت 21 کاغەزەکەم هێندە تایبەتی بن کە خەوی موگناتیسی لێخستبێت. بەڵام لە پرێکدا کەوتە قسەکردن.

لەپێشدا پەنجەی بۆ کوڕی قەرە ڕاکێشا و تەماشایەکی کاغەزەکانی چواردەوری کرد؛

«کوڕێکی گەورە دەبینم... لە ماڵەوە دوور کەوتۆتەوە».

هەتا ئەو کاتە هیچ سەرم نەسوڕما. بێگومان هەموو کەسێک دەیزانی کە من خەڵکی "کۆمۆ" نیم. بەڵام دواتر درێژەی بە قسەکانی دا؛

«دڵت خۆش نیە، ئازیزم؟»

وەڵامم نەدایەوە و ژنەکە دیسانەوە سەیری کاغەزەکانی کردەوە.

ئەوجا ئاماژەی بۆ ئەو ڕیزەکرد کە باسی ڕابووردوی دەکرد. لەوێدا کاغەزی پاشای قەرە لەنێوان چەند کاغەزێکی تردا بوو. دواتر گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«چەندین ڕێگر و ناخۆشی لە ڕابووردودا هەبوون».
کاغەزی پاشای قەرەی بەرزکردەوە و گوتی "ئەوە باوکتە". ئەوجا گوتی "باوکت بەشێوەیەکی ناخۆش و نائومێد گەورەبووە". پاشان کۆمەڵێ شتی تری گوت و نیوەی کەمتری تێگەیشتم. چەند جارێکیش وشەی "باپیرە"ی بەکارهێنا.
«بەڵام ئەی دایکت لە کوێیە، کوڕە ئازیزەکەم؟».
پێم گوت لە ئەسینادایە، بەڵام هەر خێرا پەشیمان بوومەوە. چونکە بەو شێوەیە یارمەتیمدا. بێگومان ڕێیتێدەچوو کە هەڵمبخڵەتێنێت.
ئەوجا ژنە دەستگرەوەکە گوتی؛
«ماوەیەکی زۆرە دایکت سەفەری کردووە»... پەنجەی بۆ ڕیزی خوارەوەی کاغەزەکان ڕاکێشا. لەوێدا بللی کوپ زۆر لە دووری پاشای قەرەوە بوو. ئەوجا گوتی؛
«پێموابێت ئەوە دایکتە. ئافرەتێکی زۆر سەرنجڕاکێشەرە... جلوبەرگی جوانی لەبەردایە... لە وڵاتێکی نامۆدایە و زۆر دوورە لە وڵاتانی باکورەوە»
ئا بەو شێوەیە لەسەر بەختگرتنەوەکەی بەردەوامبوو، منیش بەردەوام نزیکەی نیوەی قسەکانی تێدەگەیشتم. ئەو کاتەش کە هاتە سەر باسکردنی داهاتووم، هەردوو چاوە قەرەجیە ڕەشەکانی هەروەک دوو دەنکە کەستانیای لووس دەبریسکانەوە. دیسانەوە دەستیکردەوە بە باسکردنی کاغەزەکان؛
«هەرگیز لەوەوپێش دابەشکردنێکی ئاوهام نەبینیووە»
پەنجەی بۆ جۆکەر ڕاکێشا... کەوتبووە تەنیشت کوڕی قەرەوە و گوتی؛
«چەندەها حاڵەتی سەرسوڕمانی گەورە گەورە... چەندەها شتی شاراوە، کوڕم»



ئەوجا هەستایە سەر پێ و بەتووندی سەرێکی ڕاوەشاند. دواهەمین ڕستەش ئەوەبوو کە گوتی؛
«زۆریش نزیکە...»
لێرەدا ئیتر دانیشتنە تایبەتیەکەمان کۆتایی پێهات. ژنەکە تا دەرەوەی خێمەکە بەرێیکردم، پاشان ڕێک بەرەورووی باوکم ڕۆیشت و هەندێک لە ڕاستیەکانی بە گوێیدا چرپاند. بە هێواشی چوومە پشتی ژنەکەوە، کەمێک دواتر دەستێکی خستە سەر سەرم و گوتی؛
«بەڕێز، ئەم کوڕەت زۆر تایبەتە... پڕە لەنهێنی. مەگەر خوا بزانی چی لێدەردەچێت».
وابزانم باوکم خەریکبوو پێبکەنێت. پێشم وابێت هەر بۆ ئەوەی پێکەنینەکەی داپۆشێت، دەستی کرد بە گیرفانیا و پارەیەکی کاغەزی تری پێبەخشی.
کەمێک لە خێمەکە دوور کەوتینەوە و ئافرەتە بەختگرەوەکەش هەر تەماشای دەکردین.
«کاغەزی بۆ خوێندمەوە»... بە باوکمم گوت.
«بەڕاست؟ خۆ داوای جۆکەرەکەت لێکرد؟»
منیش تورەبووم و گوتم؛
«هەر بەڕاستی شێتیت».
پێم وابوو ڕێک ئەو پرسیارە وەک ئەوەبێت کە لەناو کڵێسەیەکدا کفرێکی گەورە بکەیت. لەبەرئەوە گوتم؛
«باشە ئێمە قەرەجین، یان ئەوان؟»
باوکم بەشێوەیەکی ناخۆش پێکەنی. هەر بە پێکەنینەکەیدا زانیم کە هەردوو بتڵە بچوکەکانی فتکردووە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

که گەڕاینەوە ژووری ئوتێلەکەمان، یەک دوو چیرۆکی خەیاڵی دونیای ئۆقیانووسەکانم بە باوکم گێڕایەوە.

باوکم بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەسەر کەشتیەکی نەوتکێش لە نێوانی ئەوروپا و دوورگەکانی نێوان ئەمریکای باکور و باشوردا دەهات و دەچوو. بەو شێوەیەش بست بەبستی بەندەرەکانی مەکسیک و شارەکانی وەک "ڕۆتردام" و "هامبۆرگ" و "لیوبیک" شارەزابووبوو. بەڵام جارجارێک کەشتیەکەیان ڕووی لە شوێنانی تریش کردووە، بەو جۆرەش باوکم ئاشنای بەندەرە جیاوازەکانی جیهان بووبوو. لەوەوپێش "هامبۆرگ"مان بینی، زۆر بەتێروتەسەلیش لە ناوچەی بەندەرەکانیدا خولاینەوە. بۆ بەیانیش دەبێت بگەینە شاری "ڤێنیسیا"، ئەمیش یەکێکە لەو شارانەی کە بەندەری هەیە و باوکم لە کاتی گەنجیدا لەوێشبووە. دواتریش باوکم وایدانبوو کە لە ئەسینادا سەردانی شاری "پیرالیفس" بکەین.

پێش ئەوەی ئەو سەفەرە دورودرێژە دەستپێبکەین، لە باوکمم پرسی؛ «بۆچی بە فرۆکە نەڕۆین؟ بەو شێوەیەش کاتێکی باشترمان لەبەردەستدا دەبێت و دەتوانین بە ڕاشکاوی بەدوای دایکمدا بگەڕێین». بەڵام باوکم گوتی؛ «مەبەستی هەرە گرنگی سەفەرەکەمان ئەوەیە کە دایکت لەگەڵ خۆماندا بهێنینەوە، لەبەرئەوە پێمواییە ئاسانتر بێت کە بیخەینە فیاتەکەمانەوە وەک لەوەی ڕایبکێشینە ناو نووسینگەیەکی گەشتوگوزاریەوە و بلیتێکی فرۆکەی بۆ بکڕین».

جگە لەوەش گومانم لێدەکرد کە زۆر بڕوای بەوە بێت کە بیدۆزینەوە. بەهەرحاڵ ئەو بەلایەنی کەمەوە دەیویست پشوویەکی خۆش بەسەربەرین. لەڕاستیدا باوکم هەر لەتەمەنی گەنجێتیەوە خەونی بەوەوە بینیووە کە شاری ئەسینا ببینێت. کاتی خۆی چووە بۆ





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

"پیرالیفس" و ئەم شارەش تەنها چەند کیلۆمەترێک لە ئەسیناوە دوورە، بەڵام کەبتاینی کەشتیەکەی ڕێگەی پێنەداوە سەردانی ئەو شارە دێرینە بکات. بەبڕوای من دەبوایە ڕوتبەی ئەو کەبتاینەیان دابەزاندبایە و لەبری ئەوە کارێکی ئاسایی ناو کەشتیەکەیان پێ بسپاردایە.

خەڵکانێکی زۆر تەنها بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی پەرستگاکانی ئەسینا سەفەر بۆ ئەوێ دەکەن. بەڵام باوکم مەبەستییوو ئەو شارە ببینێت، چونکە بەر لە هەموو شتێک فەیلەسوفە گەورەکان لەوێدا ژیاون.

ڕاستە بەلای منەوە ناخۆشبوو کە دایکم من و باوکمی جێهێشت. بەڵام کاریگەری سەفەرەکەی لەسەر باوکم زیاتربوو، چونکە دایکم لەو هەموو شوێنەی جیهاندا "ئەسینا"ی هەڵبژاردبوو. ئەو دەیویست لەوێدا خۆی بدۆزێتەوە، هاوکات باوکیشم دەیویست ئەو شارە ببینێت. کەواتە باشترێکبوو هەردووکیان پێکەوە سەفەریان بکردایە.

پاش ئەوەی باوکم یەک دوو چیرۆکی سەیروسەمەرەی ژیانی ناو دەریای بۆ گێڕامەوە، لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و خەوت. منیش لەسەر جێگاکەم ڕاکشابووم و بیرم لە کتێبە بچکۆلەکەی ناو سەمونەکە و نانەوا سەیرەکەی "دۆرف" دەکردەوە.

پێم ناخۆشبوو کە کتێبەکەم لە ماشێنەکەدا بیرچووبوو. بەو شێوەیەش نەدەکرا ئەو شەوە بزانم لەدوای کەشتی نقومبوونەکەوە چی بەسەر "هانس"ی نانەوادا هاتووە.

بەر لەوەی بخەوم بیرم لە "لودفی" و "ئەلبێرت" و "هانس"ی نانەوا دەکردەوە. هەر هەموویان پێش ئەوەی ببنە نانەوا لە دۆرفدا، تەمەنێکی سەختیان بەسەربردووە. ئەو شتەش کە هەموویانی پێکەوە دەبەستەوە، نهێنی "ساردیە ئەرخەوانیەکە" و ماسیە پرتەقاڵیەکان



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

بوو. بەدەر لەوانەش "هانس"ی نانەوا باسی "فرۆد" ناوێکی کرد، کە چەند کاغەزێکی یاری سەیری هەبووە...

ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، هەموو شتێک پەیوەندی بە تێکشکانی کەشتیەکەی "هانس"ی نانەواوە هەبووە.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**کچی قەرە**

**...ئەو پەپولانە جۆرە دەنگێکیان لێوە بەرزدەبووەوە کە هەر لە جریوەی بولبول دەچوو...**

کەم ڕێدەکەوت باوکم لەپێش مندا خەبەریبێتەوە، بەڵام بەیانی زووی ڕۆژی دواتر ئەو خەبەریکردمەوە. پێموابێت ئەو دوو شوشە بچکۆلەیەی کە دوێنێ کڕیبووی هێندە مەشروبی زۆری تێدا نەبووبوو، دەنا زیاتر بۆی دەخەوت.

باوکم گوتی؛

«ئەمڕۆ بەرەو "فێنیسیا" دەکەوینە ڕێ، لەگەڵ خۆر هەڵهاتندا بۆی دەردەچین»

خەونەکەی دوێنێ شەوم ڕێک لەو کاتەدا بەبیردا هاتەوە کە لە جێگاکەمدا هاتمە خوارەوە. خەونم بە شاری یاریەکەی دوێنێ و کورتەبنەکە و ژنەی فاڵگرەوەکەوە بینی. لە خەوەکەمدا کورتەبنەکە یەکێک بوو لە بووکەشوشەکانی ناو قیتارە ترسناکەکەی شاری یاری. ژنە قەرەجە قژڕەشەکە و کچەکەی سواری قیتارەکە بوون و لەو کاتەدا کەبەلای کورتەبنەکەدا تێپەڕین، ژنە قەرەجەکە زۆر بەقوولیً تەماشای ناو چاوەکانی کرد و بووبە کورتەبنەیەکی زیندوو. کورتەبنە بچکۆلەکەش تاریکایی شەوی بەفرسەت زانی و بەدزیەوە لە توونێلەکەدا هاتەدەرەوە. پاشانیش بە هەموو ئەورووپادا لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر سەفەریدەکرد، چونکە لەوە دەترسا خەڵکی بیناسنەوە و دیسانەوە بیبەنەوە بۆ ناو توونێلە ترسناکەکەی شاری یاریەکە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





ئەگەر بیانبردایەتەوە بۆ ئەوێ، ئەوسا وەک جاران دەبووەوە بە بووکەشوشە.

پێشئەوەی ئەو خەونە سەیرە لە مێشکمدا دەربکەم و پانتۆڵەکەم لەبەربکەم، باوکم ئامادەبوو بۆ ئەوەی بکەوینە ڕێ. من حەزمدەکرد زوو بگەشتینایەتە "فێنیسیا"، چونکە لەوێدا بۆ یەکەمین جار لەو سەفەرە دورودرێژەماندا چاومان بە دەریای ناوەڕاست دەکەوت. من هەرگیز ئەو دەریایەم نەبینیبوو، باوکیشم ئەو کاتە بینیبووی کە دەریاوانبووبوو. لە "فێنیسیا"شەوە دەبوایە بەناو یوگسلافیادا تێپەڕین و دواتریش بگەینە ئەسینا.

خۆمان گەیاندە ژووری نانخواردنی ئوتێلەکە و وەک هەموو شوێنەکانی تری خواروی "ئەلپە"ەکان، نانێکی ناخۆشی بەیانیمان کرد بە گەرومانداا. پێش کاتژمێری حەوت لەناو ماشێنەکەدابووین. وە ڕێک لەو کاتەشدا کە جولاین، خۆر لە ئاسۆوە دەرکەوت. باوکم چاویلکە خۆریەکەی لەچاوکرد و گوتی؛

«لەوەدەچێت هەموو پێش نیوەڕۆکەمان لەبەر تیشکی خۆردا بەرینە سەر»

ڕێگاکەمان بەرەو "فێنیسیا" بە دەشتی "پۆ"ی بەناوبانگدا تێدەپەڕی. دەشتی "پۆ" یەکێکە لە دەشتە هەرە بەپیت و فەرەکانی هەموو جیهان. بێگومان هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئاوە پاک و سازگارەکەی شاخەکانی "ئەلپ".

بۆ ماوەیەک بەلای باخێکی چڕی دار پرتەقاڵ و لیمۆدا تێپەڕین، کەمێک دواتر دار خورما و سەروو و زەیتون چواردەوری داپۆشین. لەناوچەیەکی کەمێک شێدارتریشیدا بەلای مەرەزەیەکی برنجدا



تێپەڕین، چواردەوری مەرەزەکە بە درەختی سوورە چنار گیرابوو. لە هەموو شوێنێکیشدا بەدرێژایی قەراغی ڕێگاکە ڕەبەنۆک (گوڵە مێلاقە)ی سوور ڕوابوو. ڕەنگە تیژەکەی جارجارێک ناچاریدەکردم چاوم هەڵبگلۆفم.

بەر لەپێش نیوەڕۆ گەیشتینە سەر تەپۆڵکەیەک و لەوێوە تەماشای دەشتەکەی خوارەوەمان دەکرد. چەندەها ڕەنگی جوان تێکەڵی یەکدی بووبوون، لەدڵی خۆمدا دەمگوت گەر وێنەکێشێک بیەوێت وێنەی ئەو ناوە وەک خۆی بکێشێت، ئەوا بێگومان دەبێت هەموو ڕەنگەکانی بەکاربهێنێت.

باوکم ماشێنەکەی وەستان، بەپەلە چووە قەراغ ڕێگاکەوە و جگەرەیەکی داگیرساند. دیاربوو وەک هەموو جارێک بیری لە شتێک دەکردەوە و خۆی بۆ یەکێک لە گوتە کورتەکانی ئامادە دەکرد کە حەزی لێبوو بیانخاتە ڕوو؛

«هانس تۆماس، هەموو ساڵێک ئەم هەموو شتانە سەرهەڵدەهێننەوە... تەماتە و لیمۆ و قنگر و گوێز و ... مەبەستم لە چەندەها تەن ڕووەکی سەوزە. دەزانیت ئەو زەویە ڕەشە بە چ شێوەیەک ئەو هەمووە سەوزاییە هەڵدەڕێژێتە دەرەوە؟»

هەر بەپێوە وەستابوو و دەیڕوانیە شتە زیندووەکانی چواردەوری، پاشان گوتی؛

«ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر سەری من دەسوڕمێنێت، ئەوەیە کە هەموو ئەو شتانە لە یەک خانەوە هاتوون. چەند ملیارد ساڵێک لەمەوبەر تۆوێکی بچکۆلە دروستبووە... ئەو تۆوەش کەوتۆتە خۆ دابەشکردن. لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکانیشدا ئەو تۆوە بچکۆلەیە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و بووە بە فیل و داری سێو و تووترکی سوور و مەیمونی گەورە[11]. تێدەگەیت هانس تۆماس؟»

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و ئەویش درێژەی بە قسەکانی دا. باسێکی تێروتەسەلی ڕەچەڵەکی پەیدابوونی چەندەها جۆری جیاواز جیاوازی ڕووەک و ئاژەڵی بۆ کردم. دواجاریش پەنجەی بۆ پەپولەیەک ڕاکێشا، کە لەسەر گوڵێکی شینەوە هەڵفڕی و گوتی "ڕێک ئەم پەپولەیە دەتوانێت بێ ترس بۆ خۆی لەم دەشتەی "پۆ"دا بژی، چونکە خاڵەکانی سەر باڵی لە چاوی گیانەوەرە دڕندەکان دەچن".

هەندێ جار کە باوکم دەوەستا بۆ جگەرە کێشان، لەبری ئەوەی گوتە فەلسەفیەکانی بەسەر منێکی بەلەنگازدا بچەسپێنێت، تەنها دەوەستا و بیری دەکردەوە، منیش ئەو کاتانە زەڕەبینەکەم لە گیرفانمدا دەردەهێنا و چەند لێکۆڵینەوەیەکی خۆشی بایۆلۆجیم ئەنجامدەدا. زەڕەبینەکەم لەو کاتانەشدا بەکاردەهێنا کە کتێبە بچکۆلەکەم دەخوێندەوە. من وای بۆ دەچووم کە سروشت و کتێبە بچکۆلەکە هەر وەک یەک پڕبن لە نهێنی.

بەدرێژایی چەندەها کیلۆمەتر باوکم لەپشتی سوکانەکەوە دانیشتبوو و بیریدەکردەوە. ڕێی تێدەچوو لەپڕێکدا بێدەنگی بشکێنێت و هەندێ ڕاستی گرنگ بڵێت دەربارەی ئەم زەویەی لەسەری دەژین، یان دەربارەی دایکم کە لە پڕێکدا بەجێیهێشتین. بەڵام لەو کاتەدا هیچ شتێک بەلای منەوە هێندە گرنگترنەبوو لەوەی کە دەستبکەمەوە بە خوێندنەوەی کتێبە بچکۆلەکە.

---

[11] ئەو جۆرە مەیمونەی کە لە مرۆڤ دەچێت.و







پێم خۆشبوو کە توانیم بگەمە سەر وشکانیەک کە لە پارچەیەکی چۆڵ و هۆڵی ناو دەریا جیاوازتربوو... لەوە دەچوو ئەو دوورگەیە نهێنیەکی ئەفسوناوی تێدا بێت. وە هەتاوەکو زیاتریش دەچوومە ناوەوەی، هەستمدەکرد نهێنیەکە گەورەتر دەبێت. وا دەهاتە بەرچاوم کە لەگەڵ هەموو هەنگاوێکی بچکۆلەمدا، بە هەموو ئاراستەکاندا خۆی بکاتەوە. هەر وەک ئەوەی بەلێشاو لەقولاییەکەوە هەڵقوڵێت و بە هەموو سوچێکی بەرزەلانیدا بێتەخوارەوە.

بەردەوام هەر بە تووڵە ڕێگاکەدا دەڕۆیشتمە ناو دوورگەکەوە، پاش کەمێک کەوتمە بەر دوڕیانێک. دەبوایە ڕێگایەکیانم هەڵبژاردایە و دوای بکەوتمایە. کەمە کەمە بەلای چەپی ڕێگاکەدا کەوتمە ڕاکردن. دواتریش دیسانەوە ڕێگاکە بووەوە بە دوو بەشەوە. ئەو جارەشیان هەر لای چەپم هەڵبژاردەوە.

لەپڕێکدا تووڵە ڕێگاکە لە پانتایی نێوان دوو شاخدا کۆتایی پێهات. لەوێدا کۆمەڵێ کیسەڵی زەبەلاح لەناو دەوەنێکی پڕ لە گژوگیادا بەهێواشی دەخولانەوە، گەورەترینیان لە دوو مەترێک تێدەپەڕی. لەوەوپێش بیستبووم کە کیسەڵی گەورە هەیە، بەڵام ئەوە یەکەمین جاربوو کە خۆم بەچاوی خۆم بیانبینم. یەکێک لە کیسەڵەکان سەری لە قەپێلکەکەی دەرهێنا و سەیرێکی کردم، لەوە دەچوو بیەوێت بڵێت "بەخێر بێیت بۆ ئەم دوورگەیە".

بەدرێژایی ڕۆژەکە بەردەوامبووم لەسەر ڕۆیشتن. بەردەوام دارستانی نوێشم دەبینی، دۆڵ و دەشتی پان و بەرینی بەر چیام دەبینی، بەڵام هەرگیز دەریام نەبینی. دەتگوت هاتوومەتە ناو شوێنێکی خەیاڵیەوە... بەپێچەوانەی شوێنێکی پڕ پێچ و دژوارەوەبوو کە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





ڕێگاکانی هیچ کۆتاییەکیان نیە و لەشوێنی خۆتدا هەر باوەخولێ دەکەیت.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتمە نزیک دەریاچەیەک، لەناو پانتاییەکدا لەبەر تیشکی خۆری ئەو پاشنیوەڕۆیەدا دەبریسکایەوە. هەر خێرا خۆم هەڵدایە قەراغەکەیەوە و تینوێتیەکەم شکاند. پاش ئەو هەموو حەفتەیە ئەوە یەکەمین جاربوو ئاوێک بخۆمەوە کە ئاوی ناو کەشتی نەبێت.

ماوەیەکی زۆریش بوو خۆم نەشۆریبوو، لەبەرئەوە جلوبەرگە دەریاییەکەی بەرم داماڵی و خۆم فرێدایە ناو ئاوەکەوە. بەتەواوەتی بوژامەوە، بەتایبەتی پاش ئەوەی بەو قرچەی گەرمایە بەدرێژایی پێشنیوەڕۆ هەر دەڕۆیشتم. ئەوجا لەناو ئاوەکەدا هەستمکرد کە دەموچاوم چەندە سوتاوەتەوە، بێگومان بەهۆی ئەوەوەبوو کە لەوەوپێش لەناو بەلەمی فریاگوزاریەکەدا بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ هیچ سێبەرێک ڕاستەوخۆ لەبەر خۆردابووم.

یەک دوو جار بەرەو قووڵایی ئاوەکە مەلەمکرد. لەژێر ئاوەکەدا چاومکردەوە و کۆمەڵێک ماسی پرتەقاڵیم بەرچاوکەوت، هەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەیان تێدا دەبینرا. هەندێکیان هەروەک ڕووەکەکانی قەراغ ئاوەکە سەوزبوون، هەندێکی تریان وەک بەردە بەنرخەکان شینبوون. کۆمەڵێکی تریشیان پولەکەی ئاڵتونی سووربا و زەرد و پرتەقاڵیان پێوەبوو. هەر دانەیەکیشیان بەشێک لە هەموو ڕەنگەکانی تێدا دەدرەوشایەوە.

دیسانەوە خۆم گەیاندەوە سەر وشکانی، لەبەر خۆری ئەو ئێوارەیەدا پاڵکەوتم تا وشکببمەوە. لەپڕێکدا برسێتی تاوی بۆ هێنام. لەناو دەوەنێکی چڕدا چاوم چووە سەر کۆمەڵێک تووی زەرد، هەر یەکێکیان



هێندەی شلیکێک گەورەبوو. لە ژیانمدا تووی بەو شێوەیەم نەبینیبوو، بەڵام پێموابوو بخورێن. تامەکەشی لەتامی تێکەڵەیەک لە گوێز و مۆز دەچوو. پاش ئەوەی سەرومڕ تێرم لێخوارد، جلوبەرگە دەریاییەکەم لەبەرکردەوە و دواتریش بەشەکەتی لەقراغ ئاوی دەریاچە گەورەکەدا خەوم لێکەوت.

بۆ بەیانی زووی ڕۆژی دواتر لەگەڵ جوڵەیەکی ناکاودا خەبەرمبووەوە. دەتگوت ئەندێشەیەکی قووڵ هەموو لەشم ڕادەتەکێنێت.

لەدڵی خۆمدا گوتم "دەرچووم!" تەنها ئەو کاتە بەتەواوەتی بڕوامکرد کە لە کارەساتی کەشتی تێکشانەکە ڕزگارم بووە. هەستمدەکرد سەرلەنوێ لەدایکبوومەتەوە.

لەلای چەپی دەریاچەکەوە تەپۆڵکەیەکی سەیری لێبوو. سەرتاپای گردەکە بە گیای زەرد و گوڵی سووری شێوە سەعاتی داپۆشرابوو، گوڵەکان لەبەر هەوای هێواشی ئەو بەیانیەدا دەشنانەوە.

پێش ئەوەی خۆر بەتەواوەتی هەڵبێت، خۆم گەیاندە سەر تەپۆڵکەکە. تەنانەت لەوێشەوە دەریام لێوە دیارنەبوو. لەوێوە تەنها ناوچەیەکی پان و بەرین دەدی، تا بڵێیت گەورە. من لەوەوپێش ئەمریکای باکور و باشورم بینیبوو، بەڵام ئەو ناوچەیەی کە تێیدابووم بە هیچ جۆرێک لەوێ نەدەچوو. لەوێدا هیچ شوێنەوارێکی مرۆڤ نەدەهاتە بەرچاو.

هەتا ئەو کاتەی خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵهات، من هەر لەسەر لوتکەی تەپۆڵکەکە مامەوە. خۆر هەر بەچەشنی تەماتەیەک سووربوو، بەڵام ڕووناکیەکی پەرتپەرتی وەک سەرابی پەخشدەکردەوە و بەسەر دەشتە پان و بەرینەکەدا بەرزبووەوە. لەو شوێنەدا ئاسۆ زۆر نزمبوو،



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



هەر لەبەرئەوە خۆر گەورەتر و سوورتر دەردەکەوت. من هەرگیز لەوەوپێش خۆرم بەو شێوەیە نەبینیبوو، تەنانەت لە دەریاشدا.
لە دڵی خۆمدا گوتم "بڵێیت هەمان ئەو خۆرەبێت کە ئێستاکە لە ئاسمانی "لیوبیک"دا بەسەر دایک و باوکمەوە دەدرەوشێتەوە؟"
بەدرێژایی پێش نیوەڕۆ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆیشتم. لەو کاتەدا کە خۆر لە ئاسماندا بەرزبووەوە، گەیشتمە ناو دۆڵێکی پڕ لە گوڵەباخی زەرد. لەنێو مێرگی گوڵەباخەکاندا چەند پەپولەیەکی گەورە دەفڕین، هەر زۆر گەورە گەورە بوون. باڵی گەورەترینیان هێندەی باڵی قەلەباچکەیەک دەبوو، بەڵام هەر زۆر زۆر جوانتربوون. هەمووشیان ڕەنگیان شینێکی تۆخبوو، بەڵام لەسەری سەرەوەی باڵەکانیانەوە دوو شێوە ئەستێرەی گەورەی جەرگییان پێوەبوو. بەلای منەوە هەر لە گوڵی زیندوو دەچوون. لەوەدەچوو کە هەندێک لە گوڵەکانی سەر دوورگەکە لەپڕێکدا خۆیان لە زەوی کردبێتەوە و فێری هونەری فڕین بووبن. لە هەموو شتێک سەیرتریش ئەوەبوو کە ئەو پەپولانە جۆرە دەنگێکیان لێوە بەرزدەبووەوە کە هەر لە جریوەی بولبول دەچوو. بەچەند تۆنێکی جیاوازی بەرز و نزم ئاوازێکی ناسکیان دەخوێند. بەو شێوەیەش دەنگێکی نەرمی مۆسیقی باڵی بەسەر دۆڵەکەدا کێشابوو _هەر وەک چۆن لە ئۆرکێسترایەکدا خاوەنی ئامێرە هەواییەکان پێش ئەوەی کۆنسێرتەکەیان دەستپێبکات، فوو بە ئامێرەکانیاندا دەکەن، دەنگی پەپولەکانیش بەو شێوەیە دەهاتە بەر گوێم.
ڕووبارێکی بەخوڕ بەناو دۆڵەکەدا دەڕۆیشت. منیش بۆ ئەوەی هەروا تەنها بێهودە بەناو دوورگەکەدا نەخولێمەوە، بڕیارمدا دوای ڕووبارەکە بکەوم. لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بەو شێوەیەش لە کاتێکدا



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

هەر دەگەمە دەریا". بەڵام بەو جۆرە ئاسانە نەبوو کە من مەزەنەمدەکرد، چونکە پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتمە ئەو سەری دۆڵە گەورەکە. هەروەکو ڕەحەتیەک نەختە نەختە تەنگبووەوە و دواتریش ڕووبەڕووی چیایەکی سەخت بووەوە و کۆتایی پێهات.
من لەوە تێنەدەگەیشتم، خۆ ڕێیتێناچێت ڕووبارەکە بگەڕێتەوە و هەمان ئەو ڕێگایە بگرێتەوەبەر کە لێوەی هاتووە. بەڵام کە گەیشتمە ئەو سەری ئەوسەر، ئەوسا بینیم شاخەکە توونێلێکی تێدایە و ڕووبارەکەی پێدا تێدەپەڕێت. چوومە سەر دەمی توونێلەکە و تەماشامکرد. لەوێدا ئاوەکە دەچووە توونێلەکەوە و کەناڵێکی ژێر زەمینی پێکهێنابوو.
لەبەردەم توونێلی ناو شاخەکەدا کۆمەڵێک بۆقی گەورە گەورە لەقەراغ ئاوەکەدا هەڵدەبەزینەوە. هەر یەکەیان هێندەی کەروێشکێک دەبوو و کاتێکیش پێکەوە دەیانقیڕاند، غەڵبەغەڵبێکی ناخۆشیان لێوە بەرزدەبووەوە. من هەرگیز نەمزانیبوو کە بۆقی هێندە گەورە لە سروشتدا بوونی هەیە.
لەناو گژوگیا تەڕەکەدا هەندێ مارمێلکەی قەڵەو قەڵەو و کۆمەڵێک سەرمازەڵەی[12] زل زل بە خشکەخشک دەهاتن و دەچوون. هەرچەندە لەوەوبەر ئەو گیاندارانەم بەو گەورەییە نەبینیبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەلامەوە ئاسایی بوو، چونکە من چەندەها شاری بەندەریی جیهانم بینیبوو. بەڵام هەرگیز بەو ڕەنگە جیاوازانە نەمبینیبوون. لەسەر ئەو دوورگەیەدا گیانەوەری خشۆکی سوور و زەرد و شینم بینی.

[12] جۆرێکە لە مارمێلکە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



لەپڕێکدا بۆمدەرکەوت کە ڕێگایەک بە درێژایی کەناڵەکە و بەناو توونێلەکەدا دەڕوات. تەنها ئەوەندەم لەسەربوو کە بەسکە خشێ پیابڕۆم و بزانم تا چ شوێنێک دەتوانم بڕۆم.
ڕەنگێکی سەوزباوی شین ناوەوەی شاخەکەی داپۆشیبوو. ئاوەکەش بە شێوەیەکی ئاسایی بە ڕێڕەوی خۆیدا دەڕۆی. لەوێشدا دیسانەوە کۆمەڵک ماسی پرتەقاڵی زۆرم لەناو ئاوە بێگەردەکەدا بینی.
پاش کەمێک لەو سەری تونێلەکەوە گوێم لە هاژەهاژێکی هێواشبوو. هەتاوەکو زیاتریش دەچوومە پێشەوە، دەنگەکە زیاتر و زۆرتر دەبوو. زیاتر لە دەنگی تەپەتەپی دەهۆڵ دەچوو. دواتر بۆمدەرکەوت کە لە تاڤگەیەکی ژێر زەمینیی نزیک دەبمەوە.
لە دڵی خۆمدا گوتم "کەواتە هەر دەبێت بگەڕێمەوە". بەڵام پێش ئەوەی بگەمە قەراغی تاڤگەکە، تیشکێکی تیژ هەموو ئەو ناوەی ڕووناککردەوە. تەماشایەکی سەرەوەم کرد و کونێکی پچکۆلەم لە سەقفی شاخەکەدا بەرچاوکەوت. هێواش هێواش خۆم گەیاندە کونەکە. پاش ماوەیەک تەماشای سروشتی خوارەوەم کرد، جوانیەکەی فرمێسکی بەچاوانمدا هێنایە خوارەوە.
بەهەزار حاڵ توانیم لە کونکەوە بێمە دەرەوە. کەمێک دواتر هەستامە سەرپێ. جوانی و بێوێنەیی سەوزایی و گژوگیای پڕی بەرپێم هەموو دەریای بیربردمەوە.
لە چیاکە هاتمە خوارەوە و کۆمەڵێک درەختی میوەی ترم بینی. هەندێک لە درەختەکان سێو و پرتەقاڵیان گرتبوو، هەندێکی تریشیان هەندێ میوە و تووی گرتبوو کە هەرگیز لەوەوپێش نەمبینیبوون. گەورەترین درەختیش جۆرە میوەیەکی درێژکۆڵەی گرتبوو، هەر لە





شێوەی هەڵوژە دەچوو. جۆرە دارێکی بچوکتریش میوەکانی سەوزبوون و بەئەندازەی تەماتەیەک دەبوون.
کێڵگەکەش پڕبوو لە گوڵ، بەڵام یەک لەیەک جوانتربوون. پڕبوو لە گوڵەزەنگ[13] و گوڵە ئەنیمۆن[14] و گوڵە بەهارە[15]. جگە لەوانەش لە هەموو شوێنێکدا دەوەنی گوڵەباخی چڕ بەرزبووبووەوە و تاجە گوڵینەی ئەرخەوانی پچکۆلە پچکۆلەیان پێوەبوو. لەسەر ئەو دەوەنانەشەوە هەندێک هەنگ گیزەگیزیانبوو، ئەندازەشیان لە پاساریەکانی ئەڵمانیا گەورەتربوو. باڵەکانیان لەبەر ئەو خۆری پاش نیوەڕۆیەدا دەدرەوشایەوە. لەوێدا زۆر بە تیژی بۆنی هەنگوینم دەکرد.
بە شیوەکەدا بەردەوام دەچوومە خوارەوە. لەوێدابوو کە چاوم بە "مۆلووک"ەکان[16] کەوت...
بەڕاستی هەنگەکان و پەپولەکان وایان لێکردم چاوم دابپچڕم. هەرچەندە لەوانەی ئەڵمانیا جوانتر و گەورەتریش بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام هەر هەنگ و پەپولەبوون. هەمان شتیش بۆقەکان و مارمێلکەکانی دەگرتەوە، بەڵام لەوێدا... ڕێک لەوێدا چاوم بەچەند گیانەوەرێکی گەورەی سپی کەوت کە جیاوازتربوون لە هەموو ئەو

---

[13] گوڵی سپی و شین و بنەوشەیی دەگرێت، بۆ ڕازانەوەی باخچەکان بەکاردێت.
[14] ڕووەکێکە گوڵی زەرد و شین و سپی دەگرێت.
[15] گوڵێکی ڕەنگ زەردی جوانە.
[16] نووسەر وشەی "مۆلووک"ی لە فەنتاسی خۆی دارشتووە، هەڵبەتە وەک ناوێک بۆ گیانەوەرە شەش قاچەکان بەکاریدەهێنێت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



**شتانەی لەوەو پێش بینیبووم یان بیستبووم. لەوێدا باوەڕم بەچاوی خۆم نەدەکرد و ناچاربووم چاوم دابخەم.**

**نزیکەی دوانزە بۆ پانزە دانەیەک دەبوون. هەروەک ئەسپ و مانگا گەورەبوون، بەڵام پێستێکی سپییان هەبوو و تاڕادەیەک لەپێستی بەراز دەچوو ـوە شەش قاچیشیان هەبوو. سەریشیان لەچاو سەری ئەسپ و مانگادا پچکۆلەتر و درێژکۆلەتربوو. جارجارێک سەریان بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە و دەیانگوت؛ "براشش، براشش!**

**من لەو دیمەنە نەترسام. ئەو گیانەوەرە شەش قاچیانە هەروەک مانگاکانی ئەڵمانیا بێوەی و بێئەقڵ دەهاتنە بەرچاو. بەڵام لێرەوە دڵنیابووم کە چوومەتە وڵاتێک کە لەسەر هیچ نەخشەیەکدا بوونی نیە. هەستێکی سەیر و ناخۆش دایگرتم، پێموابوو گەر مرۆڤێکی بێ دەموچاوم ببینیایە، ئەو کاتەش هەر هەمان هەستم دەبوو.**

بێگومان خوێندنەوەی ئەو هەموو پیتە بچکۆلانە کاتێکی زیاتری دەویست وەک لەوەی پیتی ئاسایی بخوێنیتەوە. دەبوایە هەموو پیتێکم بە جوانی ببینایە و بەپیتەکانی ترەوەم بنووسانایە، ئەوجا دەمتوانی وشەیەک بخوێنمەوە. ئەو کاتەی کە دەربارەی گیانەوەرە شەش قاچیەکەم خوێندەوە، پاشنیوەڕۆیەکی درەنگبوو، لە پڕێکدا باوکم لەسەر شارێگاکە پێچێکی کردەوە و گوتی؛

«نانی ئێوارە لە شاری "فیرۆنا"دا دەخۆین»

منیش لەو کاتەدا نووسراوی سەر ڕێگاکەم خوێندەوە گوتم؛

«انۆریفا»

لەو کاتەدا کە بەرەو شارەکە دەڕۆیشتین، باوکم باسی چیرۆکە دڵ تەزێنەکەی "ڕۆمیۆ و جولێت"ی بۆ کردم، کە نەیانتوانی بەیەکتری





شادبن، چونکە خێزانەکانیان بەردەوام لەگەڵ یەکدا دەجەنگاند. ئەو دوو دەستگیرانە گەنجە ـکە دواتر لەبەر خۆشەویستیە قەدەغەکراوەکەیان گیانیان لەدەستدا ـ چەند سەد ساڵێک لەمەوبەر لەم شارەی "فیرۆنا"دا ژیابوون... دواتر گوتم؛

«کەمێک لە چیرۆکی نەنکم و باپیرەم دەچێت»

باوکم بەدەنگێکی قرخنەوە پێکەنی، چونکە هەرگیز بیری لەوە نەکردبووەوە.

ماکەرۆنی و پیتزامان لە چێشتخانەیەکی گەورەدا خوارد. بەرلەوەی بکەوینەوە ڕێ، کەمێک بە شەقامەکاندا پیاسەمانکرد. باوکم خۆیکرد بە دووکانێکی دیاری فرۆشتندا و دەستەیەک کاغەزی یاری کڕی، 52 کاغەزبوون و وێنەی نیوە ڕووتی ئافرەتی لەسەربوو. ئەمجارەشیان خێرا جۆکەرەکەی دەرهێنا، بەڵام هەموو کارتەکانی تریشی هەڵگرت.

وابزانم کەمێک شەرمی دەکرد، چونکە بەمەزەندەی ئەو ئافرەتەکان جلی زۆرتریان لەبەردایە. بەهەرحاڵ بەپەلە هەموو کاغەزەکانی خنیە ناو گیرفانی کراسەکەیەوە.

هەروا بەدەم خۆیەوە و وەک ئەوەی هەر بۆ خۆی قسەبکات گوتی؛

«بەڕاستی سەیرە ئەو هەموو ئافرەتە هەیە»

بێگومان قسەکەی بێمانابوو، چونکە لە ڕاستیدا نیوەی دانیشتوانی سەر زەوی ئافرەتن، بەڵام خۆ دەبوایە شتێکی هەر بگوتایە. پێموابێت مەبەستی لەوەبوو بڵێت چەندە ئافرەتی ڕووت زۆرە، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی لەیەک کاتدا چاوەڕوانی بینینی ئەو هەموو ئافرەتە ناکەیت بەو شێوەیە.

ئەگەر مەبەستی لەوە بووبێت، ئەوا منیش بەتەواوەتی لەگەڵیدام. من خۆم پێموابوو کەمێک بێ تامبێت کە 52 ئافرەتی بەو شێوەیە لە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

دەستەیەکی کاغەزدا کۆبکرێتەوە. دەتوانم بڵێم لە هەموو یارێکدا بیرۆکەیەکی خراپە، لەبەرئەوەی ناکرێت یاری کاغەز بەدەستەیەک بکرێت کە هەر هەمووی کچ بێت. بێگومان لەلای چەپی کارتەکانەوە نووسرابوو پاشای قەرە و چواری سینەک و هتد... بەڵام ئەگەر بە جۆرە کاغەزێکی ئاوها یاری بکەیت، ئەوا لەبری ئەوەی سەرنجت بدەیتە یاریەکە هەر دادەنیشیت و تەماشای کچەکان دەکەیت.

تەنها پیاوی ئەو دەستەیە جۆکەرەکەی بوو. ئەویش پەیکەری پیاوێکی یۆنانی یان ڕۆمی بوو و کڵاوێکی شاخداری لەسەردابوو. ئەویش ڕووتبوو، بەڵام خۆ هەموو پەیکەرە کۆنەکان خۆیان هەر ڕووتن.

هەتا ئەو کاتەی لەناو فیاتەکەشماندا دانیشتینەوە، من بەردەوام هەر بیرم لەو کاغەزە سەیرانە دەکردەوە و گوتم؛

«بابە هەرگیز بەخەیاڵتا نەهاتووە کە ژنێکی نوێ بۆ خۆت بدۆزیتەوە و بیهێنیت؟ مەبەستم لەوەیە، ئەوەت باشترێک نیە وەک لەوەی نیوەی ژیانت لە گەڕانەدا بەدوای دۆزینەوەی ژنێکدا سەرفبکەیت، کە هێشتام خۆی نەدۆزیتەوە؟»

«تا ڕادەیەک لەگەڵتام کە کەمێک نهێنی تێدایە. ڕاستە پێنج ملیارد خەڵک لەسەر ئەم زەویە دەژین، بەڵام لەو هەمووەدا پیاو لەگەڵ یەک دانەیاندا دەکەوێتە عەشقەوە... ئەو یەکەش بە هیچ ئافرەتێکی تر ناگۆڕێتەوە»

لەوێدا ئیدی کۆتاییمان بەباسی کاغەزەکان هێنا. هەرچەندە 52 ئافرەتی جیاوازی تێدابوو، وە هەریەکەیان بە هەموو شێوەیەک دەیانویست بە جوانترین شێوە خۆیان بنوێنن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من وا تێگەیشتم کە بەلای باوکمەوە کاغەزێکی گرنگی



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

نوقسانبووبێت... ئەو کاغەزەش ڕێک ئەو دانەیەبوو کە دەبوایە لە ئەسینادا بماندۆزیبایەتەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



## پاشای قەرە

### ...پلەی چوارهەمی یەکتربینینت...

دەمەو ئێوارە گەیشتینە "فێنیسیا". پێشئەوەی بچینە ناو شار ناچاربووین ماشێنەکەمان لە گەڕاجێکی گەورەدا دابنێین، چونکە ئەو شارە تەنانەت یەک شەقامی ئاسایی تێدا نیە. بەڵام لەبەرامبەردا 180 کەناڵ و پتر لە 450 پردی تێدایە، وە هەزارەها بەلەمی بچوک و نیمچە گەورەشی تێدایە.
لەو گەڕاجەوەی کە ماشێنەکەمان تێدا دانا بە بەلەمێکی "تەکسی" بەرەو ئوتێلەکەمان ڕۆیشتین. ئوتێلەکەمان لەلای گەورەترین کەناڵی فێنیسیاوەبوو و ناوی کەناڵی "گراندا"بوو. باوکم هەر لە شاری "کۆمۆ"وە ژووری لەو ئوتێلەدا گرتبوو.
شتەکانمان بردە ژوورەکەوە، لەڕاستیدا بچوکترین ژوور و ناشیرینترین ئوتێلبوو لە هەموو سەفەرەکەماندا. دواتر بەرەو ناو شار کەوتینە ڕێ و بەقەراغی کەناڵەکاندا پیاسەمانکرد، بەسەر هەندێک لە پردە بێشومارەکانی شارەکەشدا ڕۆیشتین.
دەبوایە بەرلەوەی درێژە بەسەفەرەکەمان بدەین، دوو شەو لەو شارە پڕ لە کەناڵەدا بەسەربەرین. من دەمزانی باوکم بەفرسەتی دەزانێت و بە ئارەزووی دڵی خۆی لە مەشروبە قورسەکانی ئەو شارە دەخواتەوە.
پاش ئەوەی نانێکی باشمان لە گۆڕەپانە گەورەکەی "سان مارکۆ"دا خوارد، قەناعەتم بە باوکم کرد کە بەلەمێک بگرین و کەمێک پارە لە پیاسەیەکی بچکۆلەدا سەرفبکەین. باوکم حەزیدەکرد شوێنێکی





دیاریکراو ببینێت، لەبەرئەوە پەنجەی خستە سەر نەخشەکە و دواتر بەلەمەوانەکە کەوتە شڵپەشڵپی سەوڵلێدان. من چاوەڕوانبووم باوکم گۆرانیەک بڵێ، بەڵام تەنانەت یەک دێڕیشی لەدەم نەهاتە دەرەوە. بێدەنگیەکەی باوکمم بەلاوە ئاسایی بوو، چونکە دەنگی بەلەمەکە بەلای منیشەوە تا بڵێیت ناسازبوو.
لەو کاتەدا کە بەبەلەمەکە کەمێک بە کەناڵەکەدا چووبوینە خوارەوە، شتێک ڕوویدا کە تائێستاکەش من و باوکم ڕێک ناکەوین لەسەری. ڕێک لەو کاتەدا کە لە پردێک نزیکبووینەوە و خەریکبوو بەژێریدا تێپەڕین، دەموچاوی کەسێک لەسەر پردەکەوە دەرکەوت کە هەر زۆر ئاشنابوو لام. من هیچ گومانێکم نەبوو کە هەمان کورتەبنەکەی بەنزینخانەکەبوو، بەڵام ئەو جارەیان بەهیچ جۆرێک ئەو دیمەنە ناکاوەم بەلاوە خۆشنەبوو. من وا تێدەگەیشتم کە بەردەوام کەسێک بە بەرنامەوە بەدوامانەوە بێت. لەناو بەلەمەکەدا بەرزبوومەوە، پەنجەم بۆ سەر پردەکە ڕاکێشا و هاوارمکرد؛
«کورتەبنەکە!»
لەو کاتەدا باوکم هەر زۆر زۆر توڕەبوو لێم، بەڵام ئەمڕۆکە لە توڕەبوونەکەی ئەوسای تێدەگەم. لە ڕاستیدا هێندەی نەمابوو بەلەمەکە هەڵبگەڕێتەوە.
باوکم وەک فرمانێک بەسەرمدا هەڵشاخی و گوتی؛
«هەر ئێستا لە شوێنی خۆتدا دادەنیشیتەوە!»
کەچی کە لە پردەکە تێپەڕین، باوکم ئاوڕێکی لە سەر پردەکە دایەوە. گرفتەکەش ڕێک لەوەدابوو کە ئەو کاتە کورتەبنەکەی لێنەمابوو _ڕێک هەروەک شاری یاریەکەی "کۆمۆ".



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«ئاخر بینیم»... هێندەم گوت و دەستمکرد بە گریان. هەڵبەتە کەمێک لەوە ترسام کە بەلەمەکە قلْپ ببێتەوە، بەڵام جگەلەوەش دڵنیابووم کە باوکم باوەڕی پێنەدەکردم. ئەوجا باوکم گوتی؛

«هانس تۆماس، تەنها ئەوەندەیە کە دەتەوێت باوەڕ بەخۆت بهێنیت کە ئەو دەبینیت و هیچی تر»

بەڵام من سووربووم لەسەر قسەکەم؛

«بەڵام کورتەبنەیەک بوو»

هەرچەندە ئەو تەنانەت سێبەرەکەشی نەبینی، بەڵام بەدەنگێکی کەمێک بێزارەوە گوتی؛

«لەوانەیە، بەڵام هەمان ئەو کورتەبنەیە نەبوو کە لە بەنزینخانەکەدا بینیمان»

«تۆ پێت وایە هەموو ئەوروپا پڕبێت لە کورتەبنە یان چی؟»

پێموابێت پرسیارەکەم لایەنێکی هەرە گرنگی بابەتەکەی خستەڕوو، چونکە باوکم بۆ ماوەیەک بێدەنگ مایەوە و وەک مەکربازێک پێکەنی و گوتی؛

«بەڵێ، لەوانەیە. ئێمە هەموومان جۆرە کورتەبنەیەکی سەیرو سەمەرەین. ئێمە هەموومان هەروەک ئەو کورتەبالآیە پڕنهێنیە واین و لە ناکاوا لەسەر پردێکی فێنیسیادا دێین و دەچین»

بەلەمەوانەکە - کە کەمێک خەمباری پێوە دیاربوو- لە شوێنێکدا دایبەزاندین کە چەندەها شوێنی بچکۆلە بچکۆلەی خواردەمەنی لێبوو، زۆربەشیان لەبەردەم دووکانەکانیاندا کورسی و مێزیان ڕازاندبۆوە. لەیەکێک لەو شوێنانەدا باوکم ئاسکریمێک و ساردیەکی بۆ کڕیم. بۆ خۆشی قاوەیەک و شتێکی تری داواکرد، کە ناوی "فیشیا





ڕۆماگنا"بوو. زۆر سەرم نەسوڕما کە بینیم "ڕۆماگنا"کەی خواردنەوەیەکی قاوەییبوو و لە پەرداخێکی جواندا بۆیان هێنا.

دوای ئەوەی دوو سێ پەرداخێکی لەو خواردنەوە قاوەییە خواردەوە، زۆر بە قوڵی تەماشای ناو چاوانی دەکردم، هەروەک ئەوەی بیەوێت گەورەترین نهێنی ژیانیم بۆ بدرکێنێ.

«خۆ باخەکەی ماڵی خۆمانت بیرماوە؟»

تاقەتم نەبوو خۆم دابەزێنمە ئاستی پرسیارێکی هێندە بێمانا و وەڵامی بدەمەوە، ئەویش چاوەڕوانی هیچ وەڵامێکم نەبوو، بۆیە بەردەوامبوو لەسەر قسەکانی؛

«باشە، ئینجا بەیارمەتیت لێرەوە باش گوێم بۆ شلبکە، هانس تۆماس. با بڵێین بەیانیەکیان دەچیتە باخەکەوە و لەوێدا لەنێو دار سێوەکاندا کەسێکی بچکۆلەی خەڵکی "مەریخ" دەبینیت. با وایدابنێین کە ئەو کەمێک لە تۆ بچکۆلەترە، شێوەی ڕەنگ و ڕوخساریشی بۆ فەنتاسیای خۆت بەجێدەهێڵم، گەر دەخوازیت وەک کوڕێکی زەرد یان سەوز بیهێنە بەرچاوت.

ناچارانە سەرێکم بۆ لەقاند. خۆ هەڵبژاردنی بابەتەکە بەدەست من نەبوو، لەبەرئەوە ناڕەزایی دەربڕینیش هیچ سوودێکی نەبوو. پاشان درێژەی بە باسەکەیدا؛

«ئەو کەسە نامۆیە چاوت تێدەبڕێت، هەروەک چۆن گەر کەسێکی سەر ئەستێرەیەکی تر ببینێت و بەزەقی سەیری بکەیت. بەڵام ئەی تۆ لەو کاتەدا چی دەکەیت؟»

خەریکبوو بڵێم بانگی دەکەم نانێکی بەیانی سەر زەویم لەگەڵدا بخوات، بەڵام لەبری ئەوە ڕاستیەکەم درکاند و گوتم "بێگومان ئەو کاتە زۆر دەترسم و یەکسەر وەک هندیە سوورەکان هاواردەکەم".



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



باوکم سەرێکی بۆ لەقاندم و دیاربوو کە وەڵامەکەمی بەدڵبوو. بەڵام زانیم هێشتام دەیەوێت چەند شتێکی تریش بڵێت؛

«پێشت وانیە ئەو کاتە سەرت لەوە بسوڕمێت کە ئەو کوڕە کێیە و خەڵکی کوێشە؟»

منیش گوتم؛

«بێگومان»

دیسانەوە باوکم تەماشایەکی چواردەورەکەی کردەوە، وەک ئەوەی بیەوێت شتێکی زۆر گرنگم پێبڵێت و لێی پرسیم؛

«هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کە خۆت کەسێکی ئاوهابیت؟»

من ئەو باسانەم بەلاوە ئاسایی بوو، بەڵام ئەو جارە بەتەواوەتی سەری سوڕمانم و ناچاربووم دەستم بەکەمەی کورسیەکەمەوە بگرم، بۆ ئەوەی نەکەومە خوارەوە. ئەوجا گوتی؛

«یان بۆ نمونە کەسێکی سەر ئەم زەویە بیت... لەڕاستیدا هەر ناوێک لەم زەویەمان بنێین، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت. لە هەموو بارێکدا تۆش وەک ئەو، کوڕێکی دوو قاچیت و لەسەر پەنجەی قاچت بەسەر ئەستێرەیەکی ئەم گەردوونەدا دەخولێیتەوە»

منیش گوتم؛

«هەروەک پیاوەکەی مەریخ»

باوکم سەرێکی لەقاند بۆم و گوتی؛

«لەوانەیە هەرگیز لە باخەکەدا ڕووبەڕووی کەسێکی خەڵکی مەریخ نەبیتەوە، بەڵام ڕێیتێدەچێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕووبەڕووی خۆت ببیتەوە. ئەو ڕۆژەش کە ئەوە ڕوودەدات، لەوانەیە وەک هیندیەکی سوور بقیژێنیت. بێگومان هاواردەکەیت، چونکە هەر وا بەئاسانی





هەموو ڕۆژێک هەست بەوە ناکەین کە کەسێکی پڕ لە ژیانی سەر زەوین و لەسەر دوورگەیەکی گەردووندا دەژین»

من لە مەبەستی تێدەگەیشتم، بەڵام لە هەمان کاتدا نەمدەزانی چی بڵێم. دوا هەمین شتیش دەربارەی پیاوەکەی مەریخ گوتی؛

«کاتی خۆی فلیمێکمان بینی کە ناوی "یەکتربینین" بوو... لەیادتە؟»

سەرێکم بۆ لەقاند. فلیمێکی شێتانە بوو. باسی چەند کەسێکی دەکرد کە چاویان بە فڕۆکەیەکی ئاسمانی دەکەوێت کە لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتووە.

«گەر کەشتیەکی ئاسمانی ببینین کە لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتبێت، ئەوا ناوی دەنێین "پلەی یەکەمی یەکتربینین". وە ئەگەر لەسەروئەوەشەوە بوونەوەری دووقاچی لە کەشتیەکەوە بێنە دەرەوە و بیانبینین، ئەوا پێی دەڵێین "پلەی دووهەمی یەکتربینین". بەڵام ساڵێک لەدوای ئەو فلیمە، فلیمێکی تریشمان بینی...»

ئەوجا گوتم؛

«ناوی "پلەی سێهەمی یەکتربینین" بوو»

«ڕاستە. چونکە لەوێدا دەستیان لەو بوونەوەرە شێوە مرۆڤیانەدا کە لە کۆمەڵەیەکی خۆری ترەوە هاتبوون. کتومت دەستلێدانی شتێکی نەناسراوە کە پێی دەڵێن "پلەی سێهەمی یەکتربینین"، تێدەگەیت؟»

«بەڵێ، بەڵێ»

لێرەدا باوکم بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بێدەنگبوو، هەر دەیڕوانیە قاوەخانەکانی گۆڕەپانەکە. پاشان گوتی؛

«بەڵام تۆ هانس تۆماس "پلەی چوارهەمی یەکتربینینت" بینیوە»

لەو کاتەدا دەبێت لە نیشانەیەکی پرسیاری زیندوو چووبم.

باوکم بە زمانێکی توندەوە گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«چونکە تۆ خۆت بوونەوەرێکی پڕنهێنی ئاسمانیی بەو شێوەیەیت»
زۆر بە توندی کوپی قاوەکەی کێشا بە مێزەکەدا، نازانم چۆن نەشکا... هەردووکمان سەرمان لەوە سوڕما. ئەوجا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛
«تۆ خۆت ئەو بوونەوەرە پڕنهێنییەیت و لەناوەوەتدا دەیناسیت»
لەوێدا بەتەواوەتی سەرم لێشێوا، بەڵام لەهەمان کاتدا دەمزانی باوکم ڕاستدەکات. هەر لەبەرئەوە لە کانگای دڵمەوە گوتم؛
«دەبوایە دەوڵەت موچەی فەیلەسوفی پێببەخشیتایە»

بۆ ئێوارە گەیشتینەوە ژووری ئوتێلەکە و سیسرکێکی گەورەمان لەسەر زەویەکە بینی. هێندە گەورەبوو لەکاتی ڕۆیشتنیدا قرچە قرچی لێوە دەهات.
باوکم خۆی بەسەردا چەماندەوە و گوتی؛
«سیسرکە پیرەکە لێمان ببوورە کە ئەم شەو ڕێگەت پێنادەین لەلامان بمێنیتەوە. تەنها دوو ژوورمان گرتووە و جێگای کەسی ترمان نیە. جگەلەوانەش ئێمە پارەی ژوورەکان دەدەین»
وامزانی باوکم بەتەواوەتی شێت بووە، بەڵام سەیرێکی کردم و گوتی؛
«ئەم سیسرکە هێندە قەڵەوە کە ناتوانین بیکوژین، هانس تۆماس. هەر لەبەر گەورەییەکەی دەتوانین بڵێین بووە بە بوونەوەرێکی سەربەخۆ. هەرچەندە بەبینینیان کەمێک بێزاردەبین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوونەوەری سەربەخۆن و نابێت بکوژرێن»
«ئەی چی لێبکەین؟ وازیلێبهێنین بۆ خۆی بسوورێتەوە؟»
«نەخێر! دەیکەینە دەرەوە»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

ڕێک هەر بەو جۆرەشی کرد. باوکم سیسرکەکەی هەتا دەرەوەی ژووری ئوتێلەکە بەڕێکرد. لەپێشدا هەموو جانتا گەورە و بچوکەکانی هێنایە سەر زەویەکە، ئەوجا بەرامبەر یەک داینان و ڕێگایەکی بۆ دروستکرد. پاشان بۆ ئەوەی کەمێک خێراتر بڕوات، بە تاڵە شقارتەیەک پاڵی بە قنگی سیرکەکەوە دەنا. پاش نیو سەعاتێک کردیە دەرەوەی ژوورە بچکۆلەکەوە. لەوێدا ئیتر باوکم وازیلێهێنا. هەر باشبوو میوانە ڕەزاقورسەکەی هەتا ژووری پێشوازیەکەی خوارەوە نەبرد.
لەو کاتەدا کە دەرگاکەی پێوەیایەوە گوتی؛
«ئیتر کاتی خەوە»
لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و یەک و دوو وەک ڕووناکیەک کوژایەوە.
هەر کە دڵنیابووم باوکم کەوتۆتە جیهانی خەوەوە، گلۆپی سەر جێگاکەم بۆ داگیرساند و دەستمکردەوە بە خوێندنەوەی کتێبە بچکۆلەکەم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

بللی سینەک

...کتومت لەو نیشانانە دەچوون کە لەسەر کاغەزی یاری هەیە...

بەدرێژایی پاش نیوەڕۆ بەناو ئەو باخە بەپیتەدا هەر دەخولامەوە. لەپڕێکدا لە دوورەوە چاوم بە دوو کەس کەوت. دڵم لەتاوا خەریکبوو لە سنگمەوە دەرپەڕێتە دەرەوە.

لە دڵی خۆمدا گوتم "ڕزگارمبوو... کەواتە لەوانەیە ئەم شوێنە هەر ئەمریکا بێت، کێ دەزانێت؟"

لەو کاتەدا کە بەرەو ڕوویان دەڕۆیشتم، بیرم لەوە دەکردەوە کە لە زمانی یەکتری تێناگەین. من تەنها ئەڵمانیم دەزانی، کەمێک ئینگلیزی و نەرویجیش لەڕێگەی کارەکەمەوە لەسەر کەشتی "ماریا" فێربووبووم. بەڵام دڵنیابووم کە خەڵکانی سەر ئەو دوورگەیە بە زمانێکی دی قسەدەکەن.

هێدی هێدی لێیان نزیکبوومەوە، لەپانتاییەکی بچکۆلەدا خۆیان چەماندبووەوە و دیاربوو سەرقاڵی شتێکبوون. ئەوجا بۆمدەرکەوت کە لە من پچکۆلەتریش بوون، خۆم بە خۆمم گوت "بڵێیت مندالبن؟"

کاتێکیش کە هەر زۆر نزیکبوومەوە لێیان، بینیم ڕەگی دار کۆدەکەنەوە و دەیخەنە ناو سەبەتەیەکەوە. لەناکاودا ئاوڕیاندایەوە و سەیرێکیان کردم. دوو پیاوی کەمێک خڕین بوون، درێژی هیچیان لەسەر سنگم تێنەدەپەڕی. هەردووکیان قژیان قاوەیی باوبوو و پێستێکی ڕەنگ گوێزی قاوەیی تێریان هەبوو. هەردووکیشیان جلێکی ڕەسمی شینی تۆخیان لەبەردابوو. تەنها جیاوازیش ئەوە بوو کە







یەکێکیان سێ قۆپچە بە چاکەتەکەیەوە هەبوو و ئەوی تریان تەنها دووانی پێوەبوو.

یەکەمجار بە ئینگلیزی گوتم؛

«ئەم کاتەتان باش»

دوو پیاوە بچکۆلەکە ئامێرەکانی دەستیان فرێدا و چاویان تێبڕیم.

کەرەتێکی تر بە ئینگلیزی پێم گوتن؛

«ئینگلیزی دەزانن؟»

دوو پیاوەکە، کە هەر لە کورتەبنە دەچوون، دەستیان بەملاولادا بادا و سەریان ڕاوەشاند.

هەرلەخۆیەوە وەکو شتێکی خۆڕسک بە زمانی دایکم سەلامم لێکردن. ئەوسا یەکسەر، یەکسەر ئەو یەکەیان کە سێ قۆپچە بە جلەکانیەوەبوو بە زمانێکی ئەڵمانی ڕەوان وەڵامی دامەوە؛

«ئەگەر پتر لە سێ نیشانەت هەبێت، بۆت هەیە لێمانبدەیت. بەڵام لێتدەپاڕێینەوە کە لێمان نەدەیت»

سەرم سوڕما و نەمزانی چی بڵێم. ئاخر لەناو دوورگەیەکی ئۆقیانووسی ئارامدا سەیربوو بە زمانی خۆم وەڵامیان دامەوە. نەک هەر ئەوەش؛ تێنەگەیشتم مەبەستی لە "سێ نیشانە"کە چیبوو. پاشان هەر بۆ ئەوەی دڵنیابن گوتم؛

«من بەدڵێکی پڕ لە ئاشتیەوە هاتوومەتە لاتان»

«ئەوەت باشترە... هەڵبەتە ئەگەر بتەوێت پاشاکە سزات نەدات»

لە دڵی خۆمدا گوتم "پاشا! کەواتە لە ئەمریکای باشوردا نیم".

«من حەزدەکەم چاوم بە پاشاکە بکەوێت»... لە وەڵامدا گوتم.

ئەوجا ئەو دانەیان کە دوو قۆپچەی پێوەبوو خۆی لە قسەکانمان هەڵقورتاند؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«دەتەوێت لەگەڵ کام پاشادا قسەبکەیت؟»
«ئەی برادەرەکەت نەیگوت پاشاکە سزات دەدات؟»
«هەر خۆم زانیم. ئەو یاساکانی ئێرە نازانێت»
ئەو یەکەیان کە سێ قۆپچەی پێوەبوو، سەیرێکی کردم و گوتی؛
«لە یەک پاشا زیاتر هەیە»
«بەڵێ؟ باشە چەند پاشاتان هەیە؟»
هەردووکیان وەستابوون و بەدزیەوە خنەخنی پێدەکەنینیان دەهات. بەو جۆرەش وایان دەردەخست کە پرسیارەکانم بێمانابن... ئەو یەکەیان کە دوو قۆپچە بە جلەکانیەوە بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی؛
«هەر ڕەنگە و پاشایەکی هەیە»
تەنها لەو کاتەدا بە تەواوی بۆمدەرکەت کە چەندە پچکۆلەن. لە کورتەبنە گەورەتر نەبوون و بەڵام لەش و لارە پچکۆلەکانیان هەروەک لەشێکی ئاسایی بوو. هاوکاتیش هەستمدەکرد ئەو مرۆڤە چکۆلانانە ئەقڵیان هێندە زۆر نیە.
خەریکبوو لێیان بپرسم "باشە چەند ڕەنگتان هەیە؟"، بەو شێوەیەش دەمتوانی بزانم چەند پاشایان هەیە، بەڵام وازم لەو پرسیارە هێنا و لەبری ئەوە پرسیم؛
«گەورەترین پاشا ناوی چیە؟»
دیسانەوە تەماشای یەکیانکردەوە و سەریان ڕاوەشاندەوە. ئەویەکەیان کە دوو قۆپچەی پێوەبوو، ڕووی کردە ئەوی تریان و گوتی؛
«بڵێیت پێمان ڕانەبوێرێت؟»
«نازانم، بەڵام ناچارین وەڵامی بدەینەوە»



مێشێک لەسەر ڕوومەتە خڕپنەکەی ئەو یەکەیان نیشتبووەوە کە دوو قۆپچە بە جلەکانیەوە بوو، بەدەستی دەریکرد و گوتی؛
«بەشێوە باوەکەی پاشای ڕەش بۆی هەیە لە پاشای سوور بدات، بەڵام ڕووشدەدات پاشایەکی سوور لە پاشایەکی ڕەش بدات»
«چەندە دڵڕەق و توندوتیژن»... لە وەڵامدا گوتم.
«بەڵێ، بەڵام یاساکان بەو شێوەیەن»
لە پڕێکدا زرمەیەکی گەورەمان گوێلێبوو. هەر بەدەنگەکەدا دیاربوو کە هاڕەی شکانی شوشەبوو. هەردوو کورتەبنەکە ڕوویانکردە ئەو شوێنەی دەنگەکەی لێوەهات. ئەو یەکەیان کە دوو قۆپچە بە جلەکانیەوە بوو گوتی؛
«بێ ئەقڵن! نیوەی زیاتری بەرهەمەکەیان دەشکێنن»
بۆ ماوەیەک وەستابوون و پشتیان لێمبوو، لەو کاتەدا شتێکی ناخۆش و سەیرم بۆدەرکەوت؛ ئەو یەکەیان کە دوو قۆپچە بە چاکەتەکەیەوە بوو، دوو نیشانەی گەورەی سینەکی بە پشتەوە بوو. ئەوی تریشیان سێ نیشانەی سینەکی پێوەبوو. کتومت لەو نیشانانە دەچوون کە لەسەر کاغەزی یاری هەیە. بینینی نیشانەکانی سەر پشتیان یەکسەر کەمێک مانای بە گفتوگۆکەم بەخشی کە لەگەڵیاندا سازمدا.
ئەو کاتەی سەرلەنوێ ئاوڕیان لێدامەوە، هەوڵمدا لەلایەکی ترەوە بیاندوێنم، لەبەرئەوە پرسیم؛
«دانیشتوانی سەر ئەم دوورگەیە زۆرن؟»
یەکێکیان گوتی؛
«پرسیاری سەیر سەیر دەکات»
ئەوەی تریشیان گوتی؛
«ڕاستە، مایەی شەرمەزاریە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



بریا هەر لە یەکتری تێنەگەیشتینایە، پێم وابێت ئەوساکە باشترێک دەبوو. ڕاستە من لە هەموو وشەیەکیان تێدەگەیشتم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەزانی مەبەستیان چیە. تا ڕادەیەک خۆزگەم دەخوارد هەر بە ئیشارەت لەگەڵ یەکتردا قسەمان بکردایە و هیچ وشەیەکمان بەکار نەهێنانە.

خەریکبوو حەوسەڵەم نەمێنێت لەگەڵیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جارێکی تریش هەوڵی خۆمم دایەوە؛

«ئێوە چەندن؟»

ئەو یەکەیان کە نیشانەی سێی سینەکی بە پشتەوە بوو، وەڵامی دامەوە و گوتی؛

«پێموابێت دەتوانیت بمانبینیت کە ئێمە "دوو" و "سێ"ین. ئەگەر پێویستیشت بە چاویلکە هەیە، ئەوا باشترە لەگەڵ "فرۆد"دا قسەبکەیت. چونکە ئەو تەنها کەسە کە هونەری سافکردنی شوشە دەزانێت»

ئەوجا ئەوی تریان پرسی؛

«ئەرێ بەڕاست تۆ خۆت "چەندیت؟»

لەوەڵامدا گوتم؛

«هووها! من تەنها هەر خۆمم»

ئەو یەکەیان کە دوو قۆپچە بە چاکەتەکەیەوەبوو، ڕووی کردە ئەوی تریان، فیکەیەکی بەرزی لێدا و گوتی؛

«بللی"ە!»

ئەوی تریشیان بە سەرسوڕمانێکەوە وەڵامی دایەوە و گوتی؛

«کەواتە دۆڕندمان... گەر بیەوێت، دەتوانێت لەپاشاش بدات»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

دوای قسەکانی بتڵێکی پچکۆلەی لە گیرفانی بەرباخەڵیدا دەرهێنا. خواردنەوەیەکی بریقەداری تێدابوو، قومێکی باشی لێدا و ئەوجا دای بە ئەوەی تریان. ئەویش قومێکی لە بتڵەکەدا. دواتر ئەو یەکەیان کە سێ قۆپچە بە چاکەتەکەیەوەبوو، لەپڕێکدا گوتی؛

«بەڵام "بللی" کچ نیە؟»

ئەوی تریان وەڵامی دایەوە و گوتی؛

«مەرج نیە. تەنها "کچە"کان هەمیشە کچن. بەڵام پێدەچێت ئەم لە دەستەیەکی یاری کاغەزی ترەوە هاتبێت»

«قسەی بێمانا! دەستەی تر بوونی نیە. جگە لەوەش کاغەزی "بللی"، کچە»

«لەوانەیە ڕاست بکەیت. بەڵام ئەگەر تەنها چوار قۆپچەشی پێوەبێت، ئەوا دەتوانێت لێمانبدات»

«ڕاستە دەتوانێت لە ئێمە بدات، بەڵام ناتوانێت لە پاشاکەمان بدات، خۆ تۆ خۆت دەتوانیت بیژمێریت. مەبەستم لەوەیە هەڵیخڵەتاندین!»

بەردەوام هەر لە خواردنەوەکەی شوشە بچکۆلەکەیان دەخواردەوە، هێدی هێدی نیگایان هێواشتر و هێواشتر بووەوە. بەڵام لەپڕێکدا ئەو یەکەیان کە دوو قۆپچە بە چاکەتەکەیەوەبوو، زۆر بە توندی هەڵلەرزی. ڕێک تەماشای ناوچاوی کردم و گوتی؛

«ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات»

دوای ئەوە هەردووکیان لەسەر زەوی پاڵکەوتن و لەیەک کاتدا بەیەکەوە کەوتنە منگەمنگکردن و دەیانگوت؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«ڕێواس... مانگۆ... تووی چاکبوونەوە... خورما... لیمۆ... گوێزی هیندی... هونجا... شووکا[17]... مۆز...» بەردەوام ناوی چەندەها میوە و توویان دەبرد. من تەنها ناوی هێندێکی کەمم بیستبوون. دواتر خۆیان هەڵگەڕانەوە و لەسەر گازی پشت لێی ڕاکشان و یەکسەر خەویان لێکەوت.

بە قاچم کەوتمە ڕاوەشاندنیان، بەڵام بێسوودبوو و نەمتوانی خەبەریان بکەمەوە.

دیسانەوە بەتەنها مامەوە. لەیادمە ئەو کاتە وای بۆ چووم کە دوورگەکە پەناگای ئەو مرۆڤانەبێت کە نەخۆشی دەروونی بێچارەیان هەیە. هەروەها پێشم وابوو ئەو خواردنەوەیەی کە خواردیانەوە، جۆرە دەرمانێکی هێمنکەرەوە بێت. بەو شێوەیەش لەو بڕوایەدابووم لە پڕێکدا سستەرێک یان دکتۆرێک دەرکەوێت و خەتای نائارامی نەخۆشەکان بخاتە ملی من.

لەپانتاییەکەوە گەڕامەوە دواوە. پاش کەمێک کەسێکی شێوە کورتەبنە بەرەوڕووم هات. ئەویش هەمان شێوە جلێکی ڕەسمی شینی تۆخی لەبەردابوو، بەڵام دوو ڕیز قۆپچەی بە چاکەتەکەوە بوو. ژمارەی قۆپچەکانی دە دانەبوو، ئەویش دەموچاوێکی خڕین و ڕەنگ گەنمی هەبوو. دەستی بەملاولادا بادەدا و هەروا بە شێوەیەکی ئاسایی تەماشایکردم و گوتی؛

[17] نووسەر وشەیەی "تووی چاکبوونەوە" و "هونجا" و "شووکا"ی لە خەیاڵی خۆی دارشتووە.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«ئەو کاتەی کە مێستەر دەخەوێت، کورتەبنەکان ژیانی تایبەتی خۆیان بەسەردەبەن»

لە دڵی خۆمدا گوتم "شتێکی تریشم لێ پەیدابوو".

پەنجەم بۆ دووانەکەی خوارەوە ڕاکێشا کە خەوتبوون و گوتم؛

«لەوە دەچێت کورتەبنەکانیش خەوتبن»

ئەوجا بەپەلە بۆی دەرچوو. ڕاستە بە هەموو هێز و توانای قاچە پچکۆلەکانی ڕایدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەپەلە دوورنەدەکەوتەوە. چەند جارێک بەدەمدا کەوت و هەڵسایەوە، هەڵدەسایەوە و دەکەوتەوە. من بە ئاسانی هەر دە نیشانە سینەکەکەی پشتیم دەبینی.

پاش کەمێک گەیشتمە سەر ڕێگایەکی بارێک. هێندەی نەبرد غەڵبەغەڵبێکی گەورەم کەوتە بەر گوێ. هەر لە دەنگی پێی ئەسپ دەچوو، وردەوردە لێم نزیکدەبوونەوە. بەپەلە ئاوڕێکم دایەوە و خۆم هەڵدایە قەراغ ڕێگاکە.

ئەو گیانەوەرە شەش قاچانەبوون کە لەوەوپێش بینیبوومن، بەڵام دوو سوارە لەسەر پشتی دووانیان بوو. لەدوای ئەوانیشەوە کورتەبنەیەکی تر ڕایدەکرد، دارێکی درێژی بەدەستەوەبوو و بایدەدا. هەر سێکیشیان هەمان جلی ڕەسمی شینی تۆخیان لەبەردابوو. سەرنجمدا هەر یەکەیان دوو ڕیز قۆپچە بە چاکەتەکەیانەوەبوو، یەکێکیان چوار و ئەوی تریان شەش و دانەکەی تریان هەشت قۆپچەی ڕەشی پێوەبوو.

لەو کاتەدا کە بەلامدا تێپەڕین، هاوارم لێکردن و گوتم؛

«بوەستن!»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



تەنها ئەو یەکەیان کە بەپێ دەڕۆیشت بەپەلە ئاوڕێکی لێدامەوە. ئەو دانەیانبوو کە هەشت قۆپچە بە چاکەتەکەیەوەبوو. بەتووڕەییەوە هاواریکرد؛

«پاش 52 ساڵ کوڕەزای خاوەنی کەشتیە تێکشکاوەکە دێتە ئاواییەکەوە»

پاش کەمێک کورتەبنەکان و گیانەوەرە شەش قاچەکان ونبوون. ئەوجا بینیم کە لەسەر پشتیان هێندەی هەمان ژمارەی قۆپچە دوو ریزیەکانی سەر چاکەتەکانیان، شێوەی سینەکیان لەسەرە.

بەدرێژایی قەراغ رێگاکە دارخورمای گەورە گەورە بەئاسماندا چووبوون، بۆڵە میوەیەکی زەردی چریان گرتبوو، هەر دانەیەکیشی هێندەی ئەندازەی پرتەقاڵێک دەبوو. لەژێر یەکێک لەو دارانەدا گالیسکەیەکی چوار تایەیی لێبوو، تا نیوەی پرکرابوو لە میوەی زەرد. کەمێک لەو گالیسکەیە دەچوو کە باوکم لە "لیوبیک" سەمونی پێدەگواستەوە. تەنها جیاوازیش ئەوەبوو کە ئەسپێکی ئاسایی پێوە نەبەسترابووەوە کە رایبکێشێت، بەڵکو گیانەوەرێکی شەش قاچی پێوەبوو.

ئەو کاتەی کە بەتەواوەتی لە گالیسکەکە نزیکبوومەوە، ئەوجا بۆمدەرکەوت کە کورتەبنەیەک لەژێر دارەکەدا دانیشتووە. پێشئەوەی ئەو چاوی پێمبکەوێت، فریاکەوتم سەیرێکی چاکەتەکەی بکەم و پێنج قۆپچەم لەیەک ریزدا بەرچاوکەوت. جگەلەوەش جلەکانی کتومت هەروەک جلوبەرگەکانی کورتەبنەکانی تربوو. لەسەرو ئەوەشەوە هەموو ئەو کورتەبنانەی هەتا ئەو کاتە بینیبوومن، سەرێکی خڕیان پێوەبوو و بەقژێکی پری قاوەیی داپۆشرابوو.

«پاشنیوەڕۆت باش پێنجی سینەک!»... پێم گوت.





هەروا بەشێوەیەکی ئاسایی تەماشایەکی کردم؛

«پاش نیوەڕۆت...»

لەناوەڕاستی قسەکانیدا وەستا، هەر بەدانیشتنەوە تێیدەڕوانیم و هیچی نەدەگوت. پاش ماوەیەک گوتی؛

«ئادەی پشتتم تێبکە»

منیش بە قسەمکرد و کاتێکیش ئاوڕم لێدایەوە، بینیم بە یەک دوو پەنجەی خڕپنی سەری دەخورێنێت. هەردوو دەستی بەملاولادا راوەشاند، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی؛

«چەنددەها گرفت!»

چرکەیەک دوای ئەوە دوو میوە لەسەر دار خوارماکەوە کەوتنە خوارەوە. یەکێکیان کەوتە کۆشی پێنجی سینەکەوە و ئەوی تریشیان رێک بەلای سەری مندا گیفەی هات.

کەمێک پاشئەوە حەوتی سینەک و نۆی سینەکم بینی کە بە دارەکەدا دەهاتنە خوارەوە. من بەلامەوە ئاساییبوو و لەدڵی خۆمدا گوتم کەواتە تا ئێستا هەر لەژمارە "دوو"وە هەتا ژمارە "دە"ی ئەو بوونەوەرانەم بینیوە.

حەوتی سینەک گوتی؛

«ویستمان یەک دوو میوەی "شووکا"ی پیابکێشین»

ئەوی تریشیان گوتی؛

«بەڵام رێک لەو کاتەدا کە تێمانگرت، کەمێک چووە ئەولاوە»

پاش ئەوە هەردووکیان لەژێر دارەکەدا لە تەنیشت پێنجی سینەکەوە دانیشتن.

پاشان گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«باشە، باشە... من لێتان دەبوورم، بەڵام ئێوەش دەبێت وەڵامی هەندێک پرسیاری هەر زۆر ئاسانم بدەنەوە. ئەگەر نا، ئەوا ملی هەر سێکتان بادەدەم. تێدەگەن؟»
لەترساندا لەژێر دارەکەدا دانیشتبوون و هیچیان نەدەگوت. یەکە یەکە تەماشای چاویانم کرد، هەر سێکیان چاوێکی قاوەیی تۆخیان پێوەبوو.
«باشە، با جارێ بزانم ئێوە کێن؟»
دوای ئەوە یەکە یەکە هەستانە سەرپێ و هەریەکەیان ڕستە شێتانەکانیان بەشێوەیەکی هونەری دەگوتەوە. پێنجی سینەک گوتی؛
«نانەواکە گەنجینەی دوورگە خەیاڵیەکە دەشارێتەوە»
ئەوجا ژمارە حەوت گوتی؛
«هەقیقەت لە کاغەزەکاندایە»
دواجار "نۆ"ی سینەک گوتی؛
«لە هەموو کۆمەڵەکەدا، تەنها یەک جۆکەری تەنیا دەتوانێت لە وەهمەکە تێبگات»
سەرم ڕاوەشاند و گوتم؛
«سوپاستان دەکەم کە ئەو زانیاریانەم دەدەنێ، بەڵام ئێوە کێن؟»
لەوە دەچوو ژمارە پێنجەکەیان هەڕەشەکەمی بە ڕاستی وەرگرتبێت، چونکە یەکسەر گوتی؛
«ئێمە سینەکین»
«بەڵێ لەوە تێگەیشتم. بەڵام ئێوە خەڵکی کوێن؟ هەروا لە ئاسمانەوە کەوتوونەتە خوارەوە؟ یان هەر وەک گوڵە سێپەرەکان لێرەدا لەسەر ئەم زەویە گەورەبوون؟»
بەپەلە تەماشایەکی یەکتریان کرد و نۆی سینەک گوتی؛



«ئێمە خەڵکی ئاواییەکەین»
«بەڵێ؟ بەڵام ئەی چەند کەسی ساویلکەی وەک ئێوە لەو لادێیەدا دەژی؟»
حەوتی سینەک گوتی؛
«هیچ کەسێکی تر... مەبەستم لەوەیە تەنها ئێمەی لێین. هیچ دوو کەسێک بەتەواوەتی لەیەک ناچن»
«ڕاستە، پێشم وانیە کەس لەو بڕوایەدا بێت. بەڵام بەهەرحاڵ چەند کەسی لادێیی تر لەسەر ئەم دوورگەیە دەژین؟»
بەپەلە سەیرێکی یەکتریان کرد و نۆی سینەک گوتی؛
«بابڕۆین!... بالێیدەین و...»
حەوتی سینەک پرسی؛
«باشە دەتوانین لێیبدەین؟»
«مەبەستم ئەوەیە با لێیدەین و بۆی دەرچین»
دوای ئەوە خۆیان هەڵدایە ناو گالیسکەکەوە. یەکێکیان زرمەی لەپشتی گیاندارە پێست سپیەکە هەڵساند و ئەویش بە هەموو هێز و توانایەکیەوە لەسەر هەر شەش قاچەکەی بۆی دەرچوو.
هەرگیز لەوەوپێش ئاوها خۆمم بێدەسەڵات نەبینیبوو. بێگومان دەمتوانی بیانوەستێنم و بەڕاستی ملیان بابدەم، بەڵام ئەو کاتەش بەهیچ جۆرێک هیچ زانیاریەکی نوێم دەستنەدەکەوت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



**دووی سینەک**

**...پاشان دوو بلیتی دەرهێنا و لەراندنیەوە...**

لە ژوورە بچکۆلەکەی ئوتێلەکەی "فێنیسیا"دا خەبەرمبووەوە، یەکسەر "هانس"ی نانەوام بیرکەوتەوە کە چاوی بە کورتەبنە سەیرەکانی سەر دوورگە خەیاڵیەکە کەوت. پانتۆڵەکەم لەخواروی جێگای خەوەکەمەوەبوو، بەهێواشی زەرەبینەکە و کتێبە بچکۆلەکەم لە گیرفانەکانیدا دەرهێنا. بەڵام لەو کاتەدا کە گڵۆپەکەم داگیرساند و دەستمکرد بە خوێندنەوە، باوکم نەرەیەکی لێبەرزبووەوە و چاویکردەوە. هەروەک چۆن یەکسەر پاڵدەکەوت و خەویلێدەکەوت، ئاوهاش دەستوبرد خەبەرییبووەوە. بەدەم باوێشکێکەوە گوتی؛

«یەک ڕۆژی دوورودرێژ لە فێنیسیادا دەبین»

چرکەیەک دوای ئەوە لەژوورەکەدا دەهات و دەچوو.

ناچاربووم بە دزیەوە کتێبە پچکۆلەکە لە ژێر لێفەکەمەوە بخەمەوە گیرفانی پانتۆڵەکەم. چونکە من پەیمانم بە نانەوا پیرەکەی "دۆرف"دابوو کە باسەکانی ناو کتێبە بچکۆلەکە نهێنیەکی نێوان من و ئەو بێت.

ڕێک لەو کاتەدا کە لە ژێر لێفەکەوە کتێبەکەم خستەوە ناو گیرفانی پانتۆڵەکەم و سەرم دەرهێنایەوە، باوکم لێی پیرسیم؛

«ئەوە چیە، چاوشارکێ دەکەیت؟»

منیش وەڵامم دایەوە و گوتم؛

«نا، دەمەوێت بزانم لێرەشدا سیسرکی لێیە»

«جا چ پێویستیەکت بە زەرەبین هەیە؟»

«ئاخر لەوانەیە بەچکەیان هەڵهێنابێت»





بێگومان وەڵامەکەم بێمانابوو، بەڵام دەستبەجێ وەڵامێکی باشترم پێنەبوو. دواتریش هەروا بۆ دڵنیایی گوتم؛

«ڕێشیتێدەچێت چەند سیسرکێکی کورتەبنە لەم ناوەدا هەبن»

«بەڵێ، لەوانەیە... کێ دەزانێت»... باوکم هێندەی گوت و خۆیکرد بە گەرماوەکەدا.

ئەو ئوتێلەی کە تێیدابووین هێندە خراپبوو تەنانەت نانی بەیانیشیان بە میوانەکانیان نەدەدا. بەڵام ئێمە بەلامانەوە ئاسایی بوو، چونکە ئێوارەی پێشووتر چێشتخانەیەکی خۆشمان دۆزیبووەوە کە بەیانیان لە نێوان سەعاتی هەشتەوە بۆ یانزە نانی بەیانیان هەبوو.

لەناو کەناڵەکە و گۆڕەپانی سەر کەناڵەکەش بەتەواوەتی ئارام و بێدەنگبوو. لە چێشتخانەکەشدا شەربەت و هێلکەی سوورەوکراو و مرەبای پرتەقاڵ و سەمونی گەرممان داواکرد. وەک یاسایەک دەڵێن دەبێت نانی بەیانی لەماڵەوە بخورێت، بەڵام لە هەموو سەفەرەکەماندا ئەو نانخواردنە بەدەربوو لەو یاسایە.

لە گەرمەی نانخواردنابووین کە باوکم بیرۆکەیەکی بۆ هات. بەرلەوە هەر دانیشتبوو و چاوی نەدەتروکاند، منیش یەکسەر وامزانی کورتەبنەکەی بینیوە. ئەوجا باوکم گوتی؛

«تۆ لێرەدا دانیشە هانس تۆماس، پێنج دەقەیەکی تر دەگەڕێمەوە»

نەمزانی باوکم دوای چی کەوت، بەڵام لەوەوپێش بەو شێوەیە بینیبووم. کە باوکم بیرۆکەیەکی بۆ دەهات، تاڕادەیەک هیچ شتێک نەیدەوەستاند.

لەوبەری گۆڕەپانەکەوە خۆی کرد بەناو دەرگایەکی شوشەی گەورەدا و لەبەرچاوم ونبوو. کە گەڕایەوە هیچی نەگوت، لەپێشدا پاشماوەی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



هێلکەورۆنەکەی خوارد، پاشان ئاماژەی بۆ ئەو دووکانەکرد کە چووە ناویەوە و گوتی؛

«چی لەسەر ئەو دووکانە نووسراوە هانس تۆماس؟»

بەهەڵاوگێڕاوی خوێندمەوە و گوتم؛

«یارتاپ انۆکنەء»

«بەڵێ، ئەنکۆنا پاترای»

پارچەیەک سەمونی لە قاوەکەی هەڵکێشا و خستیە دەمیەوە.

بەهەزارحاڵ خنی بەدەمیا، ئەو دیمەنە بەڕاستی مایەی پێکەنین بوو.

پاش نەختێک لێمپرسی؛

«ئینجا چیە؟»

بەلای منەوە چ لەم سەرەوە وشەکانم بخوێنایەتەوە یان لەو سەرەوە هیچ جیاوازیەکی نەبوو، لە هەردوو بارەکەدا وشەکان وەک یەک یۆنانی بوون بۆم.

تەماشایەکی ناو چاویکردم گوتی؛

«هانس تۆماس تۆ هەرگیز لەناو دەریادا لەگەڵمدا نەبوویت.

هەرگیزیش خۆت بەپاپۆڕ بەناو دەریادا نەڕۆیشتوویت»

پاشان دوو بلیتی دەرهێنا و لەراندنیەوە و بەردەوامی بە قسەکانی دا؛

«دەریاوانێکی بەتەمەنی وەک من ڕێگە بەخۆی نادات بەدرێژایی دەریای "ئەدریاتیک" ماشێن لێبخورێت. ئیتر سەر وشکانی بەسە و کاتی ناو دەریا هاتووە. فیاتەکەمان دەخەینە ناو پاپۆڕێکەوە و بەرەو شاری "پاتراس" بەدەریادا دەڕۆین. لەوێشەوە تەنها چەند کیلۆمەترێکی دەمێنێت بۆ ئەسینا»

«بەڕاست؟»



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«بەڕاستی بەڕاستی... نەفرەتت لێبێت شەیتان!»

دیاربوو پاش ماوەیەکی کەم دەچێتەوە ناو دەریا، بۆیە هەروا بە چەپ و ڕاستدا کەوتەوە جنێودان.

بەو شێوەیەش "ڕۆژێکی دوروودرێژمان لە فێنیسیادا بەسەرنەبرد"، چونکە پاپۆڕەکە ئەو ئێوارەیە لە شاری "ئانکۆنا"وە بەرەو یۆنان دەکەوتە ڕێ، لە فێنیسیاشەوە هەتا ئانکۆنا نزیکەی 300 کیلۆمەترێکمان مابوو.

بەرلەوەی بکەوینەوە ڕێ، باوکم دەیویست لە نزیکەوە هونەری بەناوبانگی شوشەسازی خەڵکی فێنیسیا ببینێت.

شوشە تواندنەوە پێویستی بە ئاگرکردنەوەیە. هەرلەبەر ترسی ئاگرکەوتنەوەش، خەڵکی فێنیسیا بەرهەمهێنانی شوشەیان گواستۆتەوە بۆ هەندێک لە دوورگە بچکۆلەکانی دەرەوەی فێنیسیا. خەڵکی ئەوێ هەر لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستەوە گواستوویانەتەوە بۆ ئەو دوورگانەی کە ئەمڕۆکە پێیان دەڵێن "موورانۆ". باوکم سووربوو لەسەرئەوەی جانتاکانمان لە ئوتێلەکەوە بهێنینەوە و بیانخەینە ناو ماشێنەکەوە.

یەکەم شوێن لە "موورانۆ"دا چووینە مۆزەخانەیەکەوە، لەوێدا چەندەها شوشەی جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگی لێبوو، تەمەنی هەندێکیان چەند سەد ساڵێک دەبوو. دواتریش سەردانی شوێنێکمان کرد کە شوشەیان تێدا بەرهەمدەهێنا. لەوێدا لەبەرچاوی گەشتیارەکاندا فوویان بەشوشە تواوەکاندا دەکرد و سوراحی و دەفری گەورە و قوڵی شوشەیان دروستدەکرد. پاش ئەوەش بەرهەمەکانیان بۆ فرۆشتن دادەنا، بەڵام باوکم پێیوابوو لایەنی کرین و فرۆشتنەوەی بۆ ئەمریکیە دەوڵەمەندەکان بەجێبهێڵین.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





له دوورگەی بەرهەمهێنانی شوشەوە بەلەمێکی "تەکسی"مان گرت و بەرەو گەراجی ماشێنەکەمان ڕۆیشتین. کاتژمێری یەکی پاشنیوەڕۆ لەناو ماشێنەکەدابووین و بەرەو شاری "ئانکۆنا" کەوتینە ڕێ، ئەو شارە نزیکەی 300 کیلۆمەترێک لە خواروی فێنیسیاوە بوو.

ڕێگاکە بەردەوام بە قەراغ دەریای "ئەدریانتیک"دا دەڕۆیشت. دیمەنی دەریاکەش هێندەی تر دڵی باوکمی خۆشکردبوو و کەوتبووە فیکەفیک بۆی.

کەمێک دواتر بەسەر زنجیرە بەرزاییەکدا ڕۆیشتین، لەوێوە زۆر بە جوانی دەریامان دەبینی. باوکم ماشێنەکەی ڕاگرت و باسی ئەو بەلەمی چارۆکەدار و پاپۆڕی شتومەکانەی بۆ کردم کە لە مەودای بینینی چاوی خۆماندابوون.

دواتریش لەناو ماشێنەکەدا باسێکی تێروتەسەلی ڕابووردوی شاری "ئارەنداڵ"ی قەراغ دەریای بۆکردم کە من لەوەوپێش نەمبیستبوو. جگە لەوەش ناوی چەندەها پاپۆڕی گەورەی چارۆکەدار و ساڵەکانیشی پێگوتم. بەو شێوەیەش جیاوازی نێوان کەشتیە چارۆکەدارە جیاوازەکان شارەزابووم. باسی سەرەتای کەشتیەکانی ئارەنداڵی بۆکردم کە هاتوچۆی ئەمریکا و کەنداوی مەکسیکیان کردووە. هەروەها گوتی یەکەمین "کەشتی هەڵمی" کە هاتۆتە نەرویجەوە، ڕووی لە شاری ئارەنداڵ کردووە. کەشتیەکی چارۆکەدار بووە و ناوی "ساڤانا" بووە، مەکینەی هەڵمی و پەرەکەی پێوەبووە.

کەرەتێکیان باوکم لەسەر کەشتیەکی ماتۆڕیی شتومەک گواستنەوەبووە کە کێشی تەنییەکەی 8000 بووە[18] کەشتیەکە لە

[18]یەک کێشی تەنیی یەکسانە بە 2،832 مەتر سێجا و.



هامبۆرگ دروستکراوە و سەربە کۆمپانیای کەشتیرانی "بێرگین" بووە. چل کەس ئەو کەشتیەیان بەڕێوەبردووە.

پاشان باوکم گوتی؛

«کەشتی شتومەک گواستنەوەی ئەمڕۆکە هەر زۆر گەورەترێکن هانس تۆماس، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی دەیبەن بەڕێوە کەمترێکن، لە ڕاستیدا لەنێوان هەشت بۆ دە کەسێک دەبن. ئێستاکە هەموو شتێکی پاپۆڕ مەکینە و تەکنیک دەیبات بەڕێوە. بەو شێوەیەش ژیانی ناو دەریا بووە بەشتێکی کۆن و وەک جاران باوی نەماوە. مەبەستم لە ژیانی ناو دەریایە هانس تۆماس. لەسەدەی داهاتووشدا[19] چەند بێ مێشکێک لە وشکانیەوە دادەنیشن و لە دوورەوە هەموو شتێک دەبەن بەڕێوە»

ئەگەر باش لە قسەکانی تێگەیشتبم، مەبەستی لەوەبوو کە ژیانی ناو دەریا هێدی هێدی لەو کاتەوە کۆتایی پێهاتووە کە سەردەمی کەشتیە چارۆکەدارەکان تەواوبووە، هەڵبەتە ئەوەش سەدوپەنجا ساڵێک لەمەوبەر ڕوویداوە.

لەو کاتەدا کە باوکم باسی ژیانی ناو دەریای بۆدەکردم، دەستەیەک یاری کاغەزم دەرهێنا. لە دووی سینەکەوە هەتا دەی سینەکەم جوداکردەوە و لەسەر کوشنەکەی دواوە لەتەنیشت یەکەوە دامنان.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بۆچی هەموو کورتەبنەکانی دوورگە خەیاڵیەکە نیشانەی سینەکیان بە پشتەوەیە؟"، "ئەوانە کێن و خەڵکی کوێن؟"، "بڵێیت "هانس"ی نانەوا کەسێک ببینێت و بتوانێت بە

[19]هەڵبەتە مەبەستی لەم سەدەیەی ئێستاکەمانە، چونکە ئەم ڕۆمانە لە ساڵی 1990دا نووسراوە و.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

ڕێکوپێکی باسی ئەو شوێنەی بۆ بکات کە تێیکەوتووە؟"، ئەم پرسیارانە و چەندەها و چەندەها پرسیاری بێوەڵامی تریش بەردەوام بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون.

جگە لەوەش دووی سینک شتێکی گوت کە لەیادناکرێت، ئەو گوتی؛ "ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات". بڵێیت مەبەستی لە ماسیە پرتەقاڵیەکەی نانەواکەی دۆرف بێت؟ ئەی سەمونەکە؟ بڵێیت هەمان ئەو سەمونەبێت کە نانەواکە لە شاری دۆرفدا دایمێ؟

دەبێت وابێت، چونکە پێنجی سینەکیش گوتی "نانەواکە گەنجینەی دوورگە خەیاڵیەکەی شاردۆتەوە". بەڵام چۆن ڕێی تێدەچێت ئەو کورتەبنانەی کە "هانس"ی نانەوا لە ناوەڕاستی سەدەی پێشوودا چاوی پێکەوتوون، ئەو هەموو شتانە بزانن؟

بۆ ماوەی چەندەها کیلۆمەتر باوکم ماشێنی لێدەخوڕی و بەفیکە گۆرانی "شانتی" دەگوت[20]، ئەو گۆرانیەی کە کاتی خۆی وەک دەریاوانێک فێریبووبوو. منیش بەدزیەوە کتێبە بچکۆلەکەم دەرهێنایەوە و کەوتمەوە خوێندنەوەی.

[20]گۆرانیەکە کە لەسەر ڕوتمێکی تایبەتی دەڕوات و کارمەندەکانی سەر کەشتی دەیلێنەوە، بۆ ئەوەی کارەکانیان باشتر جێبەجێبکەن.و



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

سێی سینەک

...هەر لە گوڵی سێپەڕ دەچن...

بەهەمان ئەو ڕێگایەدا ڕۆیشتم کە سێ لادێییەکە بە گالیسکەکەیانەوە گرتیانە بەر. جێ شوێنی تایەکان بەرەو ناو چەند دارێکی بەرز دەڕۆیشت.گەڵای دارەکانیش لەبەر تیشکی خۆری ئەو پاشنیوەڕۆیەدا دەدرەوشانەوە.

لە پانتاییەکی ناو دارستانەکەدا، کوخێکی دارینی گەورەم هاتە بەرچاو. دووکەڵێکی ڕەش لە دوو دووکەڵکێشی سەر خانوەکەوە دەهاتنە دەرەوە. هەر لەو دوورەوە کەسێکی جلوبەرگ سوورم بینی کە خۆیکرد بە ژووردا.

پاش کەمێک بۆمدەرکەوت کە کوخەکە بەتەواوەتی لایەکی دیوارەکەی پێوە نیە. لەوێشەوە شتێکی هێندە سەرسوڕهێنەرم بینی، کە ناچاربووم دەست بە دارێکەوە بگرم بۆ ئەوەی نەکەوم؛ ناو کوخەکە هیچ دیوارێکی تێدا نەبوو، بەڵام لەسەر عەردەکەی شتێکم بینی هەر لە کارگە دەچوو. هێندەی پێنەچوو کە بۆم دەرکەوت کارگەی شوشەسازیە.

چەند کۆڵەکەیەکی ئەستور ئەستور سەقفەکەیان ڕاگرتبوو. لە سێ چوار شوێندا ئاگرکرابۆوە و تەشتی گەورە گەورەی بەردینی سپیان بەسەرەوەبوو. لەناو تەشتەکانیشدا شلەیەکی سوورباو وردە دەکوڵا و هەڵمێکی خەستیان لێوە بەرزدەبووەوە. لە نێوان تەشتەکانیشدا سێ ئافرەتی جل سوور دەهاتن و دەچوون، باڵایان هێندەی باڵای لادێییەکانی تر دەبوو. چەند بۆریەکی درێژیان دەخستە ناو شوشە تواوەکەی ناو تەشتەکانەوە و فوویان پێدا دەکردن، بەو



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



شێوەیەش چەندەها شێوەی جیاواز جیاوازی شوشەیان دروستدەکرد. لەسەرێکی ژوورەکەوە تەپۆڵکەیەکی گەورەی لم دانرابوو، وە لە سەرەکەی تریشەوە، درێژایی دیوارەکە بەرەفە داپۆشرابوو و پڕبوو لە شوشەی دروستکراو. لەناوەڕاستی ژوورەکەشدا کۆمەڵێک شوشەی شکاو و بتڵی شکاو و پارچە دەفری شکاو هەڵدرابووەوە.
دیسانەوە لە دڵی خۆمدا گوتمەوە "ئەمە چ وڵاتێکە کە تێیکەوتووم؟". جگە لە جلوبەرگە سەیرەکانیان، هەر رێک دەتگوت لە لادێیەکی چاخە بەردینەکاندا دەژین. بێگومان هێندەشم بۆ دەرکەوت کە لادێکە وەستان لە بەرهەمهێنانی شوشەدا.
ئەو ئافرەتانەی خەریکی شوشەکانبوون، جلێکی سووری کاڵیان پۆشیبوو. ڕەنگی پێستیان سپی و هەر سێکیشیان قژێکی درێژ و ڕەقی ڕەنگ زیویان هێنابووە خوارەوە.
هێندەی نەبرد و سەرنجمدا لەسەر سنگی هەموو کراسەکانیان نیشانەی "دینار"ی بەسەرەوەیە، ئەو دیمەنە دایچڵەکاندم. کتومت لەو نیشانەی "دینار"انە دەچوون کە لەسەر کاغەزی یاری هەیە. یەکێکیان سێ دیناری پێوەبوو، یەکێکی تریشیان حەوت و دواهەمینیشیان نۆ نیشانەی دینار بەسەر سنگیەوە بوو. ڕەنگەکانیشی وەکو ڕەنگی سینەکەکان نەبوو، بەڵکو هەموو دینارەکان ڕەنگی زیوینیان هەبوو.
هەرچەندە من لەتەنیشت لا کراوەکەدا وەستابووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ ئافرەتەکە لەبەر سەرقاڵی فووتێکردنی شوشەکانیان منیان نەدەدی. لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری ژوورەکە دەرۆیشتن و دەستیان هێندە بەئاسانی و سووک بەئاسماندا بە بادەدا، هەر دەتگوت هیچ کێشێکیان نیە. بێگومان بینینیان سەری سوڕماندم، بەڵام





ئەگەر یەکێکیان لەناکاودا بەرەو ئاسمانی ژوورەکە بەرزبوایەتەوە، ئەوا هێشتام بەلامەوە ئاسایی بوو.
لە پڕێکدا یەکێکیان چاوی پێم کەوت، ئەو یەکەیان بوو کە حەوت نیشانەی دینار لەسەر کراسەکەی بوو. خەریکبوو بۆی دەربچم، بەڵام لەو کاتەدا ئەو سەری لێشێوا و شوشەکەی دەستی بەربووەوە سەر زەویەکە. لەگەڵ شکانیشدا هەموو ئەوانی دی تەماشایانکردم و ئیدی نەمتوانی لەدەستیان هەڵبێم.
چوومە ژوورەوە و سەرم بۆ دانەواندن، ئەوجا بە زمانی ئەڵمانی سەلامم لێکردن. بەڵام ئەوان تەماشایەکی یەکتریانکرد و دەستیانکرد بە پێکەنین، ددانە سپیەکانیان لەبەر ڕۆشنایی ئاگرەکاندا دەدرەوشایەوە. بەرەو ڕوویان ڕۆیشتم و ئەوانیش دەورەیان دام و پێم گوتن؛
«ئومێدەوارم ئاسایی بێت بەلاتانەوە کە سەردانێکی بچکۆلەتان بکەم»
دیسانەوە سەیری یەکتریان کردەوە و ئەم جارەیان لە جاری پێشووتر زیاتر پێکەنین. هەر سێکیان ڕەنگی چاویان شینێکی تۆخبوو. زۆر چوون یەکبوون، هەر لە ئەندامی هەمان خێزان دەچوون. لەدڵی خۆمدا گوتم "لەوانەیە خوشک بن".
«ئێوە لە قسەکانم تێدەگەن؟»
سێی دینار وەڵامی دامەوە و بەدەنگێکی بووکەشوشە ئاسا گوتی؛
«ئێمە هەموو وشەیەکی ئاسایی تێدەگەین!»
پاشان هەموویان بەیەکەوە کەوتنە قسەکردن. دووانیان لەسەر ئەژنۆ دانەوانەوە و سەلامیان لێکردم. "نۆ"ی دیناریش هاتە لامەوە و دەستی گرتم. سەیربوو بەلامەوە کە دەستە لاواز و ناسکەکەی هێندە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





ساردبێت، بەتایبەتیش لەو شوێنی شوشە دروستکردنەدا ئەو هەموو ئاگرە کرابۆوە.

پاش نەختێک گوتم؛

«چەندە کارامانە فووی پێدا دەکەن»

بەڵام لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانمدا دایانە قاقای پێکەنین.

خۆم بە خۆمم گوت لەوانەیە ئەم ئافرەتانە هێمنترین لە ساویلکەکانی پێشووتر کە هەر لەخۆیانەوە هەڵدەچوون، بەڵام نزیکبونەوە لەمانیش هەروەک ئەوانی دی سەختبوو بەلامەوە. من لەلای خۆمەوە پێموابوو کە هەر لە خۆیانەوە فێری ئەو هونەرە نەبووبن، لەبەرئەوە پاش نەختێک درێژەم بە قسەکانمدا و گوتم؛

«ئەی باشە کێ فێری هونەری بەرهەمهێنانی شوشەی کردون؟»

ئەو جارەشیان وەڵامیان نەدامەوە، بەڵام حەوتی دینار چوو دەفرێکی قوڵی شوشەی هێنا، دایمێ و گوتی؛

«فەرموو!»

سەرلەنوێ کچەکان دەستیان کردەوە بە پێکەنین.

ئاسان نەبوو بۆم لەنێو ئەو جەوە پڕ لە خۆشەویستیدا بیر لە بەرژەوەندی خۆم بکەمەوە، بەڵام هاوکات پێموابوو گەر لە ڕاستی ئەو کورتەبنە سەیرانە تێنەگەم ئەوا مێشکم لەدەستدەدەم. دیسانەوە هەوڵی خۆمم دایەوە و گوتم؛

«من هێندە نابێت هاتوومەتە ناو ئەم دوورگەیەوە و بەڕاستی نازانم لە چ شوێنێکی جیهاندام. دەتوانن ئێوە شتێکم دەربارەی ئەم شوێنە پێبڵێن؟»

حەوتی دینار گوتی؛

«ئێمە ناتوانین قسەبکەین»



«بۆ هیچ کەسێک هەیە قسەکردنی لێ قەدەغەکردبن؟»

هەر سێکیان سەریان ڕاوەشاند و قژە ڕەنگ زیوەیەکەیان لەبەر ڕۆشنایی ئاگری کورەکاندا دەدرەوشایەوە. پاشان نۆی دینار گوتی؛

«ڕاستە ئێمە لە دروستکردنی شوشەدا بەتواناین، بەڵام لە بیرکردنەوەدا هێندە زیرەک نین، لەبەرئەوە ناشتوانین هێندە قسەبکەین»

«هەر لە گوڵی سێپەڕ دەچن»

دیسانەوە هەر سێ کچەکە دایانەوە قاقای پێکەنین و ئەوجا حەوتی دینار گوتی؛

«ئێمە سینەک نین»

پاشان کراسەکەی ڕاتەکاند و گوتی؛

«نابینیت ئێمە "دینار"ین؟»

منیش هاوارمکرد و گوتم؛

«بێ مێشکن!»

هەر سێکیان داچڵەکین و سێی دینار گوتی؛

«تکایە توڕە مەبە، چونکە ئێمە زۆر بە ئاسانی دڵتەنگ و نیگەران دەبین»

دڵنیا نەبووم لە ڕاست و دروستی قسەکانی. زۆر بە دڵنیاییەوە پێدەکەنی و پێم وابوو لابردنی ئەو پێکەنینە لە توڕەبوونێکی ئاسایی زیاتری پێویست بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قسەکانیم بە ڕاست وەرگرت و گوتم؛

«بەڕاستی مێشکتان هەروەک ئەوەی خۆتان دەیڵێن بەتاڵە؟»

زۆر بە ڕێزەوە سەریان بۆ لەقاندم. پاشان نۆی دینار گوتی؛

«زۆر حەزم دەکرد ...»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





لەوێدا بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بڵێت، دەستی بەدەمیەوە گرت. منیش زۆر میهرەبانانە لێم پرسی؛

«حەزت لە چی دەکرد؟»

«حەزم دەکرد بیر لە شتێک بکەمەوە کە هێندە سەخت بێت کە نەمتوانیبایە بیرم لێ بکردایەتەوە، بەڵام ناتوانم»

هەروا وەستابووم و بیرم لە قسەکەی دەکردەوە... دواتر گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە گەیشتن بەو هونەرە بەلای ئێمەشەوە هەر سەختە.

لە ناکاودا یەکێکیان گریا، سێی دیناربوو و بەدەم هەنسکەوە دەیگوت؛

«زۆر پێم خۆشە...»

نۆی دینار دەستێکی کردە ملی و سێی دینار بەردەوامی بە قسەکانی دا و گوتی؛

«زۆر پێم خۆشە خەبەرم ببێتەوە... بەڵام لەڕاستیدا خۆ بەخەبەرم»

بەو شێوەیەش ڕێک ئەو شتەی گوت کە من دەمویست بیڵێم.

حەوتی دیناریش هەر وەستابوو و لە دوورەوە تەماشای دەکردم، دواتر زۆر بە مەبەستەوە گوتی؛

«لە ڕاستیدا کوڕی شوشەچیەکە فێڵی لە فەنتاسیەکانی خۆی کردووە»

پاش کەمێک هەر سێکیان لەسەر زەویەکە پاڵکەوتن و کەوتنە مشەمشکردن. یەکێکیان دەفرێکی شوشەی بەدەستیەوە گرت و هەر زۆر بە ئانقەست کێشای بە عەرزەکەدا و وردوخاشیکرد. یەکێکی تریشیان قژە زیوینیەکەی بەملاولادا بادەدا. منیش هەستم کرد کاتی ئەوە هاتبێت جێیان بهێڵم و لەبەرئەوە گوتم؛

«بمبوورن نارەحەتم کردن... خوا حافیز!»



لەوێوە ئیدی دڵنیابووم کەوتومەتە ناو پەناگایەکەوە کە تایبەتە بە کۆمەڵێک مرۆڤی نەخۆشی ئەقڵی. جگە لەوەش دڵنیابووم لەناکاودا چەند سستەرێکی جل سپیم لێپەیدا دەبن و پێم دەڵێن تۆ بە دوورگەکەدا دەخولێیتەوە و ترس و نائارامی بەناو نەخۆشەکاندا بڵاودەکەیتەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند شتێک هەبوون کە من لێیان تێنەدەگەیشتم. یەکەمین شت باڵای دانیشتوانی دوورگەکەم بۆ پرسیاربوو. من وەک دەریاوانێک سەفەرم بۆ چەندەها وڵات کردبوو، وە دەشمزانی هیچ وڵاتێکی جیهان نیە کە خەڵکەکەی هێندە بچکۆلەبن. بەدەر لەوەش ڕەنگی پێستی لادێییەکان و ئافرەتە شوشەچیەکان بەتەواوەتی جودابوو. واتە ڕێی تێنەدەچوو کە خزمی نزیکی یەکتربن. لەبەرخۆمەوە دەمگوت بڵێیت ڕۆژێک لە ڕۆژان نەخۆشیەکی ساری سەرانسەری جیهانی گرتبێتەوە و مرۆڤی بچوکتر و بێ ئەقڵتر کردبێتەوە؟ دواتریش نەخۆشەکانیان جوداکردبێتەوە و بۆ ئەوەی کەسی تر تووشنەکەن، هێنابێتیانن بۆ سەر ئەم دوورگەیە. ئەگەر بەڕاستی وابووبێت، کەواتە خۆشم پاش ماوەیەکی تر هەروەک ئەوان بچکۆلە و بێئەقڵ دەبم.

دووهەمین شت کە لێی تێنەدەگەیشتم ئەوەبوو کە وەک یاری کاغەز بەسەر دینار و سینەکدا دابەشکرابوون. بڵێیت بەو شێوەیە سستەرەکان جۆرە ڕێکخستنێکیان خستبێتە نێو نەخۆشەکانەوە؟

بەردەوام بەدوای جێشوێنی گالیسکەکەدا دەڕۆیشتم، ڕێگاکەم لەپڕێکدا بەژێر کۆمەڵێک داری چڕی بەرزدا تێدەپەڕی. قەوزەیەکی سەوزی کاڵ وەک فەرشێک سەر زەوی ئەو ناو دارستانەی داپۆشیبوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



لە هەموو شوێنێکەوە گوڵ بەرزبووبووەوە، هەر لە گوڵی جاترە کێویلە[21] دەچوون. تیشکی خۆر تەنها لەسەری سەرەوەی گەڵا بەرزەکانی درەختەکانەوە دەهاتە ناوەوە. لقەکانیش هەروەک چادرێکی ئاڵتونی دەستیان بەسەر ئەو ناوەدا گرتبوو.

پاش ماوەیک لەنێوان قەدی درەختەکانەوە کەسێکم بینی کە جلێکی کاڵی لەبەردابوو. ئافرەتێکی لاوازبوو و قژێکی درێژی کاڵی بەردابووەوە. کراسێکی درێژی زەردی لەبەردابوو و باڵاشی هێندەی باڵای کورتەبنەکانی تری دوورگەکە بوو. جارجارێک دادەنەویەوە و هەندێک گوڵی شینی لێدەکردەوە. لەوێدا سەرنجمدا کە بەرەنگی سوورێکی تۆخ، شێوەی "کوپ"ێکی گەورە بەسەر پشتیەوە بوو.

پاش نەختێک لێی نزیکبوومەوە و گوێملێبوو لەبەر خۆیەوە بە دەنگێکی هێواش ئاوازێکی دڵتەنگی دەگوت. یەک دوو مەترم مابوو پێی بگەم و بە نەرمی پێمگوت؛

«ئەم کاتەت باش»

«ئەم کاتەت باش»... هێندەی گوت و هەستایەوە سەر پێ. زۆر بەدڵنیاییەوە وەڵامی دامەوە، هەر دەتگوت لەوەوپێش یەکترمان بینیووە.

منیش زۆرم بەلاوە جوانبوو و لەڕاستیدا نەمدەزانی سەیری کوێی بکەم. پاشان زۆرم لە خۆمکرد و پێمگوت؛

«گۆرانیەکی زۆر دڵفرێن دەچری»

---

[21] گوڵی "مەرزە"، یان "گوێ مشکە"، یان پێشی دەگوترێت "فەرامۆشم نەکەیت"؛ ڕووەکێکی بچوکە و گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی شین یا سپی یان پەمەییە و نیشانەی دۆستایەتیە.





«سوپاس...»

دەستێکم بە قژمدا هێنا. لەو کاتەوەی هاتبوومە سەر دوورگەکە، ئەوە یەکەمین جاربوو کە بیرم لە شێوەی ڕوخساری خۆم کردەوە. حەفتەیەک زیاتربوو ڕیشم نەتاشیبوو. پاش نەختێک لەناکاودا گوتی؛

«وا بزانم ونبووم»

سەرە بچکۆلەکەی وەرچەرخاند، وەک کەسێکی سەرلێشێواو دەهاتەبەرچاوم و لێم پرسی؛

«تۆ ناوت چیە؟»

نەختێک وەستا و زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوەکانی، هەر دەتگوت نهێنیەکی حەشارداوە؛

«نابینیت من بللی "کوپ"م؟»

«بەڵێ»... بۆ ماوەیکی باش وەستام پاشان بەردەوامیم بە قسەکانم دا؛

«کەمێک بەلامەوە سەیرە»

«بۆچی؟»

دانەویەوە و گوڵێکی تری لێکردەوە؛

«بەڕاست، ئەی تۆ خۆت کێیت؟»

«من ناوم "هانس"ە»

ئەوجا هەر بیریدەکردەوە و دواتر گوتی؛

«کام ناوەیانت بەلاوە سەیرترە، بللی کوپ یان هانس؟»

ئەوجا من نەمدەزانی چی بڵێم.

پاشان سەرلەنوێ گوتیەوە؛

«هانس؟ وابزانم کەرەتێک لەوەوپێش ئەو ناوەم گوێ لێبووە. نازانم... یان بەهەڵەدا چووم و پێم وایە بیستبێتم... زۆر زۆر لە مێژە...»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

دانەویەوە و گوڵێکی شینی تریشی لێکردەوە. لەپڕێکدا هەردەتگوت فێی لێهاتووە، لێوەکانی لەرزی و گوتی؛

«قتووەکەی ناوەوە قتووەکەی دەرەوە دەکاتەوە، وە لە هەمان کاتیشدا قتووەکەی دەرەوە قتووەکەی ناوەوە دەکاتەوە»

لەوە دەچوو کە کەسێکی تر ئەو ڕستە بێمانایە بڵێت، نەک کچەکە. هەستمدەکرد وشەکان هەروا لەدەمیەوە دەهاتنە دەرەوە وە بەبێ ئەوەی خۆی بزانێت کە چی دەڵێت. بەڵام هەر ڕێک پاش ئەوەی ڕستەکەی تەواوکرد وەکو خۆی لێهاتەوە، ئاماژەی بۆ جلە دەریایەکانم کرد و بەدەنگێکی پڕ لە ترسەوە گوتی؛

«هیچ بە جلەکانتەوە نیە!»

«مەبەستت لەوەیە کە هیچ نیشانەیەکم بە پشتەوە نیە؟»

سەرێکی بۆ لەقاندم و لەناکاودا سەری بەملاولادا ڕاوەشاند؛

«پێم وایە دەزانیت کە بۆت نیە لێمبدەیت؟»

منیش گوتم؛

«هەرگیز ڕێگە بەخۆم نادەم کە لە ئافرەتێک بدەم»

«قسەی قۆڕ! خۆ من ئافرەت نیم!»

هەردوو لا کوڵمەکانی دوو چاڵی تێدا دەرکەوت. هەر لە پەرییەکی ئاسمان دەچوو[22]. لەگەڵ پێکەنینەکەیدا هەردوو چاوی وەک زەمرووتێکی سەوز دەدرەوشایەوە. لەبەر جوانی نەمدەتوانی چاومی لەسەر لابەرم.

---

[22]لێرەدا مەبەست لە پەریەکی تایبەتیە کە لە ئەفسانەکانی باکوردا ناوی بە "ئالف" هاتووە و باس لە بوونەوەرێکی پچکۆلەی مرۆڤدۆست و جوان دەکات و زۆر جاریش بەباڵەوە وێنا دەکرێت.و







بەڵام لە ناکاودا نیگایەکی پڕ لە نیگەرانی هاتە سەر سیمای و گوتی؛

«خۆ تۆ کاغەزە تایبەتیەکە نیت کە هەمیشە دەیباتەوە؟»

«نا، نا، من تەنها دەریاوانێکم و هیچی تر»

پاش ئەوە خۆی کرد بە ناو لقی درەختەکاندا و ونبوو. منیش دوای کەوتم، بەڵام هەر دەتگوت زەوی قووتیداوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

## چواری سینەک

**...ژیان یانسیبێکی گەورەیە و تەنها ژمارەی براوەکانی تێدا دیارە...**

کتێبە پچکۆلەکەم دانا و چاوم بریە دەریای ئەدریانتیک.
ئەو بەشەی دواهەمینی کتێبە بچکۆلەکە، چەندەها پرسیاری لە مێشکمدا وروژاند. نەمدەزانی لە کام دانەیانەوە دەستپێبکەم.
هەتا زیاترم دەربارەی کورتەبنەکانی سەر دوورگە خەیاڵیەکە دەخوێندەوە، نهێنی بوونیان بەلامەوە زیاتر و زۆرتردەبوو. هەتا ئێستاکە "هانس"ی نانەوا کورتەبنەی سینەک و کورتەبنەی دیناری بینیبوو. پاشانیش بللی کوپی بینی، بەڵام ئەو لە ناکاودا دیارنەما و لەبەرچاوی ونبوو.
لەدڵی خۆمدا دەمگوت "ئەو کورتەبنانە کێن؟"، "بە چ شێوەیەک هاتوونەتە بوون و خەڵکی چ شوێنێکن؟"
دڵنیابووم کە دواتر لە کتێبە بچکۆلەکەدا وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دەستدەکەوێت. بەڵام بەدەر لەوانەش بیرم بۆ شتێکی تریش دەچوو؛ کورتەبنە دینارەکان لە کوخێکدابوون کە شوشەیان تێدا بەرهەمدەهێنا. من ئەوەم زۆر بەلاوە سەیربوو، چونکە هێندە نەبوو کە خۆم سەردانی شوێنێکم کردبوو کە شوشەیان تێدا دروستدەکرد.
گومانم لەوە نەبوو کە بەشێوەیەک لەشێوەکان پەیوەندیەک لەنێوان سەفەرەکەم بە ئەوروپادا و نووسراوی ناو کتێبە بچکۆلەکەدا هەیە. بەڵام هەموو ئەو شتانەی لە کتێبەکەدا بوون لە راستیدا بەسەرهاتێکبوو کە "هانس"ی نانەوا چەندین ساڵ لەوەبەر بۆ ئەلبێرتی دەگێرایەوە. خۆم بەخۆمم دەگوت بڵێیت بەشێوەیەکی پەنهان پەیوەندیەک لە نێوان ژیانی ئێستای من و ئەو نهێنیە



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

گەورەیادا نەبێت کە کاتی خۆی لە نێوان "هانس"ی نانەوا و ئەلبێرت و لودفیدا هەبووە؟
ئەی ئەو نانەوا پیرە کێ بوو کە لە شاری دۆرفدا بینیم؟ جگەلەوەش، ئەو کورتەبنەیە کێبوو کە زەرەبینەکەی دامێ و زوو زووش لە رێگەی سەفەرەکەماندا لێرە و لەوێدا دەردەکەوت؟ بەتەواوەتی هەستمدەکرد کە پەیوەندیەک لە نێوان کورتەبنەکە و نانەواکەدا هەیە، هەرچەندە لەوانەیە خۆیان پەییان بە پەیوەندیەکی ئاوها نەبردبێت.
نەمدەتوانی باسی کتێبەکە لەلای باوکم بدرکێنم -بەلایەنی کەمەوە هەتاوەکو کتێبەکەم تەواو نەکرادیە نەمدەتوانی هیچ شتێکی لەو بارەیەوە بۆ باسبکەم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستمدەکرد بوونی فەیلەسوفێک لە ماشێنەکەدا سوودی خۆی هەبێت.

رێک پاش ئەوەی شاری "رافینا"مان بەجێهێشت، لە باوکمم پرسی؛
«بابە... تۆ باوەرت بە رێکەوت هەیە؟»
لە ئاوێنەکەوە تەماشایەکی کردم و گوتی؛
«دەڵێیت باوەرم بە رێکەوت هەیە؟»
«ئمم!»
«بەڵام خۆت دەزانیت رێکەوت شتێکە کە بەراستی بە رێکەوت روودەدات. بۆ نمونە ئەو کاتەی کە من دە هەزارم لە یانسیبدا بردەوە، ژمارەکەی من لەنێوان چەند هەزار ژمارەیەکی تردا بردیەوە. بێگومان ئەوسا من پێم خۆشبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا من بە رێکەوت ئەو پارەیەم بردەوە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«دڵنیایت لەوە؟ ئەی لەیادت نیە کە هەمان پێش نیوەڕۆ گوڵە "بارێزە[23]"ەکەمان لەسەر ڕێگاکەدا بینی؟ وە ئەگەر تۆ ئەو پارەیەت نەبردایەتەوە، ئەوا لەوانەبوو نەمانتوانیبایە ئەم سەفەرە بەرەو ئەسینا بکەین».

مرخەمرخێک لە باوکمەوە بەرزبووەوە و مینش درێژەم بە قسەکانم دا؛

«ئەی هەر بەڕێکەوتیش پورت لە سەر دوورگەی "کرێتا"دا چاوی بە گۆڤارەکە کەوت و وێنەی دایکمی بینی؟ یان مەرامێکی لەپشتەوە هەبوو؟»

ئینجا باوکم گوتی؛

«تۆ دەتەوێت بزانیت بڕوام بە چارەنووس هەیە یان نا، منیش لە وەڵامدا دەڵێم نەخێر بڕوام پێ نیە»

وابزانم باوکم پێیخۆشبوو ببینێت کە سەرقاڵی هەندێ پرسیاری فەلسەفیم.

بیرم لە کچە شوشەچیەکان دەکردەوە؛ ڕێک کەمێک بەرلەوەی لە کتێبەکەدا دەربارەی شوشە بخوێنمەوە، سەردانی شوێنێکی شوشەسازیمان کرد. هەروەها بیرم لەو کورتەبنەیەش دەکردەوە کە زەرەبینەکەی پێبەخشیم، دواتریش کتێبێکیان دامێ کە بە خەتێکی زۆر ورد نووسرابووەوە. بیرم لە نەنکیشم دەکردەوە کە پاسکیلەکەی لە ڕێگای "فرۆلاند"دا پەنچەربووە و هەموو ئەو ڕووداوانەی تریش کە بەدوای ئەودا ڕوویانداوە... پاشان گوتم؛

«پێم وانیە من لە ڕێگەی ڕێکەوتێکەوە لەدایکبووبم»

---

[23] گوڵێکی چوار پەڕەکیە و دەڵێن ئەو کەسەی کە بیبینێت، بەختداردەبێت.



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

باوکیشم گوتی؛

«دەوەستین بۆ جگەرەکێشان!»

لەوەدەچوو قسەکەم بابەتێکی لەلای باوکم وورووژاندبێت و حەزبکات بە کورتە وتارێک بۆم هەڵبرێژێت.

ماشێنەکەی لە بەرزەلانێکدا ڕاگرت، لەوێوە بەسەر دیمەنێکی دڵفرێنی دەریای ئەدریاتیکدا دەیڕوانی.

لە ماشێنەکە هاتینە دەرەوە، پەنجەی بۆ تاشەبەردێک ڕاکێشا و وەک فەرمانێک گوتی؛

«دانیشە!»

بەم شێوەیە دەستی بە قسەکردن کرد؛

«1349»

یەکسەر گوتم؛

«ساڵی مەرگە ڕەشەکە»... زۆر بە باشی ئەو چیرۆکەم دەزانی، بەڵام بە هیچ جۆرێک نەمدەزانی ئەو ساڵە چ پەیوەندیەکی بە "ڕێکەوت"ەوە هەیە.

«باشە»... هێندەی گوت و ئیتر کەوتە قسە؛

«بێگومان خۆت دەزانیت ئەو تاعوونە ڕەشە نیوەی خەڵکی نەرویجی قڕکرد. بەڵام لەم بارەیەوە شتێک هەیە کە من لەوەوپێش هەرگیز بۆم باسنەکردوویت»

هەر بەشێوەی قسەکردنەکەیدا زانیم گوتارەکەی درێژدەکاتەوە؛

«ئەزانیت لەو کاتەدا ژمارەی داپیران و باپیرانی تۆ چەند هەزار دانەیەک بووە؟»

لەناچاریدا سەرێکم بۆ ڕاوەشاند. لەدڵی خۆمدا دەمگوت چۆن ئەوە ڕێیتێدەچێت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«هەموو کەسێک دایک و باوکێکی هەیە، چوار داپیرە و باپیرەی هەیە، هەشت داپیرە گەورە و باپیرە گەورەی هەیە، شانزە داپیرە هەرە گەورە و باپیرە هەرە گەورەی هەیە و هەتا دوایی. وە ئەگەر بەو شێوەیە بگەڕێیتەوە سەر ساڵی 1349، ئەو کاتە ژمارەیان هەر زۆر زۆر دەکات، وایە؟»

سەرێکم بۆ لەقاند.

«ئەو ساڵە تاعوونە ڕەشە بڵاوبووەوە. مەرگ لە لادێیەکەوە بەرەو لادێیەکی تر کۆچی دەکرد و بەتایبەتیش منداڵەکانی قڕدەکرد. لە هەندێک خێزاندا هەموویانی کوشت، لە هەندێکی تریشدا یەک دوانێکیان دەرچوون. لەو کاتەدا بەسەدان داپیرە و باپیرەی تۆ منداڵبوون، هانس تۆماس. بەڵام هیچ یەکێکیان نەمردن»

بەتەواوەتی سەرم سوڕما و لێم پرسی؛

«چۆن دەتوانیت هێندە دڵنیابیت؟»

مژێکی لە جگەرەکەی دا و گوتی؛

«لەبەرئەوەی ئێستاکە لێرەدا دانیشتوویت و تەماشای دەریای ئەدریانتیک دەکەیت»

دیسانەوە خاڵێکی سەیری هێنایەوە پێشەوە و هێندە سەرسامبووبووم کە بەڕاستی نەمدەزانی چی بڵێم. بەڵام هێندە تێگەیشتم کە ڕاستیدەکرد، چونکە ئەگەر تەنانەت یەک داپیرەش یان باپیرەی من بە منداڵی بمردایە، ئەوا ئەوساکە نەدەبووە داپیرە یان باپیرەی من.

سەرلەنوێ باوکم کەوتەوە قسەکردن و گوتی؛

«بواری نەمردنی یەکێک لە داپیرە و باپیرانت لە کاتی گەورەبوونیاندا وەک ئەوە وایە کە یەک لەسەر چەند ملیاردێک بێت»

لێرەبەدواوە ئیدی وشەکان بەڕەوانی لە زاری باوکمەوە هەڵدەڕژان؛



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«لەبەرئەوەی لێرەدا تەنها باس لە تاعوونە ڕەشەکە ناکەین، تێدەگەیت؟ لە ڕاستیدا هەموو داپیرە و باپیرەکانت گەورەبوون و منداڵیشیان بووە؛ تەنانەت لەکاتی کارەساتە سروشتیە سەختەکانیشدا، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە مردنی منداڵ زۆر بەربڵاوبووە. بێگومان زۆریان نەخۆشکەوتوون، بەڵام هەمیشە ماونەتەوە. بەو شێوەیەش هانس تۆماس تۆ چەند سەد ملیارد جارێک هێندەی ملیمەترێک لە مەرگەوە دووربوویت. ژیانی سەر ئەم زەویەت لەلایەن مێش و مەگەز و گیانەوەری دڕندەوە مەترسی لەسەربووە، لەلایەن هەورە تریشقە و بەردی ئاسمانی و نەخۆشی و شەڕ و لافاو و ئاگرکەوتنەوە و ژەهراوییبوون و کوشتن و برینەوە هەڕەشەی لەسەربووە. تەنها لە کاتی شەڕەکەی "ستیکلستاد"دا چەند سەد جارێک برینداربوویت، چونکە بێگومان باپیرانت لە هەردوو بەرەی شەڕدا هەبوون-واتە بۆ ئەوەی هەزار ساڵێک دواتر لەدایکببیتەوە، چەندین جار بەگژ خۆت و بواری مانەوەتدا هاتوویتەتەوە. هەروەک دەزانیت هەمان شێوەش بوو لە کاتی شەڕی جیهانی دووهەمدا. ئەگەر لە کاتی داگیرکردنی نەرویجدا سەربازێکی نەرویجی باش، باپیرەتی بپێکایە ئەوا ئەو کاتە نە من لەدایک دەبووم و نەتۆش. مەبەستم لەوەیە ئا لەم جۆرە شتانە چەند ملیارد جارێک لە مێژوودا ڕوویانداوە. هەموو کەرەتێک کە تیرێکیان گرتۆتە ئاسمان، بواری لەدایکبوونی تۆ بەیەکجاری کەمبۆتەوە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئێستاکە تۆ لێرەدا لەژێر ئەم ئاسمانە قەشەنگەدا دانیشتوویت و لەگەڵمدا قسەدەکەیت، هانس تۆماس... تێدەگەیت؟»

«وابزانم تێدەگەم»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





بەلایەنی کەمەوە لەوە تێگەیشتم کە کاتی خۆی پەنچەربوونی پاسکیلەکەی نەنکم لەو کاتەدا کەبەرەو فرۆلاند ڕۆیشتووە، گرنگبووە... باوکم لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛

«من باس لە شێوە زنجیرەیەکی دورودرێژی "ڕێکەوت" دەکەم. لە ڕاستیدا ئەو زنجیرەیە دەگەڕێتەوە سەر یەکەمین خانەی زیندوو، کە خۆی بەسەر دوو بەشدا دابەشکرد و سەرەتای هەموو ئەو شتە زیندووانەی دامەزراند کە ئەمڕۆکە لەسەر ئەم زەویەمان دەڕوێن و گەورەدەبن. بواری ئەوەی کە زنجیرەکەی من لە کاتێک لە کاتەکاندا وە بەدرێژایی سێ چوار ملیارد ساڵێک ڕووبەڕووی هیچ شتێک نەبوویێتەوە، هێندە کەمە کە سەختە مەزەندە بکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیومە بمێنمەوە. بەڕاستی ماومەتەوە. هاوکات دەشزانم کە چەندە بەختەوەرم، چونکە ئەو بوارەم هەیە کە لەگەڵ تۆدا ئەم جیهانە ببینم. هەروەها بەئاگاشم لەوەی کەهەر یەکێک لە خشۆکەکانی سەر ئەم زەویە چەندە بەختەوەرن»

ئەوجا لێم پرسی؛

«ئەی بێ بەختەکان چی؟»

وەک ئەوەی بنەڕێنێت گوتی؛

«ئەوان بوونیان نیە. ئەوانە هەرگیز لەدایکنەبوون. ژیان یانسیبێکی گەورەیە و تەنها ژمارەی براوەکانی تێدا دیارە»

ئیدی هەر لە شوێنی خۆیدا دانیشتبوو و تەماشای دەریای دەکرد.

پاش چەند خولەکێک پێم گوت؛

«نەڕۆین؟»

«نەخێر جارێ ناڕۆین! بێدەنگ دانیشە هانس تۆماس. هێشتام شتی ترم پێیە بیڵێم»





بەشێوەیەک ئەو وشانەی گوت، هەردەتگوت کەسێکی دی دەیانڵێت نەک ئەو. لەوانەیە لەو کاتەدا خۆی وەک ئامێرێکی ڕادیۆ بینیبێت کە تەنها شەپۆلی دەنگ وەردەگرێت و دەریاندەپەڕێنێت. پێم وابێت ئەوەیە کە پێی دەڵێن سروش.

لەو کاتەدا کە ئەو چاوەڕوانبوو سروشی بۆبێت، من زەڕەبینەکەم دەرهێنا و خستمە سەر مێش گەزۆیەک کە لەمسەری بەردێکەوە بۆ ئەو سەری دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە. لەژێر زەڕەبینەکەمدا هەر لە گیانەوەرێکی ترسێنەر دەچوو... لەناکاودا باوکم گوتی؛

«هەموو ڕێکەوتەکانیش بەو شێوەیەن»

زەڕەبینەکەم لابرد و تەماشایەکی باوکمم کرد. بۆ ماوەیەک هەر دانیشتبوو و بیریدەکردەوە. بەرلەوەی دەمی بکاتەوە، هەستمکرد شتێکی گرنگم پێدەڵێت؛

«با نمونەیەکی ئاسان بهێنینەوە؛ گریمان من بیر لە برادەرێکم دەکەمەوە و ئەویش پاش کەمێک تەلەفونم بۆ دەکات، یان دێتە بەردەرگاکەم و سەردانم دەکات. لێرەدا خەڵکانێکی زۆر لەو بڕوایەدان کە ئەو ڕێکەوتە بەهۆی شتێکی سەروسروشتیەوە ڕوویدات. بەڵام ئەگەر نەشهاتایەتە بەردەرگاکەم، من هەر بیرم لێدەکردەوە. زۆر جاریش بەبێ ئەوەی بیری لێبکەمەوە، تەلەفونم بۆ دەکات. تێدەگەیت لە مەبەستم؟»

سەرێکم بۆ لەقاند.

«مەبەستم لەوەیە کە خەڵکی ئەو حاڵەتانە کۆدەکەنەوە کەتێیدا هەردوو بەشەکە بەیەکەوە ڕوودەدەن. بۆ نمونە ئەگەر دە کرۆنیەک لەو کاتەدا بدۆزنەوە کە زۆر پێویستیانە، ئیدی یەکسەر لەو بڕوایەدا دەبن کە بەهۆی شتێکی "سەروسروشتی"وە دۆزیبێتیانەوە. هەرچەندە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



ژیانێکی هەژارانەش بەسەردەبەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر باوەڕەکەیان هەر دەمێننەوە. بەو شێوەیەش چەندەها قسەوباسی بێمانا دەربارەی کۆمەڵێک ڕووداوی "سەروسروشتی" جیاوازجیاواز بڵاودەبێتەوە کە گوایە لێرەولەوێ بەسەر پورەکان و مامەکانماندا هاتوون. خەڵکی زۆر سەرقاڵی ئەو شتانەن، هەر ڕێک لەبەرئەوەشە کە ئەو ڕووداوانە خێرا دەهۆنرێنەوە و دەبنە چیرۆک. بەڵام لەوێشدا دیسانەوە تەنها ژمارە براوەکان دەردەکەونەوە. بۆ نمونە هیچ سەیر نیە کە من چەکمەجەیەکی پڕ لە کاغەزی جۆکەرم هەیە، لە کاتێکدا کە کۆیان دەکەمەوە!»

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و پێم گوت؛

«هەرگیز هیچ داخوازی نامەیەکت بۆ نەناردوون؟»

لوورەیەکی لێبەرزبووە و گوتی؛

«ئەوە باسی چ شتێکی قۆڕ دەکەیت؟»

«مەبەستم لەوەیە داوات نەکردووە کە دەوڵەت وەک فەیلەسوفێک موچەت بداتێ؟»

دایە قاقای پێکەنین و پاش کەمێک بە دەنگێکی کەمێک نزمترەوە گوتی؛

«خەڵکی جۆرە کوێریەکی سەیروسەمەرەیان هەیە، هەر بۆیە هێندە سەرقاڵی شتە "سەروسروشتی"ەکانن. ئەوان ئەفسوناویترین شت و پڕنهێنیترین شت نابینن؛ کتومت مەبەستم لەم جیهانەیە. خەڵکی مەریخ و "یوفۆ"یان بەلاوە گرنگترە وەک لەو هەموو شتە زیندووە پڕنهێنیانەی لەبەر چاوماندا خۆیان نیشاندەدەن. من پێم وانیە جیهان ڕێکەوتێک بێت، هانس تۆماس»

دواجاریش خۆی بەسەرمدا چەماندەوە و بە چرپەیەک گوتی؛





«من لەو بڕوایەدام ئەم گەردوونە مانایەکی هەبێت. ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو ڕاستیە دەردەکەوێت کە لەپشت هەموو تاکە ئەستێرەیەکی ئاسمانەوە مەرامێک هەیە»

هەستمدەکرد زۆر شت لە قسەکانیەوە فێربووم، بەڵام لە هەمان کاتدا لەو بڕوایەدابووم کە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە کتێبە بچکۆلەکەوە هەیە، هەروا بە ڕێکەوت ڕوونادەن. لەوانەیە بتوانین بڵێین ڕێکەوتێکی کوێرانەبوو کە من و باوکم سەردانی دوورگەی "مورانۆ"مان کرد و ڕێک پاش ئەوەش دەربارەی "کورتەبنە دینار"ەکانم خوێندەوە. پێشی دەچێت کە بە هەمان شێوە ڕێکەوتێکی کوێرانەبووبێت کە ڕێک پێش ئەوەی کتێبە بچکۆلانەکەیان دامێ، زەڕەبینێکیان پێبەخشیم. بەڵام دەبێت مەرامەکە ڕێک لەوەدا بووبێت کە ئەو کتێبەیان بە من بەخشی.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

## پێنجی سینەک

**...دوای ئەوە ئیتر یاریکردن بە کاغەزەکان کەمێک سەختبوو...**

بۆ دەمەو ئێوارە گەیشتینە "ئانکۆنا"... باوکم هەر زۆر نەرم و میهرەبان دەهاتە بەرچاوم، تا ڕادەیەک لێی دەترسام. لەو کاتەدا کە دانیشتبووین و چاوەڕێبووین بچینە ناو پاپۆڕەکەوە، باوکم هەر تەماشای پاپۆڕەکەی دەکرد و هیچی نەدەگوت.

پاپۆڕێکی گەورەی ڕەنگ زەردبوو و ناوی "دەریای ناوەڕاست"بوو. کەشتیەکە کاتژمێری نۆی ئێوارە دەکەوتە جوڵە و سەفەرەکەمان بەرەو یۆنان دوو شەو و ڕۆژێکی پێدەچوو. لەدوای شەوی یەکەمەوە دەبوو هەموو ڕۆژی یەکشەمەمان لەناو دەریادا بەسەرببردایە، وە ئەگەر هیچ چەتەیەکی دەریایشمان تووش نەبوایە، ئەوا دەبوو کاتژمێری هەشتی بەیانی ڕۆژی دووشەممە پێ بخەینە ناو خاکی یۆنانەوە.

باوکم نامیلکەیەکی دەربارەی کەشتیەکە پەیداکردبوو و پاش خوێندنەوەی گوتی؛

«18000 تەنە، کەواتە لە تەشتێکی قاپشۆرین گەورەترە هانس تۆماس. کەشتیەکە 17 میلی دەریایی لە کاتژمێرێکدا دەبڕێت، جێگای زیاتر لە هەزار کەس و 300 ماشێنی تێدا دەبێتەوە. چەندەها باڕ و گازینۆ و دوکان و چێشتخانە و دیسکۆ و جێگای پشوودانی تێدایە. هێشتام شتی زیاتریشی تێدایە؛ تۆ دەتزانی ئەم پاپۆڕە مەلەوانگەی تێدایە؟ بێگومان شتێکی هێندە گرنگ نیە، بەڵام هەر ویستم بزانم کە تۆش ئەوە دەزانیت یان نا... بەهەرحاڵ پێم خۆشە پرسیارێکت لێبکەم؛ زۆر زۆرت پێناخۆشبوو کە بەناو یوگسلافیادا نەڕۆیشتین؟»



منیش هەروا گوتم؛

«مەلەوانگە لەناو پاپۆڕدا؟»

وابزانم هەردووکمان دەمانزانی کە چیتر شتێکی وانیە لەو بارەیەوە کە باسی لەسەربکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوکم بەردەوامبوو؛

«بێگومان دەبوایە کابینەشم بگرتایە... وانیە؟ ئەوجا دەبوایە یان یەکێک لە کابینەکانی ناوەوەی پاپۆڕەکەم بگرتایە یاخود یەکێک لەوانەی کە پەنجەرەی گەورەی تێدایە و بەسەر دەریادا دەڕوانێت. بە بڕوای تۆ کامیانم هەڵبژاردووە؟»

دەمزانی یەکێک لە کابینە دەرەکیەکانی هەڵبژاردووە، وە دەشمزانی کە سوور دەزانێت کە منیش دەزانم کامیانی گرتووە. لەبەرئەوە گوتم؛

«نرخەکانیان زۆر جیاوازی هەبوو؟»

«بەڵێ چەند لیرەیەک. بەڵام خۆ من نامەوێت کوڕەکەم بهێنمە ناو دەریاوە و لە کونێکدا زیندانی بکەم»

فریانەکەوت لەوە زیاتر بڵێت، چونکە لەو کاتەدا ئاماژەیان بۆ ماشێنەکان کرد کە بچنە ناو پاپۆڕەکەوە.

پاش ئەوەی ماشێنەکەمان ڕاگرت، یەکسەر کەوتینە گەڕان بەدوای کابینەکەماندا و دۆزیمانەوە. ژوورەکەمان لە قاتی پێش سەری سەرەوەدابوو. تا بڵێیت بە جوانی ڕازێنرابوووەوە؛ جێگای خەوتنی گەورە گەورە، پەردەی جوان، گڵۆپی قەشەنگ و کورسی و مێز، هەموو ئەوانەی تێدا بوو. لە پەنجەرەکەوە دەمبینی خەڵکی لە ڕاڕەوەکەدا دەهاتن و دەچوون.

بەڕاستی ژوورەکەیان جوان ڕازاندبۆوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکمان پێمان وابوو شوێنێکی وانەبێت کە بتوانیت ماوەیەکی زۆری تێدا بمێنیتەوە. ئێمە هەردووکمان بەبێ هیچ چەند و چوونێک



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



هەمان هەستمان هەبوو. پێش ئەوەی بڕۆینە دەرەوە، باوکم قوتیلکەیەکی بچکۆلەی لە گیرفانیدا دەرهێنا و قومێک ئارەقی بۆ خۆی کردە پەرداخێکی پچکۆلەوە، من هیچ خواردنەوەیەکم پێنەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوتی؛

«نۆش!»

وابزانم ئەو هەموو ماشێن لێخوڕینە لە شاری فێنیسیاوە بەتەواوەتی شەکەت و ماندووی کردبوو. لەوانەشە دڵی هەر یەکجار خۆشبووبێت، چونکە پاش ئەو هەموو ساڵەی دوور لە کەشتیوانی دیسانەوە پێی خستەوە ناو پاپۆڕێکی گەورەوە. بەڵام لەگەڵئەوەشدا -یان وابزانم ڕێک لەبەر ئەو هۆیە- بەم شێوەیەی خوارەوە هەستی خۆمم دەربارەی خواردنەوەی بێسەروبەری دەربڕی؛

«باشە هەر دەبێت هەموو ئێوارەیەک شتێک بخۆیتەوە؟»

قرقێنەیەکی لێدا و گوتی؛

«بەڵێ گەورەم هەموو ئێوارەیەک دەبێت بخۆمەوە!»

ئیدی چیتر لەسەر ئەوە نەڕۆیشتین، چونکە ئەو بەشێوەی تایبەتی خۆی بیریدەکردەوە و منیش بە شێوەی خۆم. لەبەرئەوە باشتربوو لە دەرفەتێکی تردا بگەڕێینەوە سەر بابەتەکە.

پاش ماوەیەک کەشتیەکە لوورەی لێبەرزبووە و کەوتە جوڵە، بەڵام ئێمە تا ئەو کاتە بە باشی شارەزای کون و کەلەبەری بووبووین. کاتێکیش کە بۆماندەرکەوت مەلەوانگەکە داخراوە، من کەمێک نائومێدبووم. بەڵام باوکم خێرا کەوتە پرسیار و پێیانگوت بۆ سبەی پاشنیوەڕۆ ئەوجا دەکرێتەوە.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

خۆمان بەسەر دەستەوانەی (موحاجەرە) کەشتیەکەدا چەماندبووەوە، وە هەتاوەکو ئەو کاتەی وشکانیمان لێوە دیارنەما، هەر لەوێدا ماینەوە. ئەوجا باوکم گوتی؛

«ئاوها خۆشە هانس تۆماس... ئێستاکە لەناو دەریاچەداین»

پاش ئەو ڕستە باش هەڵسەنگێنراوەی، خۆمانکرد بە چێشتخانەیەکدا و نانێکمان بۆ خوارد. پاش ئەوەی کە لێبووینەوە و پارەشمان دا، ڕێک کەوتین لەسەر ئەوەی بەر لەوەی بچینە ناو جێگاوە، پێکەوە یاری کاغەز لە بارەکەدا بکەین. باوکم دەستەیەک یاری کاغەزی لە گیرفانی بەرباخەڵیدا دەرهێنا، خۆش بەختانە هەمان ئەو دەستەیە نەبوو کە کچە ڕووتەکانی پێوەبوو.

خەڵکی لە هەموو سوچ و کەلەبەرێکی جیهانەوە لە پاپۆڕەکەدا بوون و لە هەموو شوێنێکدا جمەیان دەهات. هەرچەندە زۆربەیان بەتەمەن گەورەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باڵایان کورت دەهاتە بەرچاوم. باوکم دەیگوت ئەوانە یۆنانین.

دەستمان کرد بەیاری و دووی قەرە و دەی دینار بەر من کەوتن. بەڵام هەر لەو کاتەوەی دەی دینارم ڕاکێشا، دوو کاغەزی دیناری تر لە دەستەکەمدابوون. لەبەرئەوە بەدەنگێکی بەرز گوتم؛

«کچانی شوشەچی!»

باوکم چاوی داپچڕی و گوتی؛

«گوتت چی هانس تۆماس؟»

«هیچ...»

«گوتت "کچانی شوشەچی"؟»

ئەوجا گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«ئۆو... مەبەستم لەو کچانەی سەر بارەکەیە. بەشێوەیەک بەدەوری خواردنەوەکانیاندا دانیشتوون، هەر دەڵێیت لە ژیانیاندا تەنها داوای خواردنەوەیان کردووە و هیچی تر»

بەبڕوای خۆم هەر زۆر خێراو و بە باشیش خۆمم ڕزگارکرد. بەڵام دوای ئەوە ئیتر یاریکردن بە کاغەزەکان کەمێک سەختبوو. تاڕادەیەک وەک ئەو کاغەزانە دەهاتنە بەرچاوم کە باوکم لە "فیرۆنا" کڕینی. چونکە لەو کاتەدا کە پێنجی سینەکەم فڕێدایە سەر مێزەکە، تەنها بیرم لەو کورتەبنە لادێییانە دەکردەوە، کە "هانس"ی نانەوا کاتی خۆی لەسەر دوورگە سەیرەکە بینیبوونی. کاتێکیش کاغەزی دینارم لەسەر مێزەکە دەبینی، کۆمەڵێک ئافرەتی پەری ئاسام دەهاتە بەرچاو، قژی زیوینی و کراسە پەمەییەکانیانم دەبینی. لەو کاتەشدا کە باوکم بللی کوپی خستە سەر مێزەکە و شەشی قەرە و هەشتی قەرەی پێ لوولکرد، هاوارێک لە دەممەوە هاتە دەرەوە؛

«ئەوە دیسانەوە ئافرەتەکە دەرکەوتەوە!»

باوکم سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی وابزانم کاتی خەومان هاتووە. بەڵام پێش ئەوەی بارەکە جێبهێڵین، دەبوایە کارێکی گرنگی بەجێبهێنایە. لەڕاستیدا ئێمە تەنها کەس نەبووین لە بارەکەدا کە یاری کاغەزێنمان دەکرد. لە ڕێگەی چوونە دەرەوەماندا بەدەوری چەند مێزێکدا خولایەوە و سواڵی جۆکەرەکەی لێدەکردن. هەمیشەش لەو کاتەدا داوای دەکرد کە جێگایەکمان جێدەهێشت، من ئەوەم بەلاوە ناشیرینبوو.

دەمێکبوو لەگەڵ باوکمدا یاری کاغەزم نەکردبوو. ئەو کاتەی کە منداڵتربووم زیاتر یاریمان دەکرد. بەڵام بەهۆی جۆکەر کۆکردنەوەوە، کەمە کەمە یاری کاغەزێنی لەبەرچاوکەوتبوو. ئەو بەڕاستی





دەستێکی باڵای لە هونەری یاری کاغەزێندا هەبوو. کەرەتێکیان یاریەکی دامەزراندبوو کە تەواوکردنی بەلایەنی کەمەوە چەند ڕۆژێکی پێدەچوو. بەڵام خۆشی بینین لە یاریەکی ئاوها تەنها نەفەس درێژی پێویست نیە، بەڵکو دەبێت کاتێکی باشیشت لەبەر دەستابێت.

کە گەیشتینەوە کابینەکەمان، کەمێک لە ژورەکەدا وەستاین و بۆ خۆمان سەیری دەریامان دەکرد. لەبەر تاریکی هیچمان نەدەدی. بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەمانزانی ئەو تاریکیەی کە تەماشای دەکەین، دەریایە.

پاش نەختێک لەپەنجەرەکەوە کۆمەڵێک ئەمریکیمان بینی کە دەنگیان لێهەڵبڕیبوو و بە ڕاڕەوەکەی دەرەوەدا دەڕۆیشتن. پەردەکانمان دادایەوە و باوکم لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت. یەک و دوو خەوی لێکەوت، لەوە دەچوو پڕ بەپێستی خۆی دەرمانی خەوی خواردبێت.

منیش پاڵکەوتم و بەئاسانی هەستم بە جوڵەی پاپۆڕەکە دەکرد کە لەناو دەریادا جۆلانەی دەکرد. پاش ماوەیەک کتێبە بچکۆلەکە و زەرەبینەکەم دەرهێنا. دەمویست زیاتر دەربارەی چیرۆکە سەیرو سەمەرەکەی "هانس"ی نانەوا بخوێنمەوە کە بۆ ئەلبێرتی دەگێڕایەوە... ئەو کەسەی کە کاتی خۆی دایکی بە نەخۆشی مردبوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



شەشی سینەک

...دەیوست دڵنیابێت کە من مرۆڤێکی ڕاستەقینەم و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووم...

بەردەوام بەناو دارستانەکەدا بەڕێکەوتم و لە ناکاودا خۆمم لەناو پانتاییەکی بەرینی بەرەڵادا بینیەوە. لە لاپاڵی گردێکی بە گوڵ داپۆشراودا کۆمەڵێک خانوبەرەی نزیک بەیەکم بینی، هەر لە شێوەی لادێیەک دەچوو. ڕێگایەکی پێچاوپێچیش بە نێوان خانووەکاندا دەڕۆیشت. کۆمەڵێک کورتەبنە بەسەر ڕێگاکەدا دەهاتن و دەچوون، بالآیان هەر هێندەی ئەوانی دی دەبوو کە لەوەو پێش بینیبووم. کەمێک لەسەروی گردەکەشەوە تاکە خانویەک قوتبووبووەوە.

پێموانەبوو لەوێدا کەسێکی بەرپرسیار هەبێت کە بتوانم پرسیاری شوێنەکەی لێبکەم، لەبەرئەوە دەبوایە خۆم وەڵامێکم بدۆزیبایەتەوە و بمزانییایە لە چ شوێنێکی جیهاندام.

یەکێک لەو خانوانەی کە لە سەرەتادا بینیم نانەواخانەیەکی بچکۆلەبوو. ڕێک لەو کاتەدا کەبەلایدا تێپەڕیم، ئافرەتێکی قژکاڵ هاتە بەردەم دەرگاکەی و لەوێدا وەستا. کراسێکی سووری درێژی لەبەردابوو و سێ نیشانەی "کوپ"یش لەسەر سنگی نەخشرابوو. دوو گۆنای سووری پێوەبوو، خەندەیەکی نەرم و نیان هاتە سەر لێوەکانی و گوتی؛

«نانی گەرم!»

بۆنی نانەکە گەیشتە لوتم و هێندە خۆشبوو نەمتوانی بەرەنگاری ببمەوە، لەبەرئەوە یەکسەر خۆمکرد بەناو نانەواخانە بچکۆلەکەدا. حەفتەیەک زیاتربوو تامی نانم نەکردبوو، کەچی لەوێدا لەسەر





ڕەفەیەکی پان لەم سەرەوە بۆ ئەوسەری دیوارێک نان و کێکیان هەڵدابووەوە.

لە ژوورێکی پشتەوەی نانەواخانەکەوە دووکەڵی فڕنی سەمونەکەیان هێدی هێدی بەرزدەبووەوە. لەپڕێکدا ئافرەتێکی کراس سووری تریش خۆی کرد بەناو نانەواخانە بچکۆلەکەدا. ئەویان پێنج نیشانەی "کوپ" بە سنگیەوە بوو.

لەدڵی خۆمدا گوتم "سینەک"ەکان لە کێڵگەکەدا کاردەکەن و ئاژەڵ بەخێودەکەن. "بللی"ەکان بە کراسی جوانەوە دەخولێنەوە و گوڵ و توو دەچنن. "کوپ"ەکانیش نان دروستدەکەن. گەر بمزانییایە "قەرە"کان خەریکی چین، ئەوسا بەشێوەیەکی گشتی پوختەیەکی کاغەزەکانم لەلاگەڵاڵە دەبوو".

پەنجەم بۆ یەکێک لە نانەکان ڕاکێشا و پرسیم؛

«دەکرێت تامێکی بکەم؟»

مێزێکی سادەیان دروستکردبوو و بە چەند کۆڵەکەیەکی بچوک ڕایانگرتبوو. لەسەر مێزەکەش شوشەیەکی ماسی گەورەیان دانابوو، تەنها یەک ماسی پرتەقاڵی تێدابوو. پێنجی کوپ خۆی بەسەر مێزەکەدا چەماندەوە، بەتیژی تەماشای ناو چاوی کردم و بەدەموچاوێکی گوماناویەوە گوتی؛

«وابزانم یەک دوو ڕۆژێکە قسەم لەگەڵ تۆدا نەکردووە»

منیش گوتم؛

«ڕاست دەکەیت. لەڕاستیدا هێندە نابێت کە لە مانگەوە کەوتوومەتە خوارەوە. جگەلەوەش هەرگیز لە ژیانمدا نەمزانیوە چۆن قسەبکەم. ئەمەش لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بیرکردنەوە بەلامەوە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





کەمێک سەختە. کە نەشتوانیت بیربکەیتەوە، ئیتر قسەکردنیش هیچ مانایەکی نابێت»

هێندە فێربووبووم کە قسەکردن بە شێوەیەکی ڕێک و پێک لەگەڵ کورتەبنەکاندا هیچ سوودێکی نیە. لەبەرئەوە لەدڵی خۆمدا گوتم لەوانەیە واباشتربێت کە منیش هەروەک ئەوان بەجۆرێکی بێمانا قسەبکەم، بەڵکو ئەوکاتە بتوانم زیاتر لێیان نزیکببمەوە.

«گوتت لەمانگەوە؟»

«بەڵێ بەڵێ لەوێوە»

پێنجی کوپ زۆر بەپوختی و بەروونی گوتی؛

«بەڵێ، کەواتە دەتوانیت پارچەیەک نان بخۆیت»

قسەکەی بەجۆرێک گوت، هەردەتگوت کەوتنە خوارەوە لە مانگەوە بەلایەوە وەک وەستانی خۆی لەپشت مێزەکەوە و دروستکردنی نان ڕاست و دروستبێت.

مەبەستم لەوەیە ڕێک بەو شێوەیەبوو کە من مەزەندەم دەکرد. گەر تەنها وەک ئەوان بجوڵامایەتەوە، ئیدی بەئاسانی دەمتوانی لەو کورتەبنانە تێبگەم. بەڵام پاش نەختێک لەناکاودا تووڕەبوو و خۆی بەسەر مێزەکەدا چەماندەوە، هەڵچوو و بەچرپە چرپێک گوتی؛

«ئەو شتەی کە ڕوودەدات لە کاغەزەکاندایە»

هێندەی نەبرد و دیسانەوە وەک خۆی لێهاتەوە، ئەوجا پارچەیەک نانی گەورەی لێکردەوە و خستیە ناو دەستمەوە. منیش یەکسەر خستمە ناو دەممەوە و خۆم گەیاندە سەر ڕێگا باریکەکەی دەرەوە. تامەکەی لەنانی ئاسایی کەمێک ترشتربوو، بەڵام هەروەک هەموو جۆرە نانێکی تر تامێکی خۆشی هەبوو و پێی تێربووم.



لەسەر ڕێگاکەدا سەرنجمدا هەموو کورتەبنەکان شێوەی پچکۆلە پچکۆلەی کوپ و سینەک و دینار و قەرەیان لەسەر سنگبوو. چوار کراسی ڕەنگ جیاوازیشیان پۆشیبوو؛ ڕەنگی کراسی "کوپ"ەکان سوور و "سینەک"ەکان شین و "دینار"ەکان سووری کاڵ و "قەرە"ەکانیش ڕەش بوو.

هەندێکیان کەمێک لەوانی دی باڵایان بەرزتربوو. ئەوانەش جلوبەرگی پاشا و شاژن و کوڕیان لەبەردابوو. پاشاکان و شاژنەکان تاجیان بەسەرەوەبوو، بەڵام کوڕەکان پشتوێنێکیان بە کەمەرەوە بەستبوو و هەریەکەشیان شمشێرێکی پێوەبوو.

هەرچۆنێک لێیان وردەبوومەوە هیچ یەکێکیان لەوی دی نەدەچوو. مەبەستم لەوەیە تەنها یەک پاشای "کوپ"م دی، یەک شەشی سینەک و یەک هەشتی قەرەم بەدیکرد و هتد. هیچ دانەیەکیان منداڵ نەبوو، وە هیچ کەسێکیشیان بەتەمەن نەبوو. هەموو ئەو کورتەبنە گەورانە لەو پەڕی گەنجیاندابوون.

هەر کاتێکیش کە چاویان پێم دەکەوت، ڕێک تەماشایەکیان دەکردم و پاش نەختێک ڕوویان وەردەچەرخاندەوە. هەر ڕێک وەک ئەوەی بەلایانەوە گرنگ نەبێت کە لەناکاودا کەسێکی نامۆ ڕووی لە لادێکەیان کردووە.

تەنها شەشی سینەک -کە ماوەیەک لەوەوپێش بەسەر یەکێک لە ئاژەڵە شەش قاچەکانەوە بینیبووم- لەسەر ڕێگاکە لەبەردەممدا وەستا و هەروەک ئەوانی تر ڕستەیەکی بێمانای لەدەم بووەوە؛

«شازادەی خۆر ئەو ڕێگایە دەدۆزێتەوە کە بەرەو دەریاکە دەڕوات»

هێندەی گوت و ڕێک پاش ئەوە بەیەکێک لە کۆڵانەکاندا پێچیکردەوە و ونبوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

ئیدی بەتەواوەتی سەرم گێژی دەخوارد. هەستمدەکرد کەوتوومەتە ناو کۆمەڵگایەکی ئاڵۆزەوە کە کەسێکی زیرەک تەرزی ژیانی دارشتوون و بەسەر چەند چینێکدا دابەشیکردوون. لەوەدەچوو خەڵکی سەر ئەو دوورگەیە تەنها لەسەر یاساکانی دەستەیەکی کاغەز بڕۆن بەرێوە و هیچی تر.

لەو کاتەدا کە بە ئاواییەکەدا دەسوڕامەوە، هەستێکی ناخۆش دایگرتم و لەوەدەچوو لە نێوان دوو کاغەزی یاریەکی "ناپلیۆندا" گیرمخواردبێت، وە بەبێ ئەوەی هیچ رێگا چارەیەکی هەبێت یاریەکە هەر درێژەی دەخایاند.

خانووەکان لە چەند کوخێکی بەتەختە دروستکراوی بچکۆلە پچکۆلە زیاتر نەبوون. لەدیوی دەرەوەشیاندا چرایان پێدا هەڵواسرابوو، رێک هەروەک ئەو چرایانەوابوون کە لەوەبەر لە کارگەی شوشەکەدا بینیمن. راستە ئێوارە درەنگانێکبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام چراکانیان دانەگیرسانبوو، چونکە لادێکە لەناو تیشکی ئاڵتونی ئەو ئێوارەیەدا دەدرەوشایەوە.

لەبەر پەنجەرە و سەر لێواری دیوارەکاندا ژمارەیەکی بێشوماری شوشەی ماسی دانرابوو و هەموویان ماسی پرتەقاڵیان تێدابوو. لە هەموو شوێنێکیشدا بتڵی جۆراوجۆرم دەبینی، هەندێکیان هەروا لە نێوان ماڵەکاندا فرێدرابوون. تاوناتاوێکیش کورتەبنەکانم دەبینی بە خۆیان و بتڵێکی بچکۆلەی دەستیانەوە دەخولانەوە.

یەکێک لە خانووەکان لەوانی تر زۆر گەورەتربوو؛ هەر لە ئەمبار دەچوو. تەقە تەقێکی گەورە لەناووەوەی خانوەکەوە بەرزدەبووەوە. رۆیشتمە پێشەوە و لە دەرگایەکی کراوەوە تەماشای ناوەوەم کرد، لەوێدا چاوم بە دارتاشخانەیەک کەوت. چوار پێنج کورتەبنە زۆر



بەگوڕ سەرقاڵی دروستکردنی مێزێکی گەورەبوون. هەموویان هەمان جلوبەرگیان لەبەردابوو و لە جلوبەرگە شینەکانی لادێییەکان دەچوو. بەڵام رەنگی جلەکانی ئەمان رەشبوو و لەسەر پشتیان، وە لەهەمان شوێنی سینەکەکاندا، نیشانەی "قەرە"ی لەسەربوو. دوابەدوای ئەوەش نهێنیەکی ترم بۆ ئاشکرابوو؛ "قەرە"کان کاری دارتاشیان دەکرد. رەنگی قژیان رەشێکی تۆخبوو، بەڵام رەنگی پێستیان لەچاو سینەکەکاندا کاڵترێکبوو.

لەسەر کورسیەکی بەردەم یەکێک لە کوخەکاندا "کوڕ"ی دینار دانیشتبوو و تەماشای شمشێرەکەی دەکرد و لەوێوە بەوردی لە خۆرئاوابوونی دەڕوانی. چاکەتێکی درێژی سووری کاڵ و پانتۆڵێکی سەوزی لەبەردابوو.

چوومە لایەوە و وەک رێزلێنانێک خۆمم بۆ دانەواندەوە و هەوڵمدا بە زمانێکی سروشتی و خۆش قسەی لەگەڵدا بکەم؛

«ئێوارەت باش کوڕی دینار. دەتوانیت پێم بڵێیت لەکاتی ئێستادا چ پاشایەک دەسەڵاتی لەدەستدایە؟»

کوڕەکە شمشێرەکەی خستەوە کیفەکەی و بەبێزاریەکەوە سەیرێکی کردم، پاشان بە پەستیەکەوە گوتی؛

«پاشای قەرەیە... چونکە بەیانی جۆکەر دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت. بەڵام ئێمە رێگەمان پێنەدراوە باسی کاغەزەکان بکەین»

«جێگەی داخە، بەڵام تا رادەیەک ناچارم و داواتلێدەکەم شوێنی گەورەترین دەسەڵاتداری دوورگەکەم نیشانبدەیت»

ئەوجا گوتی؛

«نم متوگ، نامەگێڕ ەواردەنێپ یساب ناکەزەغاک نیەکب»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

«چیت گوت؟»
دیسانەوە گوتیەوە؛
«نامەگێڕ ەواردەنێپ یساب ناکەزەغاک نیەکب»
«بەڵێ؟ ئەی ئەوە مانای چیە؟»
«تێبەد شۆت یوەڕیەپ ناکاسای تیەکب»
«بەڵێ بەڵێ»
«تموتک!»
«قسەی قۆڕ»

بەوردی تەماشایەکی دەموچاوە بچکۆلەکەیم کرد. ئەمیش وەک دینارەکانی شوشەخانەکە هەمان قژی بریسکەداری پێوەبوو، ڕەنگی پێستیشی وەک ئەوان سپی هەڵگەڕاوبوو. پاش نەختێک گوتم؛
«بمبوورە بەڵام من ئەو دیالێکتە تێناگەم. ئەرێ ئەوە هۆڵەندیە؟»
ئەوجا کوڕە بچکۆلەکە سەیرێکی کردم و بەچاوێکی پڕ لەهێزەوە گوتی؛
«تەنها پاشاکان و کچەکان و کوڕەکان هونەری قسەکردن بە هەردوو بارەکەدا دەزانن. لەکاتێکیشدا کە تۆ لەو جۆرە قسانە تێنەگەیت، کەواتە نرخت لە من کەمترە»
بۆ ماوەیەک وەستام و بیرمەدەکردەوە، خۆم بە خۆمم دەگوت "بڵێیت کوڕەکە بە پێچەوانەوە وشەکانی گوتبێت؟"
«تموتک»... دەبوو بە «کتومت». دوو جاریش گوتی «نامەگێڕ ەواردەنێپ یساب ناکەزەغاک نیەکب». ئەگەر هەموو وشەکانم لە شوێنی خۆیاندا هەڵبگێڕایاتەوە، ئەوا دەبوو بە «ڕێگەمان پێنەدراوە باسی کاغەزەکان بکەین»
پاشان گوتم؛





تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«ڕێگەمان پێنەدراوە باسی کاغەزەکان بکەین»
لەوێدا وەک ئەوەی وریابێتەوە وابوو و پاش ماوەیک پرسی؛
«یەئ ۆب سیاب تیەکەد؟»
زۆر بەدڵنیاییەوە وەڵامم دایەوە و گوتم؛
«ۆب یەوەئ تیقات ەوەمەکب!»
ئەوجا دەموچاوی ئەو گۆڕا و لە کەسێک دەچوو کە تازە لە مانگەوە کەوتبێتە خوارەوە.
«من بۆیە پرسیارم لێکردیت چ پاشایەک دەسەڵاتی بەدەستەوەیە، تەنها بۆ ئەوەی بزانم وەڵامم دەدەیتەوە یان نا. بەڵام تۆ نەتتوانی ئەو هونەرە ڕابگریت و لێرەشەوە یاساکانت شکانت»
ئەویش وەڵامی دامەوە و گوتی؛
«ئەمە بێشەرمترین شتە کە لە ژیانمدا گوێم لێبووبێت»
«بەڵێ، بەڵێ. لەوانەیە لەوە بێشەرمتریش ببیستیت»
«نۆچ؟»
لەویادا گوتم؛
«من باوکم ناوی "ئۆتۆە"ە. ئەتوانیت ئەو ناوە بە پێچەوانەوە بڵێیت؟»
تەماشایەکی کردم و گوتی؛
«ئۆتۆە"»
منیش گوتم؛
«تەواوت گوت. دەتوانیت بە پێچەوانەوە بیڵێیت؟»
دیسانەوە گوتیەوە؛
«ئۆتۆە»
منیش دیسانەوە گوتمەوە؛
«ڕاستدەکەیت، بەڵام حەزدەکەم بە پێچەوانەوە بیڵێیت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



کوڕەکە توڕەبوو و گوتی؛

«ئۆتۆء، ئۆتۆء!»

ویستم کەمێک هێمنی بکەمەوە و گوتم؛

«هەروا بۆ تاقیکردنەوە بوو. حەزدەکەیت وشەیەکی درێژتر تاقیبکەیتەوە؟»

لە وەڵامدا گوتی؛

«مشێپ شۆخ تێبەدا!»

«دەتوانیت بە پێچەوانەوە بڵێیت "مامی مام"»

کوڕەکەش گوتی؛

«مامی مام»

دەستێکم بادا و گوتم؛

«بەپێچەوانەشەوە هەر هەمان وشە دەڵێیتەوە»

دیسانەوە کوڕەکە گوتیەوە؛

«مامی مام»

«سوپاس، هێندەمان بەسە. ئەی دەتوانیت وشەیەکی زۆر درێژتر بە پێچەوانەوە بڵێیت؟»

«ناموگێب!»

«باشە، بزانم دەتوانیت بڵێیت "مامی باب و بابی مام"»

کوڕەکە یەکسەر گوتی؛

«مامی باب و بابی مام»

«تەواوە. ئەی پێچەوانەکەی چیە؟»

دیسانەوە گوتیەوە؛

«مامی باب و بابی مام»

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و گوتم؛





«تۆ تەنها لاسایی من دەکەیتەوە و هیچی تر. پێموابێت هێندەمان بەسە، چونکە ناتوانیت بە پێچەوانەوە بیڵێیت»

کوڕەکە هاواریکرد و دیسانەوە گوتی؛

«مامی باب و بابی مام!»

کەمێک بەزەییم پێدا دەهاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو خۆی ئەو جۆرە گاڵتەوگەپەی دامەزراند نەک من.

پاش نەختێک شمشێرەکەی دەرهێنا، کێشای بە بتڵێکدا و بەر دیوارێکی دارین کەوت و وردوخاشبوو. لەو کاتەدا هەندێ لە "کوپ"ەکان بەوێدا تێدەپەڕین، کەمێک چاویان داپچڕی و دواتریش بەپەلە ڕوویان وەرچەرخاندەوە.

دیسانەوە لە دڵی خۆمدا گوتم "ئەم دوورگە گەورەیە دەبێت پەناگەی کۆمەڵێک کەس بێت کە نەخۆشی مێشکیان هەیە و چاکبوونەوەیان نیە. بەڵام ئەی بۆچی هێندە بچکۆلەن؟ بۆ بە ئەڵمانی قسەدەکەن؟ لەسەرو هەموو شتێکیشەوە؛ بۆچی هەروەک یاری کاغەز بەسەر ڕەنگ و ژمارەدا دابەشکراون؟"

لەلای خۆمەوە بڕیارمدا واز لە کوڕی دینار نەهێنیم هەتاوەکو ئەو کاتەی هەموو شتێکم بۆ ڕووندەکاتەوە. تەنها ئەوەندەم لەسەربوو کە بەشێوەیەکی ڕوون و ڕەوان قسەنەکەم، چونکە گرفتی کورتەبنەکان لەو کاتەدا دەردەکەوت کە بە ڕوونی قسەم لەگەڵدا دەکردن، لەبەرئەوە گوتم؛

«من هێندە نابێت هاتوومەتە ئێرە، وە پێشموابوو هەروەکو سەر مانگ چۆڵ و هۆڵ بێت. ئێستاکەش زۆرم پێخۆشە بزانم ئێوە کێن و خەڵکی کوێن؟»

کوڕەکە هەنگاوێک گەڕایەوە دواوە و بەنائومێدیەکەوە گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«تۆ جۆکەرێکی نوێیت؟»
منیش لەوەڵامدا گوتم؛
«نەمزانیبوو ئەڵمانیا کۆڵۆنیەکی لەناو ئۆقیانووسی ئەتلانتیدا هەیە. لە ڕاستیدا من سەفەرم بۆ چەندەها وڵاتکردووە، بەڵام ئەمە یەکەمین جارە مرۆڤی هێندە بچکۆلە ببینم»
«تۆ جۆکەرێکی نوێیت. "ناتیەش!" ئەترسم لەناکاودا چەند جۆکەرێکی تریش دەرکەون. بەڵام بەهیچ جۆرێک ڕێی تێناچێت هەر ڕەنگەو پێویستی بە جۆکەرێک هەبێت»
«وا مەڵێ. ئەگە جۆکەر تەنها کەسبێت کە بتوانێت گفتوگۆیەکی ڕێکوپێک بکات، ئەوا ئەو کاتە واباشتربوو هەمووان جۆکەربن، بەو شێوەیەش ئەم یاری کاغەزە باشتر دەچوو بەڕێوە»
هەوڵیدا پاڵێکم پێوە بنێت و گوتی؛
«وەڵامدانەوەی ئەو هەموو پرسیارە جۆراوجۆرانە تا ئەو پەڕی ڕادە هیلاک و ماندووم دەکات»
دەمزانی سەختە شتێکی لێ هەڵبکرێنم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیسانەوە هەوڵمدایەوە و گوتم؛
«کەواتە ئێوە هەروا بە هێواشی لەسەر دوورگەیەکی سەیروسەمەرەی ناو ئۆقیانووسی ئەتلانتیدا دەخولێنەوە و هیچی تر. ئەی بەلاتانەوە گرنگ نیە گەر بە شێوەیەک لە شێوەکان بزانن ئێوە لە کوێوە هاتوونەتە ئێرە؟»
«با بڕوات!»
«چیت گوت؟»
«تۆ یاریەکەت وەستان. تۆ وەستاندت و منیش دەڵێم بابڕوات!»



پاش ئەوە بتڵێکی بچکۆلەی لە گیرفانی بەرباخەڵەکەیدا دەرهێنا و قوومێکی لێدا، هەمان ئەو خواردنەوە بریقەدارەی تێدابوو کە لەوەوپێش سینەکەکان خواردیانەوە. سەری بتڵەکەی نایەوە و دەستێکی بادا، پاشان هەروەک ئەوەی دێڕی یەکەمی شیعرێک بخوێنێتەوە، بەدەنگێکی ڕوون و بەرز گوتی؛
«کەشتیە چارۆکەدارەکە بە بارە زیوەکەیەوە لەناو دەریای تورەدا نقووم دەبێت»
سەرێکم ڕاوەشاند و هەناسەیەکی ساردم بۆ هەڵکێشا. هەستم دەکرد ئەویش پاش نەختێک خەوی لێدەکەوێت. ئەو کاتەش دەبوایە خۆم پاشای قەرەم بدۆزیبایەتەوە. لە هەمان کاتیشدا پێم وانەبوو بتوانم شتێکی زیدەتر لەو لێدەربهێنم.
لەناکاوکدا شتێکم بەخەیاڵدا هات، شتێک کە لەوەوپێش یەکێک لە سینەکەکان گوتی. تا ڕادەیەک وەک ئەوەی لەگەڵ خۆمدا قسەبکەم گوتم؛
«بزانم دەتوانم "فرۆد" بدۆزمەوە...»
قسەکەم یەکسەر وزەیەکی زیاتری بە کوڕی دینار بەخشی. لەسەر کورسیەکە بەرزبووەوە و دەستی ڕاستی بەرزکردەوە، هەروەک ئەوەی سەربازێک بێت و پێیان گوتبێت "وریابە!"؛
«گوتت "فرۆد"؟»
سەرێکم بۆ لەقاند و گوتم؛
«دەتوانیت بم بەیت بۆ لای ئەو؟»
«ناموگێب!»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



هواش هێواش بەناو خانووەکاندا کەوتینە رێ. پاش نەختێک گەیشتینە سەر گۆڕەپانێک. لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا بیرێکی گەورەیان لێدابوو. هەشت و نۆی کوپ سەتڵێک ئاویان لە بیرەکەوە هەڵدەهێنجا. کراسە سوورە تۆخەکانی بەریان لە گۆڕەپانەکەدا دەدرەوشایەوە.
هەر چوار پاشاکەش لەبەردەم بیرەکەدا لەشێوەی بازنەیەکدا وەستابوون و دەستیان خستبووە سەر شانی یەکتری. لەوەدەچوو فەرمانێکی زۆر گرنگ تاوتوێبکەن. بیرمدێت لەو کاتەدا وای بۆچووم کە بوونی چوار پاشا شتێکی کردەنی (عەمەلی) نەبێت. ڕەنگی چاکەتەکانیشیان هەروەک ڕەنگی چاکەتی کوڕەکان وابوو، تەنها ئەوەندەبوو کە جوانتربوون و هەر یەکەشیان بە شانازیەوە تاجێکی ئاڵتونیان لەسەر سەریان دانابوو.
کچەکانیش لە گۆڕەپانەکەدابوون. لەنێوان خانووەکاندا دەهاتن و دەچوون، بەردەوام یەکی ئاوێنەیەکی پچکۆلەیان دەردەهێنا و تەماشای خۆیان دەکرد. هەر دەتگوت یەک و دوو لەبیریان دەچێتەوە کە کێن و دەموچاویان چۆنە، هەر بۆیە زوو زوو تەماشای خۆیان دەکرد. کچەکانیش تاجیان بەسەرەوە بوو، بەڵام کەمێک لە تاجەکانی پاشاکان درێژتر و تەنەکتربوو.
لە پشتی پشتەوەدا چاوم بە پیاوێکی پیر کەوت، قژێکی کاڵ و ریشێکی سپی درێژی هێنابووە خوارەوە. لەسەر بەردێکی گەورە دانیشتبوو و پایپی دەکێشا. ئەو شتەی لە هەموو شتێکی دی زیاتر سەرنجمی ڕاکێشا، باڵای بوو؛ باڵای ڕێک هێندەی باڵای من دەبوو. بەڵام لەشولاری تەنها شت نەبوو کە لە کورتەبنەکانی جودادەکردەوە. پیاوە پیرەکە کراسێکی خوری خۆڵەمێشی و پانتۆڵێکی قاوەیی فشی





لەبەردابوو. جلوبەرگە ساکار و هەژارەکەی ڕێک پێچەوانەی جلە پڕ ڕەنگ و ڕێکوپێکەکانی کورتەبنەکان بوو.
کوڕەکە ڕێک بەرەولای ڕۆیشت و منی پێناساند و گوتی؛
«گەورەم... ئەمە جۆکەرێکی نوێیە»
لەوەندە زیاتری نەگوت و لەبەر هیلاکی و ماندوویی ڕێک لە گۆڕەپانەکەدا خەوی لێکەوت. پێموابێت خواردنەوەی ناو شوشە بچکۆلەکە شەکەتیکردبوو.
پیاوە پیرەکە یەکرا لەسەر بەردەکە بەرزبووەوە. هەر تەماشای دەکردم و هیچی نەدەگوت. دواتر کەوتە دەستلێدانم. لەپێشدا دەستێکی هێنا بە کوڵمەکانمدا، دواتر بەهێواشی قژی ڕاکێشام و دەستێکی بە جلوبەرگە دەرپاییەکانمدا هێنا. دەیوست دڵنیابێت کە من مرۆڤێکی ڕاستەقینەم و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووم. پاش ماوەیەک بە سەختیەکەوە گوتی؛
«ئەمە... ئەمە خراپترین شتە کە بینیبێتم»
مینش دەستم بۆ تەوقەکردن بۆ ڕاکێشا و گوتم؛
«وابزانم تۆ ناوت "فرۆد"ە»
بەتووندی دەستی گوشیم و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش هەر بەرینەدەدا. لەناکاودا هەروەک ئەوەی شتێکی ناخۆشی بەخەیاڵدا هاتبێت گوتی؛
«دەبێت هەر خێرا ڕێگەیەک بدۆزینەوە و خۆمان لەم لادێیە قورتاربکەین»
بەلای منەوە ئەمیش هەروەک هەموو ئەوانی تر شێرزە دەهاتە بەرچاو. بەڵام بەلایەنی کەمەوە ئەم لەچاو ئەوانی دیدا زیاتر منی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



بەلاوە گرنگبوو. ئەو خاڵەش خۆی لە خۆیدا هەندێک ئومێدی پێبەخشیم.
پیاوە پیرەکە بە نەرمە ڕاکردن بەرەو دەرەوەی لادێکە هەڵهات، چەند جارێکیش خەریکبوو سەرسمبدات.
دیسانەوە لەسەر بەرزەڵانەکەدا چاوم بە هەمان کوخە دارینەکە کەوتەوە کە بەتەنیا و بەدەر لە هەموو ئاواییەکە دروستکرابوو. پاش کەمێک گەیشتینە بەردەمەکەی، بەڵام نەچووینە ژوورەوە. پیاوە پیرەکە داوای لێکردم لەسەر کورسیەکی بچکۆلە دابنیشم.
هەر کە دانیشتم، کەسێکی سەیروسەمەرە لە سوچێکی خانوەکەوە سەری دەرهێنا. جلێکی وەنەوشەیی لەبەردابوو، کڵاوێکی ڕەنگ زەرد و سووری پەڕەپەڕەی لە سەردابوو. چەند زەنگۆڵەیەکیش بە جلە وەنەوشەییەکەی و کڵاوە ڕەنگاوڕەنگەکەیەوە بوو، هەر چۆنێک دەجوڵایەوە زەنگۆڵەکان زرنگەیان دەهاتەوە.
خۆی هەڵدایە لامەوە. لەپێشدا نوقورچێکی لە گوێچکەم گرت، دواتر بە هێواشی دەستێکی کێشا بە سکمدا.
پیاوە پیرەکە وەک فەرمانێک پێیگوت؛
«جۆکەر... تۆ بڕۆ بۆ ناو لادێکە!»
کوڕە پچکۆلەکە خەندەیەکی مەکراوی کەوتە سەر لێوانی و زۆر بە توونديەوە گوتی؛
«باشە، باش! لەدواجاردا میوانێک لە وڵاتەوە دەگاتە ئێرە، کەچی بەڕێزتان برادەرە کۆنەکانی پشتگوێدەخات. جۆکەر دەڵێت ئەمە هەڵسوکەوتێکی ترسناکە. وا باشترە ئەم قسانەی منتان لەیاد بێت»
پیاوە پیرەکە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی؛





«وابزانم سەرت قاڵە و دەبێت بۆ ئاهەنگەکە بیر لە چەندەها شتی جیاواز بکەیتەوە»
کوڕەکە پڕبوو لە وزە و یەک دوو جار گورجوگۆڵ لەشە باریکەکەی هەڵدا بە ئاسماندا و گوتی؛
«بێگومان وایە بەڵام نابێت هیچ شتێک هەروا بە ئاسانی وەربگرین»
چەند هەنگاوێک خۆی هەڵدایە دواوە و گوتی؛
«کەواتە لێرەدا کۆتایی بە باسەکەمان دێنین، بەڵام جارێکی تر یەکتر دەبینینەوە!»
ڕێک پاش ئەوە بە گردەکەدا بەرەو لادێکە چووە خوارەوە و دیارنەما.
ئەوجا پیاوە پیرەکە لە تەنیشتمەوە دانیشت. لەسەر کورسیەکەوە هەموو ئەو کورتەبنە پڕ ڕەنگانەمان دەبینی کە لە نێوان کوخە قاوەییەکاندا دەخولانەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

## حەوتی سینەک

### ...ئەم دەزانی بە چ شێوەیەک مینا و عاج لە دەمی مندا دێنە دەرەوە...

هەتا نیوەشەو هەر بەپاڵکەوتنەوە کتێبەکەم دەخوێندەوە. بۆ بەیانیش لە پڕێکدا خەبەرم بووەوە و لەسەر جێگاکەم بەرزبوومەوە. گڵۆپی سەر جێگاکەم هێشتام هەر دەسوتا. ئەوجا بۆمدەرکەوت کە شەوێ بەدەم خوێندنەوەوە خەوم لێکەوتووە و کتێیب و زەڕەبینەکەشم هەر بەدەستەوەبووە.

بەڵام کە باوکمم بینی هێشتام هەر خەوتووە، ئیدی کەمێک هێوربوومەوە. زەڕەبینەکەم لەسەر سەرینەکەم بوو، بەڵام کتێبە بچکۆلەکەم نەدەبینی. لە پاش گەڕانێکی باش لەژێر جێگاکەمدا دۆزیمەوە. هەر بەپەلە خنیم بە گیرفانی پانتۆڵەکەمدا.

هەموو شتێکم بەتەواوەتی شاردەوە و پاشان لەسەر جێگاکەم هاتمە خوارەوە.

هەموو ئەو شتانەی بەر لە خەوتنم خوێندمەوە بە تەواوەتی نائارامی کردبووم، بەشێوەیەک کە لە هەموو لەشمدا هەستم پێدەکرد.

پەردەکەم لادا و لەبەردەم پەنجەرەکەدا وەستام. هەتا چاوبڕبکات هەر تەنها دەریام دەبینی. تاکوتەرا بەلەمی بچکۆلە دیاربوون، بەڵام هیچ جۆرە پاپۆڕێکم نەدەدی کە بێن و بچن. خەریک بوو خۆر هەڵدەهات، ڕەنگی سووری خۆر لە ئاسۆوە وەک پشتوێنێکی باریک لەنێوان ئاسمان و دەریادا دەردەکەوت.

خۆم بەخۆمم دەگوت "ئاخۆ نهێنی ئەو هەموو کورتەبنانەی سەر دوورگە خەیاڵیەکە چی بێت؟" بێگومان نەمدەتوانی لە ڕاست و





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

دروستی هەموو ئەو شتانەی دەمخوێندەوە دڵنیابم. بەڵام هەموو ئەو شتانەی دەربارەی لودفی و ئەلبێرتم دەخوێندەوە لە دۆرفدا زۆر ڕاستەقینە دەهاتنە بەرچاوم.

هیچ گومانێکی تێدا نەبوو کە ساردیە ئەرخەوانیەکە و هەموو ماسیە پرتەقاڵیەکان دەبێت لەو دوورگەیەوە هاتبن کە "هانس"ی نانەوا ڕووی تێکردبوو. خۆشم بەچاوی خۆم شوشەیەکی ماسیم لە نانەواخانە پچکۆلەکەی دۆرفدا بینی و ماسیەکی پرتەقاڵیشی تێدا بوو. ڕاستە من تامی ساردیە ئەرخەوانیەکەم نەکرد، بەڵام نانەوا پیرەکە بتلێک ئاوی هەرمێی دامێ، دواتر گوتی ساردیەکی تر هەیە کە تامەکەی یەکجار لەوە خۆشترە...

بەڵام خۆ ڕێشیتێدەچێت کە هەر هەمووی هەڵبەستراوبێت. لەوانەیە هەر لە بنەڕەتدا شتێک نەبێت کە ناوی ساردیە ئەرخەوانیەکە بێت، لەوەشە هەموو نووسراوەکانی ناو کتێبە بچکۆلەکە تەنها فەنتاسیا بێت و هیچی تر. هیچ شتێکی سەیریشی تێدا نیە کە نانەواکەی دۆرف پەنجەرەی ناو نانەواخانەکەی بە ماسیەکی پرتەقاڵی ڕازانبووەوە.

بەڵام بەڕاستی سەیربوو کە کتێبێکی بچکۆلەی لەناو سەمونێکدا شاردبووەوە و دواتریش بە ڕێبوارێکی ڕێکەوتی بەخشی. لە هەموو بارێکدا شتێکی بەتوانا و دانسقەبوو کە کتێبێکی تەواو بەو پیتە بچکۆلانانە بنووسرێت. بەدەر لەوانەش شتێکی تر هەبوو کە نەمدەتوانی لە مێشکمی دەربهێنم؛ ڕێک پێش ئەوەی کتێبەکەم بدەنێ، کورتەبنەیەکی پڕنهێنی زەڕەبینێکی پێبەخشیم.

ئەو بەیانیە تەنها ئەو وردەکاریە تەکنیکیانە سەریان قاڵنەکردبووم، بەڵکو لە ڕاستیدا مێشکم لەلایەکی تریشەوە ورووژابوو. لەپڕێکدا



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



هەستمکرد مرۆڤەکانی سەر زەویش کتومت هەروەک کورتەبنە سستەکانی سەر ئەو دوورگە خەیاڵییە بێئاگان.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت "ئێمە ژیانێکی سەیروسەمەرە بەسەردەبەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵکی ژیان و جیهان وەک شتێکی "ئاسایی" وەردەگرن". لە هەمان کاتیشدا بەردەوام بەدوی شتی نائاسایی دەکەون _هەروەک پەریەکانی ئاسمان و خەڵکانی مەریخ. بەڵام ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان بەئاگانین لەوەی ژیان خۆی لە خۆیدا مەتەڵێکە. من خۆم بەتەواوەتی بەشێوەیەکی جیاواز هەستدەکەم. من پێموایە جیهان وەک خەونێکی سەیر وابێت. ڕێک هەوڵیش دەدەم کە لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ چۆنیەتی ڕوودانی شتەکان بدۆزمەوە.

هەروا وەستابووم و تەماشای ئاسمانم دەکرد، بەرە بەرە سوورتر و سوورتر دەبوو، دواتریش ڕووناکتر و ڕووناکتر بۆوە. لەو کاتەدا لە هەموو لەشمدا هەستم بە شتێکی سەیرکرد کە هەرگیز لەوەوبەر هەستم پێنەکردبوو، وە لەو کاتەشەوە تا ئێستاش هەر لەگەڵمدایە؛ لەو کاتەدا کە لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەستابووم، هەستم دەکرد بوونەوەرێکی پڕنهێنیم، هەستم دەکرد پڕ لە وزە و ژیانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچم دەربارەی خۆم نەدەزانی. دەمزانی بوونەوەرێکی زیندووی سەر یەکێک لە ئەستێرەکانی "ڕێی کاکێشان"م. من دەمێک بوو ئەوەم دەزانی... هەڵبەتە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی پەروەردەکردنم، بۆ من ئاسان نەبوو چاوم لە ئاستی ئەو بابەتانەدا بنوقێنم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە یەکەمین جاربوو کە خۆم ئەو هەستەم هەبێت، وە لەوە بەدواشەوە لە هەموو خانەیەکی لەشمدا ڕەگی داکوتا.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەشی خۆمم وەک شتێکی سەیر و نامۆ دەبینی. لە دڵی خۆمدا دەمگوت "چۆنە ئاوها لەم کابینەیەدا وەستاوم و ئەو هەموو ئەندێشە سەیروسەمەرانە بە مێشکمدا دێن و دەچن؟ قژ و نینۆکی من بە چ شێوەیەک ڕواون؟ ئەی دانەکانم! نەم دەزانی بە چ شێوەیەک مینا و عاج لە دەمی مندا دێنە دەرەوە و گەورەدەبن، تێنەدەگەیشتم بە چ شێوەیەک ئەو شتە ڕەقانەش بەشێک بوون لە من. بەڵام پێم وابوو کەم کەس بەر لەوەی بڕۆنە لای دکتۆری ددان بیر لەوە بکەنەوە.

وەک مەتەڵێک دەهاتە بەرچاوم کە خەڵکی بەم جیهانەدا دێن و دەچن و بەلامەوە سەیربوو کە ناپرسن کێن و لە کوێوە هاتوون. شێوەی سەرهەڵدانی ژیانیش لەسەر ئەم ئەستێرەیە، شتێکبوو کە خەڵکی یان چاویان لە ئاستیدا دادەخست یاخود بە شتێکی ئاساییان دادەنا.

هەموو ئەو ئەندێشە و هەستانەی سەری قاڵکردبووم، بەشێوەیەک لە شێوەکان هەم دڵخۆشی دەکردم و هەم دڵیشی تەنگدەکردم. لەهەمان کاتیشدا وایان لێکردم هەست بە تەنهایی بکەم... جۆرە تەنهاییەک کە هەستێکی خۆشی پێدەبەخشیم.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشبوو کە باوکم لە پرێکدا نەڕەیەکی لێبەرزبووەوە. بەر لەوەی لە جێگاکەیدا بێتە دەرەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت گرنگە شتەکانی چواردەورمان بە چاوێکی کراوەوە ببینین، بەڵام هیچ شتێک لەوە گرنگتر نیە کە لەگەڵ مرۆڤێکدا بیت کە خۆشت دەوێت... باوکم گوتی؛

«هەر وازوو هەستاویت؟»

ڕێک لەو کاتەدا کە خۆر لەئاسۆی دەریاوە بەرزدەبووەوە، سەری کردە ئەو دیو پەردەکەوە و منیش گوتم؛

«خۆریش هەستاوە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

بەو شێوەیەش ئەو بەیانیە دەستیپێکرد و دەبوایە هەموو ڕۆژەکەشمان لەناو دەریادا بەسەرببردایە.



www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

## هەشتی سینەک

### ...ئەگەر مێشکمان هێندە سادە بوایە کە بمانتوانیبایە لێی تێبگەین...

لە کاتی نانخواردنی بەیانیدا چەند باسێکی فەلسەفی بچوک هاتە پێشەوە. باوکم هەروا بۆ خۆشی پێشنیارێکی کرد؛ گوتی با کەشتیەکە داگیربکەین و یەکە یەکە لە خەڵکەکە بپرسین و بزانین کەس هەیە کە بتوانێت کەمێک تیشک بخاتە سەر نهێنی ژیان. ئەوجا گوتی؛

«لێرەدا بوارێکی تایبەتی و نایابمان لەبەردەستدایە، چونکە ئەم کەشتیە وەک شێوەیەکی بچکۆلەکراوەی هەموو مرۆڤایەتی وایە. لێرەدا زیاتر لە هەزار گەشتیار دەبین و لە هەموو سوچ و قوژبنێکی جیهانیشەوە هاتووین. بەڵام هەموومان لەناو هەمان پاپۆڕداین، هەموومان هەمان کەشتی بەرزیکردووینەتەوە...»

ئاماژەی بۆ هۆڵی نانخواردنەکە کرد و گوتی؛

«لەوێدا دەبێت کەسێک هەبێت کە شتێکی وا بزانێت کە ئێمە نەیزانین. لەنێو ئەم هەموو کاغەزە نایابانەی دەستەکەماندا بەلایەنی کەمەوە خۆ دەبێت جۆکەرێکی هەر تێدا بێت!»

لەوێدا تەماشایەکم کرد و گوتم؛

«دوو جۆکەر هەیە»

هەر بە زەردەخەنەکەی باوکمدا زانیم کە لەمەبەستم تێگەیشت.

دواجاریش گوتی؛

«واباشترە هەموو خەڵکانی سەر کەشتیەکە کۆبکەینەوە و دانە دانە لێیان بپرسین؛ تۆ بۆچی دەژیت؟ ئەوانەش کە وەڵامیان لانیە، هەقە فڕێیان دەینە خوارەوە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





منیش لێمپرسی؛
«ئەی منداڵەکان؟»
«ئەوان هەر زۆر بەباشی لەو تاقیکردنەوەیەدا دەردەچن»
لەلای خۆمەوە بڕیارمدا لەماوەی ئەو پێش نیوەڕۆیەدا چەند تاقیکردنەوەیەکی فەلسەفی بە ئەنجام بگەیەنم. لەپێشدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەناو مەلەوانگەکەدا مامەوە، دواتریش لەئاوەکەدا هاتمە دەرەوە و بۆی دانیشتم. باوکم ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانی دەخوێندەوە و منیش هەروا تەماشای ئەو هەموو خەڵکەم دەکرد.
هەندێکیان کرێمی خۆریان لە سەرتاپای لەشیان هەڵدەسوو، هەندێکی تر کتێبی هەرزان و پچکۆلەی فەرەنسی و ئینگلیزی و یابانی و ئیتاڵیان دەخوێندەوە. چەند کەسانێکیش دانیشتبوون بیرە و هەندێ مەشروبی سووری ساردیان دەخواردەوە و بەپەرۆشەوە لەگەڵ یەکدیدا قسەیاندەکرد. چەند منداڵێکیشی لێبوو. منداڵە گەورەکان هەروەک کەسە گەورەکانی تر لەبەر خۆردا دانیشتبوون، ئەوانەش کە تەمەنیان کەمترێکبوو لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر ڕایاندەکرد و لە جانتا و شتومەکی سەر ڕێگاکە هەڵدەکەوتن. منداڵە هەرە بچوکەکانیش لەسەرباوەشی کەسوکاریان دانیشتبوون و خۆیان تێهەڵدەسوون، منداڵێکی ساوام بینی شیری دایکی دەمژی. منداڵەکە و دایکەکەشی هێندە بەڕاشکاوی بۆی دانیشتبوون، هەر دەتگوت لە چێشتنخانەکەی ماڵی خۆیاندا دانیشتوون.
لەدڵی خۆمدا دەمگوت "ئەو هەموو خەڵکە کێن؟ بە چ شێوەیەک هاتوونەتە بوون؟ ئەی بڵێیت جگە لە من و باوکم، کەسی تر هەبێت ئەو جۆرە پرسیارانە بکات؟"



هەر دانیشتبووم و پۆل پۆل تەماشای هەموویانم دەکرد، دەمویست ڕازێک یان نهێنیەکیان تێدا ببینمەوە. خۆم بەخۆمم دەگوت ئەگەر خودایەک هەبێت و هەموو هەڵسوکەوت و جوڵەی ئەمانی لەدەستدا بێت، کەواتە پاش لێوردبوونەوەیەکی بەگوڕی جوڵە و هەڵسوکەوتیان چەند شتێکم بۆ ڕوونەدەبێتەوە.
لەڕاستیدا دەمتوانی سوود لە خاڵێکی گرنگ وەربگرم؛ ئەگەر لەکاتی وردبوونەوەمدا شتێکی سەرنجڕاکێش بهاتایەتە بەرچاوم، ئەوا هەتا ئەو کاتەی دەگەیشتینە "پاتراس" نەیدەتوانی لەبەر دەستمدا دەربچێت. بەو شێوەیەش وردبوونەوە لە خەڵکانی سەر کەشتیەکە ئاسانتربوو لە وردبوونەوە لە ئەسپێیەکی چالاکی سەرگەڵایەک و سیسرکێکی ئێرە و ئەوێ.
هەندێ خەڵکم دەدی دەستیان بادەدا. هەندێکی تریش لە سەر کورسی درێژ درێژ پاڵکەوتبوون، هەڵدەستان و قاچیان ڕادەکێشا. پیاوێکی پیرم بینی لە ماوەی یەک دەقەدا چوار پێنج جار چاویلکەکەی داکەند و لەچاوی کردەوە.
بەئاسانی دەمبینی کە خەڵکی سەر کەشتیەکە خۆیان نەیاندەزانی کە چی دەکەن، لە هەموو جوڵەیەکی بچکۆلەی خۆیان بەئاگانەبوون. مەبەستم لەوەیە زیاتر ژیانیان پێوەدیاربوو نەک ئاگایی.
لە هەموو شتێک زیاتر شێوەی جوڵەی پێڵوی چاوی خەڵکەکە سەرنجی ڕاکێشام. بێگومان هەموویان چاویان دەتروکاند، بەڵام وەک یەک زوو زوو نەیاندەتروکاند. شێوەی جوڵانی ئەو پێڵوە پچکۆلانانەی سەر چاویانم بەلاوە سەیربوو، هەر خۆیان بۆ خۆیان بەرز و نزم دەبوونەوە. کەرەتێک لەوەوپێش چاوتروکاندی پەرەندەیەکم بینیبوو، لەوە دەچوو کە مەکینەیەکی تێدابێت و کاری ڕێکخستنی تروکاندنی چاوی لە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



ئەستۆدابێت. کاتێکیش شێوەی چاوتروکاندنی ئەو هەموو خەڵکەی سەر پاپۆڕەکەم دەبینی، هەستمدەکرد ئەوانیش بە هەمان شێوەی میکانیزم چاویان بتروکێنن.

هەندێک ئەڵمانی ورگ زلیشم بینی، هەر لە بەرازی ئاوی دەچوون. لەبەرخۆرەکەدا پاڵکەوتبوون و یەکی کڵاوێکی سپیان تا ناوچەوانیان هێنابووە خوارەوە. بەدرێژایی ئەو پێش نیوەڕۆیە تەنها پاڵکەوتبوون و هیچی تریان نەدەکرد، هێندە نەبێت کە جارجارێک خۆیان بەکرێم چەوردەکرد. باوکم ناوی نابوون "ئەڵمانیە براتۆرست"ەکان. لەسەرەتادا وامزانی "براتۆرست" ناوی شارێکی ئەڵمانیە، بەڵام دواتر باوکم گوتی من بۆیە ئەو ناوەم لێناون چونکە حەزیان لە باسترمەیەکی چەورە و ناوی "براتۆرست"ە.

خۆم بەخۆمم دەگوت ئاخۆ "ئەڵمانیەکی براتۆرست" لەو کاتەدا کە ئاوها لەبەر خۆر پاڵکەوتووە، بیر لە چی بکاتەوە. پاش هەڵسەنگاندنێکی زۆر گەیشتمە ئەوەی کە بیر لە "براتۆرست" دەکاتەوە، چونکە بەڕاستی لەوە نەدەچوو کە بیر لە هیچ شتێکی تر بکاتەوە.

هەتا پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ لەسەر بیرکردنەوە فەلسەفیەکانم بەردەوامبووم. من و باوکم لەسەر ئەوە ڕێککەوتبووین کە بەدرێژایی ڕۆژەکە لەبەر لوتی یەکتردا نەبین. بەو شێوەیەش دەمتوانی بەئارەزووی خۆم بەسەر کەشتیەکەدا بسوڕێمەوە و هەموو شتێک بکەم، تەنها ئەوەندەبوو کە بۆم نەبوو خۆم هەڵدەمە ناو ئاوەکەوە.

لەلایەکی تریشەوە باوکم ڕێگەی پێدام کە دووربینەکەی بەکاربهێنم. یەک دوو جارێک لە دووربینەکەوە تەماشای هەندێ خەڵکم کرد. زۆرم بەلاوە خۆشبوو، چونکە دەبوایە بەدزیەوە سەیرمبکردنایە.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

بێشەرمترین شتیش لەو کاتەدا ڕوویدا کە دوای ئافرەتێکی ئەمریکی کەوتم. زۆر قەشەنگ و شێتانە دەهاتە بەرچاوم، هەستمدەکرد بتوانێت کەمێک زیاتر سروشتی مرۆڤم بۆ ڕوونبکاتەوە.

پاش نەختێک چووە سوچێکی ساڵۆنەکەوە و بۆ ئەوەی دڵنیابێت کە کەس نایبینێت، یەک دوو جار ئاوڕی دایەوە. منیش خۆم لەپشتی قەنەفەیەکدا شاردبۆوە و لەقەراغەکەیەوە زۆر بەوریاییەوە وە بەبێ ئەوەی بمبینێت تەماشام دەکرد. دڵەڕاوکێیەک گرتمی، بەڵام لەڕاستیدا لە خۆم نەدەترسام، بەڵکو زیاتر بیرم لەو دەکردەوە و لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بڵێیت چ شتێک بکات کە پێویستی بەو هەموو نهێنیکاریە بێت؟"

ئەوجا بینیم جزدانێکی مکیاجی سەوزی لە جانتاکەیدا دەرهێنا. ئاوێنەیەکی بچکۆلەی بەدەستەوە گرت. لەپێشدا لە هەموو گۆشە و لایەکەوە تێر تێر تەماشای خۆی کرد، پاشانیش کەوتە سووراوکردن.

پێمواوبوو هەر ئەو تۆزەی کە بینیم مانایەکی تایبەتی هەبێت بەلای فەیلەسوفێکەوە. بەڵام لەوەش زیاتر ڕوویدا؛ پاش ئەوەی لە سووراو و سپیاوکردن بووەوە، خۆش خۆش بۆ خۆی پێدەکەنی. لەوێشدا هەموو شتێک کۆتایی پێنەهات، نەخێر... بەرلەوەی ئاوێنەکەی بخاتەوە جانتاکەی، دەستێکی بەرزکردەوە و وەک ئەوەی خواحافیزبوون لە خۆی بکات، دەستی بۆ خۆی ڕاوەشاند و لە ئاوێنەکەوە تەماشای خۆی دەکرد. لە هەمان کاتیشدا زەردەخەنەیەکی گەورە کەوتە سەر لێوەکانی و چاوێکیشی لە خۆی داگرت!

دواتر لەناو ساڵۆنەکەدا لەبەرچاوم ونبوو ، منیش لەناو حەشارگەکەمدا بەتەواوەتی شەکەت و ماندوو بووبووم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





خۆم بە خۆمم دەگوت "چۆن دەستی بۆ خۆی ڕادەوەشاند؟" پاش کۆمەڵێک هەڵسەنگاندنی فەلسەفی گەیشتمە ئەوەی کە ئەو ئافرەتە دەشێت هەروەک "جۆکەرێکی ئافرەت" بەدەگمەندبێت. چونکە لەو کاتەدا کە دەستی بۆ خۆی ڕاوەشاند، دەبێت بەلایەنی کەمەوە بەئاگابووبێت لەوەی کە بوونی هەیە و دەژی. بەشێوەیەک لە شێوەکانیش لە هەمان کاتدا دوو کەس بوو؛ لەلایەکەوە ئافرەتێکبوو کە لە سالۆنەکەدا وەستابوو و سووراو و سپیاوی دەکرد و لەلایەکی تریشەوە ئافرەتێکبوو کە لە ئاوێنەکەدا دەستی بۆ خۆی ڕادەوەشاند.

من دەمزانی کە لە بنەڕەتدا ڕێگە نادرێت تاقیکردنەوە لەسەر مرۆڤ بکرێت، لەبەرئەوە چیتر دواینەکەوتم. بەڵام بۆ دەمەوئێوارە هەمان ئافرەتم بینیەوە و لەگەڵ چەند کەسێکدا یاری کاغەزێنی دەکرد، منیش ڕێک چوومە لایەوە و بە ئینگلیزی پێم گوت؛

«جۆکەرەکەم پێدەبەخشی؟»

ئافرەتەکەش جۆکەرەکەی دەرهێنا و گوتی؛

«فەرموو»

لەو کاتەدا کە جێم هێشت دەستێکم بۆ بەرزکردەوە و بۆم ڕاوەشاند، لە هەمان کاتیشدا چاوێکم لێداگرت. ئافرەتەکەش لە سەرلێشێواویدا خەریکبوو لەسەر کورسیەکەی بکەوێتە خوارەوە. لەوەدەچوو بەخەیاڵی ئەو، من پەیم بە نهێنیە بچکۆلەکەی بردبێت. ئەگەر بەتەواوەتی دڵنیا بوایە لەوە، ئەوا گومانم نیە پاش گەڕانەوەشی بۆ ئەمریکا هەر پێی ناخۆشدەبوو.

بەڕاست... ئەوە یەکەمین جارمبوو کە خۆم سواڵی جۆکەرێک بکەم.



من و باوکم لەوەپێش لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبووین کە بەر لەنانخواردنی ئێوارە لەناو ژوورەکەماندا یەکبگرینەوە. هەموو شتێکم بۆ نەدەرکاند، بەڵام هێندەم پێگوت کە چەند سەرنجێکی گرنگم لادروستبووە. لەکاتی نانخواردنی ئێوارەشدا گفتوگۆیەکی سەرنجڕاکێش و خۆشمان سازدا؛ باسی مرۆڤمان دەکرد و دەمانویست بزانین مرۆڤ چیە.

من بەلامەوە سەیربوو کە ئێمەی مرۆڤ لە چەندین بواردا زۆر زیرەکین _هەروەک لەبواری پشکنینی ئاسمان و پێکهاتەی ئەتۆمدا- و کەچی لەهەمان کاتدا چیتر خۆمان لە خۆمان تێناگەین. باوکیشم لەم بارەیەوە شتێکی زۆر زیرەکانەی گوت و بەڕاستی شایانی ئەوەیە لێرەدا وشە بە وشەی بڵێمەوە؛

«ئەگەر مێشکمان هێندە سادە بوایە کە بمانتوانیبایە لێی تێبگەین، ئەوساکەش هێندە بێئەقڵ دەبووین کە نەماندەتوانی لێی تێبگەین»

بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دانیشتبووم و بیرم لەو ڕستەیە دەکردەوە. لە دواجاردا پێمواببوو قسەکەی تا ڕادەیەک وەڵامێکی پڕاوپڕی ئەو پرسیارەی دابێتەوە کە من لە خەیاڵمدابوو.

دواتر باوکم درێژەی بە قسەکانیدا و گوتی؛

«لە سروشتدا چەندەها مێشکی ساکارتر هەیە لە مێشکی ئێمە. بۆ نمونە ئێمە دەتوانین بزانین مێشکی کرمێک بە چ شێوەیەک کاردەکات _بەلایەنی کەمەوە بەشێکی دەزانین. بەڵام کرمەکە خۆی لەوە تێناگات، چونکە مێشکی هەر زۆر سادەیە»

ئەوجا من گوتم؛

«باشە بڵێیت خودایەک هەبێت کە لە ئێمە تێبگات؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



باوکم داچڵەکی. وابزانم سەری لەوە سوڕما کە من پرسیارێکی ئاوها زیرەکانەم خستەڕوو. پاش نەختێک گوتی؛

«لەوانەیە... بەڵام ئەگەر هەبێت، ئەوا دەبێت هێندە کەسێکی ئاڵۆزبێت کە نەتوانێت خۆی لە خۆی تێبگات»

دەستێکی بەرزکردەوە و داوای بیرەیەکی کرد. پێش ئەوەی بیرەکەی بگات هەر دانیشتبوو و دەیفەلسەفاند. لەو کاتەدا کە بیرەکەیان بۆ هێنا، باوکم گوتی؛

«من تەنها لە یەک شت تێناگەم... بۆچی "ئەنیتا" ئێمەی بەجێهێشت؟»

بەلامەوە سەیربوو کە لە پڕێکدا ناوی ئەوی برد... ئەو زیاتر کە باسی دایکمی دەکرد هەروەک من دەیگوت "دایە".

باوکم زوو زوو باسی دایکمی دەکرد، لە ڕاستیدا ببووە شتێکی ئاسایی لەلام. منیش هەروەک ئەو زۆرم بیردەکرد، بەڵام پێمواببوو هەریەکەمان بەشێوەی خۆمان بیری بکەین باشترە وەک لەوەی وەک یەک بیری بکەین.

دواتر باوکم گوتی؛

«پێم وابێت لە پێکهاتەی گەردوون باشتر تێدەگەم وەک لەوەی لەو تێبگەم... من نازانم ئەو ئافرەتە بۆچی هەروا سەفەریکرد، وە بەبێ ئەوەی هۆی کۆچکردنیمان بە تەواوەتی بۆ ڕوونبکاتەوە»

منیش گوتم؛

«لەوانەیە خۆشی لەوە تێنەگات»

لەکاتی ئەو نانخواردنەدا چیتر لەسەر ئەو بابەتە نەڕۆیشتین. پێم وابێت لەو کاتەدا هەردووکمان لە خەیاڵی خۆماندا دەمانگوت "بڵێیت لە ئەسینادا بیدۆزینەوە؟"





پاش نانخوادن بۆ خۆمان بەناو کەشتیەکەدا دەسوڕاینەوە. باوکم ئاماژەی بۆ کارمەندانی ناو کەشتیەکە دەکرد و مانای خەتەکانی سەر شانیانی پێدەگوتم. منیش بەردەوام هەر بیرم لە کاغەزەکانی دەستەیەکی یاری دەکردەوە.

ئێوارە درەنگانێک باوکم پێی خۆشبوو سەردانێکی بچکۆلەی بارەکەبکات. نەمویست لەسەر ئەو باسە بڕۆم و تەنها ئەوەندەم گوت کە پێم خۆشە بڕۆمەوە ژوورەکە و گۆڤاری "ئاندەرسی مراوی" بخوێنمەوە.

وابزانم پێی خۆشبوو کەمێک بەتەنها بێت و منیش لەلای خۆمەوە هەر خەیاڵکم لای چیرۆکەکەم بوو، لە دڵی خۆمدا دەمگوت "ئێستاکە فرۆد و "هانس"ی نانەوا لە شوێنێکدا دانیشتوون کە بەسەر لادێی کورتەبنەکاندا دەڕوانێت، ئاخۆ لەوێدا فرۆد چ شتێک بۆ "هانس"ی نانەوا باسبکات؟"

مەبەستم لەوەیە من نەمدەویست بڕۆمەوە ژوورەکە و گۆڤاری "ئاندەرسی مراوی" بخوێنمەوە، بەڵکو دەمویست شتێکی تەواو جیاواز بخوێنمەوە. هەستم دەکرد لەو هاوینەدا هێندە گەورەبووبم کە چیتر گۆڤارێکی وەک "ئاندەرسی مراوی" نەکڕم.

من بەلایەنی کەمەوە لەو ڕۆژەدا شتێک فێربووم؛ چیتر تەنها باوکم نەیدەفەلسەفاند، بەڵکو منیش هێدی هێدی خەریکبوو فێری فەلسەفە هەڵڕشتن ببم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





نۆی سینەک

...شەربەتێکی شیرینی لێدروست دەبوو. ڕەنگەکەی دەدروشایەوە و
تامێکی بەزەوق و خۆشی دەبەخشی...

پاشان پیاوە ریش سپیەکە گوتی؛
«باشبوو ڕزگارمانبوو لە دەستی!»
بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بێدەنگ دانیشتبوو و چاوی لەسەر
هەڵنەدەبڕیم، ئەوجا گوتی؛
«لەوە دەترسام تۆش هەر لە خۆتەوە شتێک بڵێیت»
ڕێک پاش ئەو ڕستەیە ئەوجا چاوی لەسەر لابردم. ئاماژەی بۆ
لادێکەی خوارەوەمان کرد و دیسانەوە بەسەرسامیەکەوە گوتیەوە؛
«خۆ تۆ هیچت پێنەگوتن؟»
منیش گوتم؛
«بەڕاستی نازانم بەتەواوەتی مەبەستت لە چیە؟»
«بێگومان وایە... وابزانم لەلایەکی هەڵەوە دەستمپێکرد»
لەگەڵیدا تەبابووم، سەرێکم بۆ لەقاند و گوتم؛
«ئەگەر لایەکی تریشی هەیە، ئەوا بێگومان زۆر باشترە گەر لەو
لایەی ترەوە دەستپێبکەیت»
«بێگومان وایە. بەڵام بەرلە هەموو شتێک پرسیارێکی گرنگم هەیە؛
دەزانیت ئیمرۆ چەندی مانگە؟»
لەوەڵامدا گوتم؛
«بەتەواوەتی دڵنیانیم. وابزانم سەرەتای مانگی دەیە...»
«ڕێک مەبەستم نیە بزانم چ ڕۆژێکە، بەڵکو ساڵەکەم بەلاوە گرنگە؛
دەزانیت ئێستاکە چ ساڵێکە؟»



منیش لەوەڵامدا گوتم؛
«ساڵی **1842**ە»
هێواش هێواش خەریکبوو شتێکم بۆ دەردەکەوت.
پیاوە پیرەکە هەر بۆ خۆی دانیشتبوو و سەری دەلەقاند. پاش نەختێک
گوتی؛
«کەواتە **52** ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕیوە، برادەر»
«هێندە ساڵە لەسەر ئەم دوورگەیە دەژیت؟»
دیسانەوە سەری لەقاندەوە؛
«بەڵێ، هێندە ساڵە»
فرمێسکێک لە چاوێکیەوە هاتە خوارەوە. هێدی هێدی هاتە سەر
کوڵمی و نەشیسڕی، دواتر لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و گوتی؛
«لە مانگی دەی **1790**دا لە "مەکسیک"ەوە دەرچووین. پاش چەند
ڕۆژێک لەناو دەریادا کەشتیەکەمان تێکشا و نقوومبوو. هەموو
ئەوانەی لەگەڵمدابوون لەگەڵ کەشتیەکەدا سەرەونگومبوون، بەڵام من
خۆم بە یەکێک لەو کۆڵەکە ئەستورانەدا هەڵزنی کە لە پاشماوەی
کەشتیەکە مابووەوە و سەرئاوکەوتبوو. دواتریش توانیم بگەمە
وشکانی...»
بۆ ماوەیەک هەر دانیشتبوو و بە قوڵی بیری دەکردەوە. ئەوجا گوتم؛
«منیش پاش ئەوەی کەشتیەکەمان شکا گەیشتمە سەر ئەم دوورگەیە»
بە ماتەمینیەکەوە سەری لەقاند و گوتی؛
«تۆ دەڵێت "دوورگە"، منیش کاتی خۆی هەروام دەگوت. بەڵام ئایا
دەتوانین دڵنیابین لەوەی کە ئەمە دوورگەیە؟ من خۆم وا پەنجا
ساڵێک زیاترە لەم شوێنەدا دەژیم، برادەر... بە هەموو کون و



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





کولەبەرێکیشیدا سوڕاومەتەوە. بەڵام هەرگیز و هەرگیز نەمتوانی جارێکی تر ڕێگای دەریا بدۆزمەوە»

لەوێدا گوتم؛

«کەواتە دوورگەیەکی گەورەیە»

«دوورگەیەک کە لەسەر هیچ نەخشەیەکدا بوونی نیە؟»

تەماشایەکی کردم و منیش گوتم؛

«بێگومان ڕێیتێدەچێت لە کیشوەری ئەمریکادا گیرسابینەوە، لەوانەشە لە ئەفریقادا بین. خۆ ئێمە بەرلەوەی بگەینە سەر وشکانی نازانین بۆ ماوەی چەند ڕۆژ نێچیری شەپۆلەکانی دەریابووین»

دیاربوو پیاوە پیرەکە لەگەڵ قسەکانمدا تەبانەبوو، بۆیە سەری ڕاوەشاند و گوتی؛

«پیاوە گەنجەکە... لە ئەمریکا و لە ئەفریقاشدا خەڵکی لێیە، تێدەگەیت؟»

«بەڵام ئەگەر ئەم شوێنە دوورگە نەبێت و یەکێک لە کیشوەرە گەورەکانیش نەبێت، ئەی کەواتە چیە؟»

بە منگەمنگێک گوتی؛

«شوێنێکی تەواو جیاوازە»

دیسانەوە کەوتەوە بیرکردنەوەی قوڵ و دوای نەختێک گوتم؛

«کورتەبنەکان... بیر لەوان دەکەیتەوە؟»

لەبری وەڵامدانەوەم گوتی؛

«تۆ دڵنیایت لەوەی لە جیهانی دەرەوەوە هاتوویت؟ مەبەستم لەوەیە دڵنیایت لەوەی تۆش خەڵکی ئێرە نیت؟»

لەدڵی خۆمدا گوتم "منیش؟"، کەواتە بیری لە کورتەبنەکان دەکردەوە.

بەڵام دواتر گوتم؛





«کەشتیەکەمان لە شاری "هامبۆرگ"ەوە دەرچوو»

«ئاوها؟ من خۆم خەڵکی "لیوبیک"م...»

«منیش خەڵکی ئەوێم. ڕاستە لە هامبۆرگدا لەسەر کەشتیەکی نەرویجی کارمەدەکرد، بەڵام خۆم لەشاری "لیوبیک"دا گەورەبووم»

«بەڕاست؟ کەواتە بەرلە هەموو شتێک باسی ئەورووپام بۆبکە، بزانم لەو ماوەی **50** ساڵەی ڕابووردودا کە من لەوێ نەبووم چی ڕوویداوە»

هەموو ئەو شتانەم بۆ گێڕایەوە کە خۆم دەمزانین. زیاتر باسی ناپلیۆن و شەڕەکانم بۆ کرد. هەروەها پێشم گوت کە فەڕەنسیەکان لە ساڵی **1806**دا شاری "لیوبیک"یان تاڵانکرد. دواجاریش گوتم؛

« لە ساڵی **1812**دا، تەنها ساڵێک لەدوای لەدایکبوونم، ناپلیۆن مەیدانی شەڕەکەی گەیاندە ڕووسیا. بەڵام پاش زیانێکی گەورە ناچاربوو پاشەکشێ بکاتەوە. لەساڵی **1813**شدا لە شەڕە گەورەکەی شاری "لایبزیگ"دا شکستی هێنا. دواتریش دوورگەی "ئێبا"ی داگیرکرد و خستیە سەر ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی. پاش چەند ساڵێکیش هاتەوە مەیدان و سەرلەنوێ ئیمپراتۆری فەڕەنسی دامەزراندەوە. لەدواجاریشدا لە شەڕە گەورەکەی "واترلۆ"دا دۆڕاندی، ئیدی دوا ساڵەکانی ژیانی لە ڕۆژئاوای ئەفریقادا لەسەر دوورگەی "سانت هیلینا"دا بەسەربرد»

پیاوە پیرەکە زۆر بەسەرنجەوە گوێی بۆ شلکردبووم، دواتر بڵمەبڵمێکی کرد و گوتی؛

«خۆ بەلایەنی کەمەوە دەریای دەبینی»

لەوە دەچوو هەر دانیشتبێت و زۆر بەوردی بیر لە هەموو ئەو شتانەبکاتەوە کە من پێمدەگوت. پاش نەختێک گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«هەر لە حەکایەت دەچێت. مەبەستم لەو ڕووداوانەیە کە لەو چەند ساڵەی پێشوودا بەسەر ئەورووپادا هاتووە. بەڵام ڕێشی تێدەچوو مێژوو بەتەواوەتی بە ئاڕاستەیەکی تردا بڕۆشتایە»
من بەتەواوەتی تەبابووم لەگەڵیدا، مێژوو وەک حەکایەتێکی گەورە وایە و تەنها جیاوازیش لەوەدایە کە مێژوو شتێکی ڕاستەقینەیە.

لەو کاتەدا خەریک بوو خۆر لەپشت چیاکانی خۆرئاواوە ئاوادەبوو. سێبەریش لادێ بچکۆلەکەی داپۆشیبوو. کورتەبنەکانی ئەو خوارە هەروەک چەند پەڵەیەکی پڕڕەنگ لە نێوان خانووەکاندا دەهاتن و دەچوون.
وەک شتێکی چاوەڕوانکراو سەرێکم ڕاوەشاند و فرۆدیش دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی؛
«من لەسەر کەشتیەکی ئیسپانی دەریاوانبووم، لە شاری "فیرا کروز"ی مەکسیکەوە بەرەو شاری "کادیز"ی ئیسپانیا کەوتینە ڕێ. بارێکی گەورەی زیویشمان هەڵگرتبوو. ئاوهەوا تا بڵێیت ئارام و هێمن بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پاش چەند ڕۆژێک لەدوای ئەوەی بەندەرمان بەجێهێشت کەشتیەکەمان نقوومبوو. بەمەزەنەی من لەو کاتەدا لە شوێنێکی نێوان "پۆرتاریکا" و دوورگەی "بەرمۆدا"دا بووین. لەوەوپێش چەندەها چیرۆکی سەیروسەمەرەمان دەربارەی ئەو ناوچەیە بەرگوێ کەوتبوو، بەڵام زیاتر هەروەک چیرۆکی سەرنجڕاکێشی دەریاوانی وەرمانگرتبوو و هیچی تر. کەچی بەیانیەکیان لەناو ئەو دەریا ئارام و هێمنەدا لەپڕێکدا کەشتیەکەمان بەرزبووەوە. دەتگوت دەستێکی گەورە کەشتیەکەمان دەخولێنێتەوە. بەڕاست... هەر دەتگوت تەپەدۆرێکین و شتێک هەڵمان دەکێشێت. هەمووی چەند چرکەیەکی





خایاند و دواتر کەوتینەوە خوارەوە، بەڵام کەشتیەکەمان بەلاری لەناو دەریاکەدا کەوتەوە... ئیدی بارەکەمان لاسەنگبوو و ئاو هاتە ناو کەشتیەکەوە.
پاشان هەرچۆنێک بێت گەیشتمە وشکانی، زۆر بە ناڕوونی دیمەنی ئەو قەراغ ئاوەم دێتەوەیاد. چونکە هەر کە گەیشتمە ئەوێ یەکسەر بەرەو ناوەوەی دوورگەکە کەوتمە ڕێ. دوای ئەوەش بۆ ماوەی یەک دوو حەفتە هەر دەخولامەوە و لەدواجاردا لێرەدا نیشتەجێبووم... لەو کاتەشەوە ئێرە بوو بە ماڵی من.
من توانیم ژیانی خۆم لێرەدا بەڕێوەببەم. پەتاتە و گەنمەشامی و سێو و مۆز لێرەدا دەڕوێن. کۆمەڵێک میوەی تریشم بینی کە لە ژیانمدا نەمبینیبوون و ناویشیانم نەبیستبوو. پاشتریش "تووی چاکبوونەوە" و "ڕینگرود" و "گرامین"[24] بوونە بەشێکی گرنگی ژیانم. بێگومان دەبوایە خۆم ناو لەو هەموو میوە و سەوزانەی سەر دوورگەکە بنێم کە لەوەوپێش نەمبینیبوون.
دوای چەند ساڵێکیش توانیم "مۆلووک"ە شەش قاچەکان ماڵی بکەم. ئەوان نەک هەر تەنها شیرێکی چەور و باشیان پێدەبەخشیم، بەڵکو توانیم گالیسکەشیان پێ ڕابکێشم. جارجاریکیش سەرم دەبڕین و گۆشتە نایاب و خۆشەکەیانم دەخوارد. ڕێک تامی گۆشتی بەرازی کێوی دەدا کە جاران هەموو سەری ساڵێک لە ئەڵمانیادا دەمانخوارد.
لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکانیشدا هەر لە میوە و سەوزەی سەر دوورگەکە چەندین دەرمانم بەرهەم هێنا و دژی ئەو نەخۆشیانە بەکاردەهێنا کە تووشیان دەبووم. جگە لەوەش چەند خواردنەوەیەکم

[24] ئەو سێ ناوە نووسەر خۆی دایهێناون.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

لەو میوانە دروستکرد کە هەروا بۆ خۆشبەختی خۆم بەکارمدەهێنان.
پاش ماوەیەک دەبینی کە من زوو زوو شتێک دەخۆمەوە کە خۆم ناوم ناوە "توف". ڕەگی داری "دارخورمای توف" دەکوڵێنم، لەڕاستیدا تامێکی کەمێک تاڵی هەیە. بەڵام "توف" لەو کاتانەدا کە ماندووم و دەشمەوێت بەخەبەربم، بەئاگام دەهێنێتەوە. وە لەو کاتانەشدا کە بەخەبەرم و دەمەوێت بخەوم، خەوم لێدەخات. تامیشی تا بڵێیت خۆشە و جگەلەوەش خواردنەوەیەکی بێ زیانە.
بەدەر لەوەش خواردنەوەیەکی تریشم بەرهەم دەهێنا کە ئێمە پێی دەڵێین "ساردیە ئەرخەوانیەکە". تا بڵێیت خواردنەوەیەکی نایابە و هەموو بەشێکی لەش سوودی لێدەبینێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خواردنەوەیەکە کە متمانەی پێناکرێت و ترسناکە. بەڕاستی پێم خۆشە کە لە دوکانەکانی ئەڵمانیادا نافرۆشرێت. من ئەم شلەیە لە ئاوی "گوڵی ئەرخەوانی" دروستدەکەم. ئەو گوڵە بە شێوەی دەوەنێکی بچوک بچوک لە هەموو شوێنێکی سەر ئەم دوورگەیەدا دەڕوێت و گوڵێکی ئەرخەوانی سووریاو دەگرێت. لێرەدا دەبێت ئەوەت پێبڵێم کە پێویستی نەدەکرد خۆم ناوی ئەو گوڵانە بگرم، بەڵکو ئەو کارەم بۆ هەنگە گەورەکانی سەر دوورگەکە جێدەهێشت. وەک دەزانیت ئەوان بە ئەندازە لە پاسارییەکانی ئەڵمانیا گەورەترن. هێلانە لەناو درەختەکاندا دەکەن، هەر لەوێشدا ئاوی ئەو گوڵە ئەرخەوانیانە کۆدەکەنەوە. منیش تەنها ئەوەندەم لەسەربوو کە بەشی خۆم بەرم.
من کە ئەو ئاوی گوڵەم تێکەڵی ئاوی "ڕووباری پەلکەزێرینە" دەکرد، ئەو ئاوەی کە ماسیە پرتەقاڵیەکانیشم لێوە هێناون، شەربەتێکی شیرینی لێدروست دەبوو. ڕەنگەکەی دەدروشایەوە و تامێکی بەزەوق و خۆشی دەبەخشی. هەر بۆیە ناوی "ساردی"م لێنابوو.



ساردیە ئەرخەوانیەکە بەتەنها تامەکەی خۆش و سەرنجڕاکێش نەبوو... نا، نا، لەسەرو ئەوەشەوە کاریگەریەکی جیاوازی لەسەر تەواوی هەموو ئەندامانی هەستی مرۆڤ بەجێدەهێشت. لەوەش زیاتر؛ تامی ساردیە ئەرخەوانیەکە تەنها لە ناو دەم و قورگدا نەدەوەستا، بەڵکو هەموو تاکە خانەیەکی لەش هەستی پێدەکرد. بەڵام برادەر، خواردنەوەی هەموو جیهان بە قومێک خۆی لە خۆیدا بۆ تەندروستی باش نیە. لەبەرئەوە باشترە جیهان بە بەشی بچکۆلە بچکۆلە وەربگیرێت.
هەر پاش ئەوەی ساردیە ئەرخەوانیەکەم بەرهەم هێنا، ڕۆژانە کەوتمە خواردنەوەی. لەسەرەتادا هەر زۆر دڵشادی دەکردم، بەڵام دواتر هێدی هێدی هەستم بە کات و شوێن نەدەکرد. لە پڕێکدا لە شوێنێکی دوورگەکەدا خەبەرم دەبووەوە، وە بەهیچ شێوەیەک ئەو کاتەم بیرنەدەهاتەوە کە چووبوومە ئەوێ. بەو شێوەیەش جاری وابوو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک و چەند حەفتەیەک هەر دەخولامەوە و نەمدەتوانی ماڵەوە بدۆزمەوە. هەموو شتێکم لەیاد دەکرد، نەمدەزانی من کێم و لە کوێوە هاتووم. هەستمدەکرد هەموو شتێکی چواردەورم هەر خۆمن. کە دەمخواردەوە لەپێشدا لە دەست و قاچەکانمدا هەستم پێدەکرد، هەر دەتگوت بە هێواشی دەرزی پێدادەکەن. دواتریش هێدی هێدی بەرەو سەرم ڕۆیشت. لەدواجاریشدا خواردنەوەکە وردە وردە بەرەو ڕۆحم تەشەنەیکرد. بەهەرحاڵ... بەڵام پێم خۆشە کە لە کاتی خۆیدا توانیم وازی لێبهێنم. ئەمڕۆکەش تەنها ئەوانەی تر دەیخۆنەوە کە لەسەر دوورگەکە دەژین. دواتریش هۆی ئەوەت بۆ ڕووندەکەمەوە»
لەو کاتەدا کە بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوە، دانیشتبووین و تەماشای لادێکەی خوارەوەمان دەکرد. دونیا تاریک بووبوو، کورتەبنەکانیش



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



لێرەولەوێ لەناو خانوەکاندا چراکانیان داگیرساندبوو. لەپڕێکدا فرۆد گوتی؛

«خەریکە ساردی دەکات»

دوابەدوای ئەوە هەستایە سەرپێ و دەرگای کوخەکەی کردەوە. چووینە ناوەوە و خۆمم لە ژورێکی دارینی بچکۆلەدا بینیەوە. لەوێدا هەموو ئەو شتانەم بەرچاوکەوت کە کەسێکی وەک فرۆد پێویستی پێیانبوو، پڕبوو لەو شتانەی کەلەسەر دوورگەکە کۆیکردبوونەوە. لەوێدا هیچ شتێکی لێنەبوو کە لە ئاسن دروستکرابێت، هەموو شتەکان لە قوڕ و دار و بەرد دروستکرابوون. بەڵام کۆمەڵێک شتیشی لێبوو کە نیشانەی شارستانیبوون؛ چەندەها قاپ و چرا و پەرداخ و کوپی شوشەی لێبوو. لە چەندین شوێنی ژورە بچکۆلەکەشدا شوشەی ماسی دانرابوو و ماسی پرتەقاڵیان تێدا بوو. هەموو پەنجەرەکانیش هەر لە شوشە دروستکرابوون.

وەک ئەوەی بتوانێت بیرکردنەوەکانم ببینێت، گوتی؛

«کاتی خۆی باوکم شوشەچیبوو. من بەرلەوەی ڕووبکەمە جیهانی دەریاوانی خۆمم فێری ئەو پیشەیەکرد. دواتریش لەسەر ئەم دوورگەیەدا سوودم لێبینی. پاش ئەوەی کە گەیشتمە ئێرە چەندەها جۆری لمم تێکەڵکرد. دواتریش لمێکی تایبەتی و نایابی شوشەییم دۆزیەوە و توانیشم فرنێکی بەردینی بۆ دروستبکەم و تێیدا بتوێنمەوە. ناوی ئەو بەردەشم نا "دۆرفیت"، چونکە لە شاخێکی ئەولا لادێکەوە دۆزیمەوە.

منیش گوتم؛

«شوێنی شوشە دروستکردنەکەم بینی»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەو کاتەدا پیاوە پیرەکە ڕووی تێوەرچەرخاندم، ڕێک تەماشای ناوچاوی کردم و گوتی؛

«خۆ هیچت نەگوت؟»

ئەو چەند جارێک گوتی "خۆ هیچت بە کورتەبنەکان نەگوت". من بەدڵنیاییەوە نەمدەزانی مەبەستی لە چیە. دواتریش گوتم؛

«نا، تەنها گوتم چ ڕێگایەک دەمگەیەنێتە ناو لادێکە و هیچی تر»

«باشە! دەبا پەرداخێک "توف" بخۆینەوە»

هەریەکەمان لەسەر کورسیەک بەدەوری مێزێکدا دانیشتین، مێزەکە لە جۆرە دارێکی ڕەنگ تۆخ دروستکرابوو. من هەرگیز لەوەوبەر شتی وام نەبینیبوو. فرۆد لەیەکێک لە شوشە گەورەکانەوە شلەیەکی قاوەیی باوی کردە ناو دوو پەرداخی خڕەوە. لە سەقفەکەشەوە چرایەک شۆڕبووبووەوە و فرۆد دایگیرساند.

بە هێواشی قومێکی بچکۆلەم لە خواردنەوە قاوەییەکەدا. لەهەمان کاتدا تامی لیمۆ و گوێزی هیندی دەدا. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش تامێکی ترش لە دەممدا هەر مایەوە. پاش نەختێک پیاوە پیرەکە بەدەموچاوێکی پڕ لەئومێدەوە لێی پرسیم؛

«تامەکەی بەلاتەوە چۆنە؟ ئەمە یەکەمین جارە "توف" بدەمە کەسێکی ئەوروپی ڕاستەقینە»

منیش لە وەڵامدا گوتم بەڕاستی تابڵێیت تامێکی خۆش ونایابی هەیە.

دیسانەوە کەرەتێکی تریش گوتیەوە؛

«باشە! کەواتە وا باشترە ئێستاکە ئیتر باسی یاریدەدەرە بچکۆلەکانمت بۆ بکەم کە لەسەر دوورگەکەدا دێن و دەچن. وابزانم هەر بیر لەوان دەکەیتەوە برادەر، وانیە؟»

سەرێکم بۆ لەقاند و پیاوە پیرەکەش سەرلەنوێ کەوتەوە باسکردن.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



**دەی سینەک**

**...نەمدەزانی بە چ شێوەیەک، شتێک هەروا لە هیچی نەبووەوە دێتە بوون...**

کتێبە بچکۆلەکە و زەرەبینەکەم لەسەر مێزی تەنیشت جێگاکەدا دانا. کەمێک بە ژوورەکەدا هاتوچۆمکرد و بیرم لەو شتانە دەکردەوە کە کەمێک لەوەوبەر خوێندمنەوە.

خۆم بە خۆمم دەگوت "فرۆد 52 ساڵی رەبەق لەسەر ئەو دوورگە سەیرەدا ژیاوە، هەر لەوێشدا رۆژێک لە رۆژان چاوی بە کورتەبنە سستەکان کەوتووە. بەڵام خۆ لەوانەشە زۆر دوای ئەوەی کە فرۆد گەیشتۆتە سەر دوورگەکە، کورتەبنەکان رووبیان لەو شوێنە کردبێت، کێ دەزانێت؟

بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەبێت فرۆد "دینار"ەکانی فێری هونەری شوشەسازی کردبێت. لەوانەشە هەر ئەو "سینەک"ەکانی فێری چاندنی زەوی کردبێت. هەر ئەویش "کوپ"ەکانی فێری نانەوایی کردووە و "قەرە"کانیشی فێری دارتاشی کردووە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت "ئەی باشە ئەو کورتەبنە بچکۆلانانە کێن؟"

ئەگەر زیاترێکم بخوێندایەتەوە، ئەوسا لەوانەبوو وەڵامی پرسیارەکەم دەستکەوتایە، بەڵام هەر خۆم بەتەنها لە ژوورەکەدا بووم و بەڕاستی نەمدەوێرا لەسەر خوێندنەوە بەردەوامبم.

پەردەکانم لادا و لەوێدا رێک رووبەڕوی دەموچاوێک بوومەوە. کورتەبنەکە بوو! لەودیوەوە لە ڕاڕەوەکەدا وەستابوو و چاوی تێبڕیبووم.





هەمووی چەند چرکەیەکی خایاند، چونکە هەر کە زانی دەیبینم یەکسەر بۆی دەرچوو.

زۆر زۆر ترسام، لە شوێنی خۆمدا وشکبووبووم و نەمدەوێرا بجوڵێمەوە. تەنها شت کە توانیم بیکەم ئەوە بوو کە پەردەکانم دایایەوە و پاش کەمێک خۆمدا بەسەر جێگاکەمدا و دەستمکرد بە گریان.

بیرم لەوە نەدەکردەوە کە برۆمە دەرەوە و باوکم لە بارەکەدا بدۆزمەوە. لە ترساندا نەمدەوێرا هیچ شتێک بکەم، سەری خۆمم لە ژێر سەرینەکەمدا شاردبۆوە و هیچی تر. دواجار نەمدەوێرا ئەوەش بکەم.

نازانم بۆ ماوەی چەندێک بە پاڵکەوتنەوە گریابووم. بەڵام لەوە دەچوو باوکم لە ڕاڕەوەکەوە گوێی لە لورەی بەرزی گریانم بووبێت، چونکە بەتووندی دەرگاکەی کردەوە و بەپەلە رایکردەلامەوە و گوتی؛

«چی روویداوە هانس تۆماس؟»

لەسەر جێگاکە هەڵیگێڕامەوە و هەوڵیدا چاوم بکاتەوە. منیش بەدەم هەنسکەوە گوتم؛

«کورتەبنەکە... لەپەنجەرەکەوە کورتەبنەکەم بینی... لەوێدا وەستابوو... وەستابوو و چاوی تێبڕیبووم»

وابزانم باوکم پێیوابوو شتێکی خراپتر روویدابێت، چونکە لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانمدا دەستی لێبەردام و لە ژوورەکەدا کەوتە هات و چۆ.

«قسەی قۆڕ دەکەیت، هانس تۆماس. هیچ کورتەبنەیەک لەسەر ئەم کەشتیەدا نیە»

بەڵام من سووربووم لەسەر قسەکەم و گوتم؛

«من خۆم بینیم»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«لەوانەیە پیاوێکی پچکۆلەت بینیبێت. بێگومان پیاوێکی یۆنانیت بینیووە»

لە دواجاردا تا ڕادەیەک بڕوای پێهێنام کە بە هەڵەدا چووبووم. بەلایەنی کەمەوە توانی هێمنم بکاتەوە. بەڵام بەرلەوەی باسەکە بەتەواوەتی دابخەین، مەرجێکم هەبوو؛ وام لەباوکم کرد کە پەیمانێک بدات و بەرلەوەی بگەینە "پاتراس" پرسیار لە کارمەندانی کەشتیەکە بکات، بۆئەوەی بزانێت هیچ کورتەبنەیەک لەسەر کەشتیەکە هەیە یان نا.

هێشتام جارجارێک هەر هەنسکم دەدا و لەوێدا باوکم پرسی؛

«بەبڕوای تۆ زیاد لە ڕادە باسی فەلسەفە ناکەین؟»

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و باوکم بەردەوامبوو؛

«لەپێشدا دەبێت دایە لە ئەسینادا بدۆزینەوە. لەبەرئەوە دەتوانین ڕوونکردنەوەی مەتەڵی ژیان کەمێک دوابخەین. هیچ پەلەیەکمان نیە، کەسیش لەپرێکدا نایەت و پرۆژەکەمان لێبفرێنێت»

تەماشایەکی کردم و گوتی؛

«بایەخدان بەوەی کە مرۆڤ کێیە و لە کوێوە هاتووە، هێندە ئارەزوویەکی بەدەگمەنە کە تاڕادەیەکی زۆر دەتوانین بڵێین تەنها ئێمە جۆرە ئارەزوویەکی ئاوهامان هەیە. ئێمەش کە خۆمان بەو شتانەوە خەریک دەکەین، هێندە پەرشوبڵاوین کە تا ئێستاکەش تەنانەت نەمانتوانیوە ڕێکخراوێکی تایبەت بە خۆمان دابمەزرێنین»

ئەو کاتەی بەتەواوەتی ژیربوومەوە، باوکم کەمێک ئارەقی ڕۆکردە پەرداخێکی بچوکەوە. ئارەقەکە لە نیو سانتیمەترێک تێنەدەپەڕی. پاشان ئاوی تێکەڵکرد و پەرداخەکەی بۆ ڕاکێشام و گوتی؛

«هانس تۆماس، ئەمە بخۆرەوە. دڵنیام ئەم شەو باش دەخەویت»



چەند قومێکم لێدا. تا بڵێیت تامێکی ناخۆش و پیسی هەبوو، نازانم چۆن باوکم ئەو شتانەی بۆ دەخورایەوە.

لەو کاتەشدا کە باوکم خەریکبوو بچێتە جێگاوە، جۆکەرەکەم دەرهێنا... ئەو جۆکەرەی کە لە ئافرەتە ئەمریکیەکە سواڵمکردبوو. ڕوومکردە باوکم و گوتم؛

«حەزدەکەم ئەمەت بدەمێ»

بەدەستیەوە گرتی و زۆر بە جوانی لێی وردبووەوە. من پێموانەبوو جۆکەرێکی بەدەگمەن بێت، بەڵام ئەوە یەکەمین جاربوو کە من جۆکەرێکی بۆ پەیدا بکەم.

ئەویش لەبری جۆکەرەکە هونەرێکی یاری کاغەزی نیشاندام؛ لە جانتاکەیدا کۆمەڵێک کاغەزی یاری تری دەرهێنا و جۆکەرەکەی تێکەڵکرد. پاشان هەموو کاغەزەکانی لەسەر مێزی تەنیشت جێگاکەدا دانا. نەختێک پاش ئەوە هەمان جۆکەری بەدەستەوە بوو.

زۆر بەوردی تەماشامدەکرد، سوێند دەخۆم جۆکەرەکەی خستە ناو دەستەکەوە. هەڵبەتە لەوانەیە لە قۆڵی چاکەتەکەیدا شاردبێتیەوە، بەڵام ئەی چۆن خستیە ئەوێوە؟

من لەوە تێنەگەیشتم؛ نەمدەزانی بە چ شێوەیەک، شتێک هەروا لە هیچی نەبووەوە دێتە بوون.

باوکم هەر لەسەر پەیمانەکەی خۆی مابوو کە پرسیار لە کارمەندانی کەشتیەکە بکات و بزانێت هیچ کورتەبنەیەک لەسەر کەشتیەکە هەیە یان نا. بەڵام بێگومان پێی دەڵێن هیچ کەسێکی وا بچوک لەسەر کەشتیەکە نیە. ئەوساکە ڕێک بەو شێوەیە دەبوو کە من بۆی دەچووم؛ کورتەبنەکە بەدزیەوە هاتۆتە ناو کەشتیەکەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



## کوڕی سینەک

**...ئەگەر ژیان جادوویەک بێت، کەواتە دەبێت جادووگەرێکیش بوونی هەبێت...**

بەر لەوەی بخەوین لەسەر ئەوە ڕێککەوتین نانی بەیانی لەناو کەشتییەکەدا بخۆین و ئینجا دابەزینە ناو شاری "پاتراس"ەوە. هەر لەبەرئەوە زەنگی کاتژمێرەکەمان خستبووە سەر حەوت، سەعاتێک بەرلەوەی کەشتییەکەمان بگاتە جێ. بەڵام من هەر لە کاتژمێری شەشەوە خەبەرمبووەوە.

یەکەمین شت کە چاوم پێی کەوت کتێبە بچکۆلەکە و زەڕەبینەکەم بوو. هەر لەسەر مێزی تەنیشت جێگاکەوە بوون. لەو کاتەدا کە دەموچاوە ناشیرینەکەم لە پەنجەرەکەوە بینی، بیرم چووبوو لایان ببەم. بەڕاستی بەختم هەبوو کە باوکم نەیبینیبوون.

"جەنابی بەڕێوەبەر" هێشتام هەر خەوتبوو، منیش هەر لەو کاتەوەی کە چاوم کردەوە بیرم لە فرۆد دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئاخۆ چی دەربارەی کورتەبنەکانی سەر دوورگەکە باسبکات. بەرلەوەی باوکم، هەروەک هەموو جارێکی، لەسەر جێگاکەی بکەوێتە جوڵە جوڵ، دەستمکردەوە بە خوێندنەوە؛

**ئێمە بەردەوام لەناو دەریادا یاری کاغەزمان دەکرد. من هەمیشە دەستەیەک کاغەزی یاری لە گیرفانی کراسەکەمدابوو. پاش ئەوەی کەشتییەکەمان تێکشا و گەیشتمە سەر ئەم دوورگەیە، تەنها شت کە پێمبوو دەستەیەک کاغەزی یاری فەرەنسی بوو.**



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**لەساڵانی سەرەتادا لەبەر تەنهاییم زوو زوو یاری کاغەزم دەکرد. کاغەزەکان تەنها وێنەی بەردەستم بوون. بەڵام من تەنها ئەو یاریانەم نەدەکرد کە لەوەوپێش لە ئەڵمانیادا فێریانبووبووم. نا، نا... گەر 52 کاغەزی جیاواز و کاتێکی یەکجار بێپایانیشت لەبەردەستدا بێت، ئەوا بێگومان دەتوانیت ژمارەیەک یاری بێشومار دابهێنیت. من هەر زوو ئەوەم بۆ دەرکەوت.**

**بەرە بەرە هەندێک خاسیەتی جیاوازم بە هەریەک لە کاغەزەکان دەبەخشی. دواتریش لەبەرچاومدا بوون بە 52 کەسی سەربەخۆ و سەربە چوار خێزانی جیاواز بوون. سینەکەکان ڕەنگی پێستیان قاوەیییاو بوو، لەشێکی پتە و قژێکی پڕی لولیان هەبوو. دینارەکان لاوازتربوون، باریکتر و شۆخ و شەنگتربوون. سپی پێستبوون و قژێکی زیوباوی خاویان هێنابووە خوارەوە. کوپەکانیش... ئمم، ئەوان زیاتر ئەچوونە دڵەوە. لەشولارێکی خڕیلەیان هەبوو، کوڵمەکانیان سوور و قژێکی زەردی کاڵیان پێوەبوو. قەرەکانیش... خوایە بمانپارێزیت! ئەوان لەشێکی توند و مەحکەمیان هەبوو، ڕەنگی پێستیان زەردباوبوو. کەمێک تووڕە و مرومۆچ دەهاتنە بەرچاو، دوو چاوی تیژی ڕەشیان پێوەبوو و قژێکی ژاکاویش سیمای داپۆشیبوون.**

**ئیدی لەو کاتانەدا کە یاریم بە کاغەزەکان دەکرد، من بەو شێوەیە دەمبینین. لەگەڵ هەر کاغەزێکدا کە دامدەنا، دەتگوت ڕۆحێک لە بتڵێکی ئەفسوناویەوە دەردەهێنم و دایدەنێم. بەڵێ ڕۆحیان هەبوو... چونکە تەنها شێوەی سیمایان جیاوازنەبوو لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکی تر. نەخێر، شێوەی خوڵق و مەزاج و کەسایەتیشیان جیاوازبوو. سینەکەکان کەسایەتیەکی سستتر و وشکتریان هەبوو وەک لە دینارە ناڕوون و دڵناسکەکان. کوپەکانیش دڵخۆشتر و نەرمتربوون**



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

لە قەرەکان کە زوو زوو هەڵدەچوون و پەست و توڕەدەبوون. بەڵام لەناو هەر خێزانێکیشدا جیاوازیەکی گەورە هەبوو. هەموو دینارەکان دڵ ناسکبوون و زۆر بە ئاسانی هەستیان بریندارەدەبوو، بەڵام لەناو هەموویاندا سێی دینار تاوناتاوێک دەگریا. هەموو قەرەکان هەڵدەچوون، بەڵام دەی قەرە لە هەموویان زیاتر توڕەدەبوو.

بەو شێوەیەش لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا **52** کەسایەتی نەبینراوم خولْقاند، هەر لێرەشدا لەسەر ئەم دوورگەیە لەگەڵمدا دەژیان. لە دواجاریشدا ژمارەیان بووبە **53**، چونکە جۆکەریش هاتە ناو ناوانەوە و ڕۆڵێکی گرنگی بینی»

«بەڵام چۆن...»

«نازانم گەر بتوانیت مەزەندەی ئەوە بکەیت کە من چەندە تەنهابووم. ئێرە لەڕادەبەدەر مات و بێدەنگبوو. ڕاستە بەردەوام چاوم بە چەند گیانەوەرێکی جیاوازدەکەوت؛ کونەپەپوەکان و "مۆلووک"ەکان شەوانە چەند جارێک لە خەو هەڵیاندەستاندم، بەڵام هیچ کەسێک نەبوو کە قسەی لەگەڵدا بکەم. هەر پاش چەند ڕۆژێک کەوتمە قسەکردن لەگەڵ خۆمدا. پاش یەک دوو مانگیش قسەم بۆ کاغەزەکان دەکرد. تاوناتاوێک بەشێوەیەکی بازنەیی بەچواردەوری خۆمدا ڕیزمەدەکردن و بەخەیاڵ وامدادەنان کەوەک من مرۆڤی ڕاستەقینەن و لە گۆشت و خوێن پێکهاتوون. جارجارێکیش هەروا کاغەزێکم بەرزدەکردەوە و گفتوگۆیەکی دورودرێژم لەگەڵدا سازدەکرد. پاش ماوەیەکیش هەموو کاغەزەکان کۆن بوون و خەریکبوو دادەڕزان. تیشکی خۆر ڕەنگەکانی سڕیبوونەوە و زۆر بەزەحمەت وێنەی سەر کاغەزەکانم لەیەکدی بۆ جیادەکرایەوە. لەبەرئەوە هەموو دەستەکەم خستە قتوویەکی بچکۆلەوە و هەتا ئەمڕۆکەش هەر پاراستوومن. بەڵام



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

شکڵەکان بەردەوام لە ئاگایمدا هەر دەژیان. ئەوساکە ئیتر هەر بە خەیاڵ یاریم پێدەکردن و چیتر پێویستم بە خودی کاغەزەکان نەما. وەک ئەوە وابوو کە لەپڕێکدا بەبێئەوەی هیچ ژمێریارێ بەکاربهێنیت، بتوانیت شتەکان بژمێریت. بۆ نمونە کۆی شەش و حەوت هەر دەکاتە سیازە، تەنانەت ئەگەر هیچ شتێکیش بۆ ئەنجامدانی ئەو کۆکردنەوەیە بەکارنەهێنیت.

بەو جۆرە بەردەوام قسەم لەگەڵ برادەرە نەبینراوەکانمدا دەکرد، پاش ماوەیەکیش لەوەدەچوو وەڵامم بدەنەوە -هەرچەندە هەمووی تەنها هەر بە خەیاڵیش بوو. زیاتریش ئەو کاتانە بەڕوونی دەمبینین کە دەخەوتم، چونکە لەڕادەبەدەر خەوم بەشکڵەکانەوە دەبینی و هەمیشە لەگەڵیاندابووم. هەر لە کۆمەڵگایەکی بچکۆلە دەچووین. لە خەوەکانمدا شکڵەکان سەربەست لەمن قسەیان دەکرد و شتی جۆراوجۆریشیان دەکرد. ئا بەوجۆرە لە شەوەکاندا کەمتر هەستم بەتەنهایی دەکرد وەک لە ڕۆژە دورودرێژەکان. دواتریش کاغەزەکان بەپێی کەسایەتی تایبەتی خۆیان ژیانیان بەسەر دەبرد. لەناو ئاگایمدا هەروەک پاشا و شاژنی ڕاستی و خەڵکی ڕاستەقینەی لە گۆشت و خوێن پێکهاتوو دەهاتن و دەچوون.

پەیوەندیشم لەگەڵ هەندێک لە شکڵەکاندا زیاتربوو وەک لەوانی تر. لەسەرەتادا بەردەوام گفتوگۆی دورودرێژم لەگەڵ کوڕی سینەکدا دادەمەزراند. هەروەها جارجارێکیش بۆ ماوەیەکی دورودرێژ کاتێکی خۆشم لەگەڵ دەی قەرەدا بەسەردەبرد _ هەڵبەتە ئەو کاتانەی کە دەیتوانی دەست بەسەر خۆیدا ڕابگرێت.

بۆ ماوەیەکیش بەدزیەوە لەگەڵ بللی کوپدا کەوتبومە خۆشەویستیەوە. بەو شێوەیەش چێژ و خۆشیم لە یاریە هزریەکەی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





خۆم دەبینی... من هێندە تەنها بووم، تێدەگەیت؟... ئەو زۆر جوانبوو لەبەرچاومدا؛ کراسێکی زەردی لەبەردابوو، دووچاوی سەوزی جوانی پێوەبوو و قژێکی درێژ و کاڵی بەردابووەوە. بەڕاستی پێویستم بە ئافرەتێکبوو لەسەر دوورگەکە. لە ئەڵمانیا کچێکم دەستنیشانکردبوو کە ناوی "ستینا" بوو. ئاخ، هاوار بەماڵم... ئەویش دەستگیرانەکەی لەناو دەریادا ونبوو»

پیاوە پیرەکە دەستێکی بەڕیشیدا هێنا، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەبێ دەنگی مایەوە. دواتر گوتی؛

«ئێستاکە درەنگە برادەر. وابزانم ڕووداوی کەشتی تێکشانەکەشت، بەتەواوەتی شەکەت و ماندووی کردویت. پێت باشتر نیە گەر سبەینێ لەسەر باسەکەمان بەردەوامبین؟»

«نا، نا. بەهیچ جۆرێک. حەزدەکەم هەموویم بۆ بگێڕیتەوە»

«بێگومان وایە. بەهەرحاڵ باشترە بەر لەوەی ئاهەنگی جۆکەر دەستپێبکات، تۆ هەموو شتێک بزانیت»

«ئاهەنگی جۆکەر؟»

«بەڵێ، ئاهەنگی جۆکەر!»

لەوێدا هەستایە سەرپێ و کەمێک هات و چۆیکرد. پاش نەختێک گوتی؛

«بەڵام خۆ برسیت بووە؟»

نەمتوانی نکۆڵی لەوەیان بکەم. پیاوە پیرەکە خۆیکرد بە چێشتخانە بچکۆلەکەیدا و لەناو چەند قاپێکی جوانی شوشەدا کۆمەڵێک خواردنی هێنا. لەسەر مێزەکەی نێوان هەردووکماندا دایینا.

وامزانی خواردنی سەر دوورگەکە ساکار و سادەیە، بەڵام فرۆد یەکەمجار قاپێکی پڕ لە نان و کێکی دانا. دواتریش چەندین جۆری



پەنیر و گۆشت و ماسی هێنا. ئەوجا سوراحیەک شیریشی خستە سەر مێزەکە، ڕەنگێکی سپی و جوانی هەبوو. هەر زوو زانیم کە شیری "مۆلووک"ە. بۆ پاش نانخواردنیش، بەلەمێک میوەی خستە بەردەمم، دە بۆ پانزە میوەی جۆراوجۆری لەسەربوو. من تەنها سێو و پرتەقاڵ و مۆزم دەناسیەوە، میوەکانی تریش تایبەتبوون بە دوورگەکە.

بەرلەوەی فرۆد دەستبکاتەوە بە باسەکەی، بۆ ماوەیەک نان و میوەمان خوار.

تامی نان و پەنیرەکە کەمێک جیاوازتربوون لە تامی ئەو نان و پەنیرانەی لەوەوپێش خواردبوومن. هەروەها تامی شیرەکەش جیاوازبوو، لەشیری مانگا زۆر چەورتربوو. بەڵام گەورەترین جیاوازی تامم لەو کاتەدا بۆ دەرکەوت کە کەوتینە میوە خواردن. تامی هەندێکیان هەر بەتەواوەتی لە تامی هەموو میوەیەکی تر جیاوازبوو. بەخۆم نەبوو، جارجارێک لەسەر کورسیەکە بۆی دەجوڵامەوە و دەمگوت "ئممم".

پاش نەختێک پیاوە پیرەکە گوتی؛

«قەت لە خواردندا هیچ کەموکوڕیەکم نەبووە»

میوەیەکی بە ئەندازەی کولوکەیەک هەڵگرت و قاژێکی لێکردەوە، ناوەکەی هەروەک مۆز زەرد و نەرمبوو. پاشان درێژەی بە قسەکانیدا و گوتی؛

«بەیانیەکیشیان ڕوویدا... ئەو شەوە زیاد لەڕادە خەوم بینیبوو. بەیانی زووەکەی لە کوخەکەمدا هاتمە دەرەوە، هێشتام شەونم هەر بە گیاکانەوەبوو و خۆریش هێدی هێدی لەسەر چیاکانەوە هەڵدەهات. لەپڕێکدا لەخوارەوەی قەدپاڵەکەوە بینیم دوو کەس بەرەوڕووم دەهاتن. منیش بەرەوڕوویان ڕۆیشتم، وامزانی لەدواجاردا چەند



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



كەسێک هاتوونەتە سەر دوورگەكە. لەو كاتەدا كە لێیان نزیكبوومەوە و زانیم كێن، خەریكبوو دڵم لە قەفەزەی سنگمەوە بێتە دەرەوە؛ كوڕی سینەک و پاشای كوپ بوو.

یەكسەر لەدڵی خۆمدا گوتم "بێگومان هێشتام هەر لە كوخەكەمدام و خەو دەبینم، ئەم بینینە بەدەگمەنەش تەنها خەوێكە و هیچی تر". لە هەمان كاتیشدا بەتەواوەتی دڵنیابووم لەوەی كە هەر زۆر بەخەبەربووم. بەڵام زۆرجاریش خەوم دەبینی و نەمدەتوانی دڵنیابم. هەردووكیان بەشێوەیەک سەلامیان لێكردم، هەردەتگوت برادەری كۆنی یەكترین. لەڕاستیشدا بەشێوەیەک لە شێوەكان هەر واشبووین!

پاشای كوپ گوتی؛

«چ بەیانیەكی خۆشە فرۆد»

ئەو وشانە یەكەمین ڕستەبوو كەلەسەر ئەم دوورگەیەدا لە زاری كەسێكەوە هاتە دەرەوە، كە خۆم نەبێت. ئینجا كوڕەكەش گوتی؛

«ئەمڕۆ دەبێت شتێكی بەسوود بكەین»

پاشاكەش وەڵامی دایەوە و گوتی؛

«فەرمانی من ئەوەیە كە كوخێک دروستبكەین»

هەرواشمان كرد. لەسەرەتادا لە كوخەكەی مندا شەویان كردەوە. پاش یەک دوو ڕۆژێكیش هەر لەخوار خۆمەوە كوخێكی نایاب و جوانمان دروستكرد و گواستیانەوە ناوی.

هەردووكیان بوون بە برادەرێكی گیانی بەگیانیم و وەک خۆم وابوون - تەنها یەک جیاوازیمان هەبوو؛ ئەوان هەرگیز بیریان لەوە نەدەكردەوە كە بەرێزایی ئەو هەموو ساڵە وەكو من لەسەر ئەم دوورگەیەدا نەژیاون. شتێک لەناوەوەیاندا وایلێدەكردن ئەو ڕاستیە نەبینن كە ئەوان لە بنەڕەتدا لە خەیاڵی مندا چنراوون و هیچی تر.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

هیچ شتێک نیە لەو شتانەی كە لە ناوەوەماندا دەیانخوڵقێنین، خۆیان لە خۆیان بەئاگابن. بەڵام ڕێک ئەو خەیاڵەی من وەكو هەموو وێناكردنە خەیاڵیەكانی تر نەبوو. لەوێدا بەشێوەیەكی سەیر و نارون بەئاراستەیەكی تردا ڕۆیشت؛ لەناو بۆشایی خوڵقاندنی هزرمەوە هاتە دەرەوە و خۆیان لەناو بۆشایی خوڵقێنراوی ژێر ئاسماندا بینیەوە»

لەوێدا بەتوندی هەناسەیەكم هەڵكێشا و گوتم؛

«بەڵام ئەوە... ئەوە ڕییتێناچێت»

فرۆدیش لەسەر قسەكانی خۆی هەر بەردەوامبوو؛

«بەرە بەرە ژمارەیان زیادی دەكرد. من شتێكم زۆر بەلاوە سەیربوو؛ هاتنی كەسانی نوێ بەلای كۆنەكانەوە زۆر ئاساییبوو. هەروەک ئەوە وابوو كە دوو كەس لەناكاودا لەناو باخێكدا چاویان بەیەک دەكەوێت. هیچیان هەڵسوكەوتێكی سەیر ناكات، تەنها لەبەرئەوەی یەكێكیان لەپێش ئەوی ترەوە لەوێدابووە.

كورتەبنەكان بەشێوەیەک قسەیان لەگەڵ یەكتردا دەكرد، هەر دەتگوت بۆ ماوەیەكی دوورودرێژە یەكتری دەناسن. بێگومان لەڕاستیشدا بەشێوەیەک یەكتریان دەناسی. دەتوانین بڵێین بۆ ماوەی چەندین ساڵی دوورودرێژ پێكەوەبوون لەسەر ئەم دوورگەیە، چونكە من خەونیش و زیندە خەونیشم بەوەوە دەبینی كە كەسایەتیەكان قسەیان لەگەڵ یەكتردا دەكرد.

پاش نیوەڕۆیەكیان لەم خوارانەوە لەناو دارستانەكەدا پیاسەمدەكرد، لەوێدا بۆ یەكەمین جار بللی كوپم بینی. وابزانم ئەو لەدەوروبەری ناوەڕاستی دەستەی كاغەزەكاندا بوو. بەهەرحاڵ نە لەسەرەتادا دامەدنا و نە لە كۆتاییشدا.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



لەپێشدا ئەو منی نەبینی، بەرێگادا دەڕۆیشت و لەبەرخۆیەوە ئاوازێکی خۆشی دەخوێند. منیش وەستام و فرمێسک بەچاوەکانمدا هاتنە خوارەوە. ئاخر یەکسەر "ستینا"ی دەستگیرانم بیرکەوتەوە.

غیرەتم دایە بەرخۆم و بەهێواشی بانگم کرد؛

«بللی کوڕ»

تەماشایەکی کردم و بەرەورووم هات. دەستی کردە ملم و گوتی؛

«زۆر سوپاست دەکەم فرۆد... تۆ منت دۆزیەوە. ئاخر بەبێ تۆ دەبێ من چیم بکردایە؟»

پرسیارێکی زۆر بەجێ و ماقوڵی کرد. لەڕاستیدا ئەو بەبێ من هیچی بۆ نەدەکرا. بەڵام ئەو خۆی بەئاگا نەبوو لەوە. هەرگیزیش نابێت ئەوە بزانێت.

لێوەکانی هەر زۆر سوور و نەرمبوون. حەزمدەکرد ماچییبکەم، بەڵام شتێک ڕێگەی لێدەگرتم.

بەرەبەرە خەڵکانی سەر دوورگەکە رووی لەزیادبوون دەکرد، ئێمەش خانوی نوێمان بۆ دروستدەکردن. ئا بەو شێوەیەش لادێیەکی تەواو بەچواردەورمدا دروستبوو. چیتریش هەستم بە تەنهایی نەدەکرد. کۆمەڵگایەکمان پێکهێنا و هەریەکەمان کارێکی تایبەتیمان هەبوو.

هەر لە سی چل ساڵێک لەمەوبەرەوە هەموو 52 کەسایەتی یاریەکە دەرکەوتن. تەنها یەکدانەیان دواکەوت؛ "جۆکەر"، ئەو دواهەمین کەس بوو کە لەدایکبوو، ئەو شانزە بۆ حەڤدە ساڵێک لەمەوبەر خۆی لەسەر دوورگەکەدا نیشاندا. ئێمە خەریکبوو لەگەڵ شێوازی ژیانی نوێماندا خۆمان ڕادەهێنا، بەڵام ئەو وەک کەسێکی گێرەشێوێن هاتە ناو ژیانە ئارامەکەمانەوە. بەڵام پاشان دێمە سەر ئەو باسە. هانس... بەیانیش





سەرلەنوێ ڕۆژ دەبێتەوە. ژیانی سەر ئەم دوورگەیە فێری ئەوەی کردووم کە هەمیشە ڕۆژێکی نوێ هەر دێت»

ئەو شتانەی فرۆد بۆمی دەگێڕایەوە، هێندە سەرنجراکێشەربوون کە تا ئێستاکەش وشە بەوشەیم لەیادە.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت "ئاخر چۆن 53 "وێنەی خەیاڵیی" وەک مرۆڤی ڕاستەقینەی زیندوو دێنە دونیای ڕاستەقینەوە؟ لەپڕێکدا دیسانەوە گوتم؛

«ئەوە... ئەوە ڕێیتێناچێت؟»

فرۆد سەرێکی لەقاند و گوتی؛

«لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا هەموو کاغەزەکان توانیان لە ئاگاییمەوە دزەبکەن و بێنە سەر ئەو دوورگەیەی کە خۆمی لەسەر دەژیام. لەوانەشە من بە ئاڕاستەکەی تردا ڕۆیشتبم؟ کێ دەزانێت؟ بەلایەنی کەمەوە ئەوەش بوارێکبوو و بەردەوام هەڵمدەسەنگاند.

ڕاستە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەگەڵ ئەو برادەرە نوێیانەمدا ژیاوم، وە ڕاستیشە کە پێکەوە لادێکەمان ئاوەدانکردەوە، پێکەوە نانمان لێدەنا و پێکیشەوە دەمانخوارد، بەڵام هەمیشە پرسیارم لە خۆمدەکرد و دەمگوت "بڵێیت ئەو کەسانەی چواردەورم ڕاستەقینەبن؟ بڵێیت من نەچووبێتمە ناو جیهانێکی خەونی هەتاهەتاییەوە؟ بڵێیت ون نەبووبم -نەک تەنها لەسەر دوورگەکە- بەڵکو لە فەنتاسی خۆمدا؟ ئەگەر وابێت؛ کەواتە بڵێیت ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێگای گەڕانەوە بۆ ناو هەقیقەت بدۆزمەوە؟".

بەڵام ئەو کاتەی کە کوڕی دینار تۆی هێنا بۆ لام، ئیدی دڵنیابووم کە لە ژیانێکی ڕاستەقینەدا دەژیم. بەڕاست، خۆ تۆ جۆکەرێکی نوێی دەستەکە نیت، هانس؟ بڵێیت تۆشم بەخەیاڵ دروستکردبێت؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



**پیاوە پیرەکە تەماشایەکی کرد و بەڕاستی پەرۆشی وەڵامێک بوو. لەبەرئەوە بەپەلە گوتم؛**
**«نا، نا. منت لە خەیاڵ هەڵنەچنیوە. ببوورە پرسیارەکە هەڵدەگێڕمەوە؛ ئەگەر تۆ خەو نەبینیت، کەواتە من خەو دەبینم. ئەو کاتەش من خەو بە هەموو ئەو شتە خەیاڵیانەوە دەبینم کە تۆ دەیانگێڕیتەوە...»**

لەپڕێکدا باوکم لەسەر جێگاکەیدا خۆی هەڵگێڕایەوە. منیش خۆم هەڵدایە سەر زەویەکە، پانتۆڵەکەم ڕاکێشا و بە هێواشی کتێبە بچکۆلەکەم خنی بە گیرفانێکیدا.
ڕاستەوڕاست خەبەری نەبووەوە. چوومە لای پەنجەرەکەوە و لەپشت پەردەکانەوە وەستام. لەدوورەوە وشکانیم دەبینی، بەڵام زۆر بەلامەوە گرنگ نەبوو، چونکە هەموو بیرکردنەوەکانم لە شوێنێکی تربوون... لەڕاستیدا لە کاتێکی تریشدا بوون.
خۆم بە خۆم دەگوت ئەگەر ئەو شتانەی فرۆد بۆ هانسی دەگێڕێتەوە بەڕاستی ڕوویاندابێت، کەواتە من گەورەترین چیرۆکی هونەری یاری کاغەزم خوێندۆتەوە. چونکە خۆی لە خۆیدا شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە گەر بتوانیت دەستەیەک یاری بە جادوو بهێنیتە بوون. بەڵام ئەگەر وا لە هەر 53 کاغەزەکە بکەیت کە پڕبن لە ژیان و لەسەر ئەم زەویە بژین، ئەوا ئەوساکە جادووەکە دەچێتە قاڵبێکی تەواو جیاوازەوە. بێگومان فێربوونی ئەو کارەش چەندین ساڵی پێدەچێت.
بەڵام ئەگەر ژیان جادوویەک بێت، کەواتە دەبێت جادووگەرێکیش بوونی هەبێت. ئومێدەوارم ڕۆژێک لە ڕۆژان پەردە لەسەر ڕووی





هەڵماڵم، بەڵام دەرخستنی فێڵێکی ئاوها ئاسان نیە، بەتایبەتیش کاتێک کە جادووگەرەکە خۆی لەسەر شانۆ نیشان نادات.
نەختە نەختە لە وشکانی نزیک دەبووینەوە و لەو کاتەدا کە باوکم سەری هێنایە ئەو دیو پەردەکەوە و وشکانی بینی، بەتەواوەتی شڵەژا و گوتی؛
«هێندەی نەماوە بگەینە وڵاتی فەیلەسوفەکان»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**کچی سینەک**

**...بەرلەوەی ڕابکات، دەبوایە ناوی خۆی لەسەر ئافەریدەکانی بنووسیبایە...**

دواتر هەر کە گەیشتینە "پیلۆپۆنیس"، باوکم خێرا ژمارەیەکی هەمان ئەو گۆڤارەی کڕی کە کاتی خۆی پوری لە دوورگەی "کریێتا"دا کڕیبووی. لەو شارە قەراغ دەریایە قەرەباڵغەدا، بۆ نانخواردنی بەیانی لە چێشتخانەیەکی سەر یەکێک لە گۆڕەپانەکاندا دانیشتین. داوای قاوە و شەربەت و نان و مرەبای گێلاسمان کرد، لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی خواردنەکەمان بووین، باوکم وردە وردە گۆڤارە ئافرەتانەکەی هەڵدەدایەوە و چاوی پێدا دەخشاند. لەپڕێکدا گوتی؛

«بەڕاست!»

گۆڤارەکەی هەڵگێڕایەوە و لاپەڕەیەکی نیشاندام، وێنەیەکی دایکم بە پڕاوپڕی پەڕەکەوە بوو. یەکجار وەکو ئافرەتەکانی سەر کاغەزی یاریەکەی کە باوکم لە "فیرۆنا"دا کڕی، ڕووت نەبوو. بەهەرحاڵ بەلایەنی کەمەوە دەکرا لەم بووردرێت، چونکە بەئاشکرا دیاربوو کە ڕیکلامەی بۆ جلەبەرگێکی مەلەوانی دەکرد.

باوکم گوتی؛

«لەوانەیە دایکت لە ئەسینادا بدۆزینەوە، بەڵام دیارە بردنەوەی لەگەڵ خۆماندا بۆ ماڵەوە هەروا ئاسان نابێت»

چەند شتێک لە خوارەوەی پەڕەکەوە نووسرابوو، باوکیشم بەتەواوەتی نەیدەتوانی لێیتێبگات، چونکە بە یۆنانی نووسرابوون. نەک تەنها مانای وشەکانیان سەختە، بەڵکو شێوەی نووسینیشیان



ئاسان نیە، چونکە یۆنانیەکان تا ئێستاکەش زمانی نووسینیان نەگۆڕیوەتە سەر پیتە لاتینیەکان.

نانی بەیانیان بۆ خستینە سەر مێزەکە، بەڵام باوکم تەنانەت کوپی قاوەکەشی بەرزنەکردەوە. لەبری ئەوە گۆڤارەکەی هەڵگرت و خۆی گەیاندە لای خەڵکانی چواردەورمان، بەدوای کەسێکدا دەگەڕا کە ئینگلیزی یان ئەڵمانی بزانێت. لە دواجاردا چەند گەنجێکی دۆزیەوە. گۆڤارەکەی بۆ درێژکردن و داوای لێکردن وشە بچکۆلەکانی خواری خوارەوەی بۆ وەربگێڕن. گەنجەکان ئاوڕیان لێدەدامەوە و تەماشایان دەکردم، منیش شەرم گرتمی. هەر بۆ خۆم دانیشتبووم و ئومێدەواربووم باوکم لێیان تووڕەنەبێت و بڵێت ئێوە ئافرەتێکی نەرویجیتان دزیووە یان شتێک لەو بابەتە.

باوکم گەڕایەوە لام و ناوی ئەو شوێنەی نووسیبوو کە ڕیکلامەکەی دەرکردبوو، ئەوجا هەر وا بەئاسانی گوتی؛

«وا هاتین»

بێگومان گۆڤارەکە وێنەی چەندین ئافرەتی تریشی تێدا بوو، بەڵام باوکم هەر وێنەکەی دایکمی بەلاوە گرنگبوو. بە هێواشی ئەو لاپەڕەیەی لێکردەوە و دواتر گۆڤارەکەی فڕێدایە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە. تاڕادەیەک لەوەدەچوو کە جۆکەرێک لە دەستەیەک یاری کاغەز دەربهێنێت و باقیەکەی فڕێبدات.

نزیکترین ڕێگا بەرەو ئەسینا بەسەر کەناڵە بەناوبانگەکەی "کۆرینت"دا دەڕۆیشت. بەڵام ئەگەر باوکم لاڕێگایەکی گرنگتری بزانیبایە، ئەوا هەمیشە لاڕێگاکەی هەڵدەبژارد، نەک نزیکترین ڕێگا.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



لەڕاستیدا پێیخۆشبوو سەردانی فاڵگرەوەکەی "دێلفی" بکات و شتێکی لێبپرسێت. واتە دەبوایە بە پاپۆڕ کەناڵی "کۆرینت"مان ببڕیایە و دواتریش لەسەروی کەناڵەکەوە بەناو "دێلفی"دا بکەوتینایەتەوە ڕێ. تەنها نیو ساعاتێک لەناو پاپۆڕەکەدا ماینەوە و دواتریش پاش چەند کیلۆمەترێک گەیشتینە شارێکی بچوک کە پێیان دەگوت "نافپاکتۆس". لەوێدا لاماندا و لەگۆڕەپانێکدا شەربەت و قاوەمان خواردەوە، شوێنەکەمان بەسەر قەلایەکی "فێنیسیایی"دا دەیڕوانی.

بێگومان بیرم لە دایکم دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئاخۆ چی ڕوودات لەو کاتەدا کە لە ئەسینادا دەیبینین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خەیاڵێکم هەر لای ئەو شتانەبوو کە لە کتێبە بچکۆلەکەدا خوێندبوومنەوە. دەمویست بەبێ ئەوەی نهێنیەکەی خۆم ئاشکرابکەم، ڕێگەیەک بدۆزمەوە و بیرکردنەوەکانم بە باوکم بڵێم.

باوکم دەستی بۆ بۆیەکە بەرزکردەوە و داوای حسابەکەمانی کرد، منیش لەو کاتەدا گوتم؛

«بابە... تۆ بڕوات بە خوا هەیە؟»

کەمێک داچڵەکی گوتی؛

«بەم پێش نیوەڕۆیە... پێت وانیە هێشتام زوو بێت بۆ ئەو باسانە؟»

تا ڕادەیەک منیش لەگەڵیدا تەبابووم، بەڵام خۆ ئەو نەیدەزانی ئەو بەیانیە زووە لەو کاتەدا کە ئەو خەوتبوو من لە کوێ بووم. خۆزگە دەیزانی. ئەو خۆی چەندەها بیرۆکەی زیرەکانە و جۆراوجۆری بە مێشکدا دەهات و دەچوو، جارجارێکیش هونەرێکی جوان و سەرنجراکێشەری کاغەزی نیشان دەدام. بەڵام من دەستەیەک کاغەزی یاریم بینی، کە وەک مرۆڤی زیندووی لە گۆشت و خوێن پێکهاتوو،



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەژێر ئاسمانێکی شیندا لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر دەهاتن و دەچوون.

پاش کەمێک گوتم؛

«ئەگەر بەڕاستی خودایەک هەبێت، ئەوا یاری چاوشارکێ لەگەڵ ئافەریدەکانیدا دەکات و دەستێکی باڵاشی لەو یاریەدا هەیە»

باوکم بە دەنگێکی قرخنەوە پێکەنی، بەڵام هەستمدەکرد بەتەواوەتی لەگەڵمدایە. دواتر گوتی؛

«لەوانەیە لەو کاتەدا کە چاوی بە ئافەریدەکانی خۆی کەوتبێت، بەتەواوەتی دڵی داخورپابێت. دواتریش هەموو شتێکی بەجێهێشتووە و ڕایکردوە لەدەستیان. ئەزانیت چۆن... سەختە بزانین کامیان زیاتر داچڵەکیوون؛ ئادەم یان خودا. پێموابێت جۆرە خوڵقاندنێکی ئاوها هەردوولا وەک یەک دەترسێنێت. بەڵام بەبڕوای من بەلایەنی کەمەوە بەرلەوەی ڕابکات، دەبوایە ناوی خۆی لەسەر ئافەریدەکانی بنووسیبایە»

«ناوی خۆی بنووسیبایە؟»

«بێگومان دەیتوانی ناوی خۆی لەسەر تاشەبەردێکی چیایەک یان شتێک لەو بابەتە جێبهێشتایە»

«کەواتە تۆ بڕوات بە خودا نیە؟»

«من وام نەگوت. من ڕێک لەوەوپێش گوتم خودا لەئاسماندا دانیشتووە و پێمان پێدەکەنێت، چونکە بڕوای پێناکەین»

لەدڵی خۆمدا گوتم "ڕێک"، بیرم دێت لەوەوپێش لە هامبۆرگدا قسەیەکی قۆڕی ئاوهای کرد.

باوکم درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی؛

«ڕاستە هیچ ناونیشانێکی دانەناوە، بەڵام لەدوای خۆی جیهانێکی بەجێهێشتووە. بەبڕوای من ئەوە بەسە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





کەمێک بیریکردەوە و گوتی؛
«جارێکیان ئەستێرەناسێک و پزیشکێکی نەشتەرگەری مێشک مشتومڕی ئاینیان دەکرد، هەردووکیان ڕوسیبوون. ئەستێرە ناسەکە مەسیحی نەبوو، بەڵام پزیشکەکە مەسیحی بوو. ئەستێرە ناسەکە بە شانازیەوە گوتی؛ "من زۆر کەڕەت چوومەتە ئاسمان، بەڵام هەرگیز نە خودام بینی و نە فریشتەش". پزیشکەکەش بۆ ماوەیەک دەمی داپچڕی، بەڵام پاشان وەڵامی دایەوە و گوتی؛ "منیش نەشتەری چەندەها مێشکی زیرەکم کردووە، بەڵام هەرگیز یەک "بیر"یشم نەبینیووە"»
ئەوجا من دەمم داپچڕی و گوتم؛
«هەر ئێستا ئەم باسەت هۆنیەوە، وانیە؟»
سەری ڕاوەشاند و گوتی؛
«نا، ئەوە یەکێک بوو لەو نوکتانەی کە مامۆستای فەلسەفەکەمان لە شاری "ئارەنداڵ"دا بۆی دەکردین»
لەڕاستیدا کاتی خۆی باوکم لە زانکۆی ئازاددا تاقیکردنەوەیەکی فەلسەفەی داوە و بەو شێوەیەش شەهادەی فەلسەفەی وەرگرتووە. هەموو کتێبەکانی لەووبەر خوێندبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پایزی پێشوو لە قوتابخانەیەکی ئارەنداڵدا بەشداری لەو وانانەدا کرد کە تایبەتن بە مێژووی فەلسەفە.
بێگومان باوکم هێندەی بەلاوە بەس نەبوو کە بڕوات و گوێ بۆ "پرۆفیسۆر"ەکەی قوتابخانە شلبکات. نا، نا... جارجارێکیش بانگهێشتی دەکردە ماڵەوە بۆ "هیسیۆ". ئەوسا دەیگوت "خۆ نەمدەتوانی هەروا لە ئوتێلی شارەکەدا بەجێی بهێڵم". ئا بەو شێوەیە ئەویشم ناسی. ئەو پیاوە زۆر چەنەبازبوو و هەرگیز دەمی



نەدەوەستا. ئەویش هەروەک باوکم خولیای دۆزینەوەی هەقیقەتە هەتاهەتاییەکان بوو. تەنها جیاوازیشیان لەوەدابوو کە "پرۆفیسۆر"ەکە هەروا بۆ خۆشی دوای ئەو بابەتە کەوتبوو، بەڵام باوکم بە ڕاستی سەرقاڵی فەلسەفەبوو.
باوکم دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە قەڵا فێنیسیاییەکە، دواتر گوتی؛
«هانس تۆماس، خودا مرد... ئێمە کوشتمان»
ئەو ڕستەیە زۆر هاژاندمی، هاوکاتیش بەڕاستی لێی تێنەدەگەیشتم. لەبەرئەوە هیچ وەڵامێکم نەدایەوە.

پاش ئەوەی لە کەناڵی کۆرینت تێپەڕین و بە ناوچە شاخاویەکاندا بەرەو "دێلفی" سەردەکەوتین، بەلای چەند باخێکی زەیتونی بێکۆتایدا تێپەڕین. دەمانتوانی هەر هەمان ڕۆژ بگەینە ئەسینا، بەڵام باوکم گوتی "ئێ خۆ ناکرێت هەروا بەخێرایی بەلای "دێلفی"دا تێپەڕین، خۆ دەبێت سەردانێکی باشی ئەو شوێنە پیرۆز و دێرینە بکەین".
بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە "دێڵفی" و لە سەرووی ئەو شارە بچوکەدا لە ئوتێلێکدا دابەزین کە بەسەر کەناڵی کۆرینتدا دەیڕوانی، تابڵێیت دیمەنێکی دڵگیربوو. چەندەها ئوتێلی تریشی لێبوو، بەڵام باوکم ئەو دانەیەیانی هەڵبژارد کە جوانتر بەسەر دەریادا دەیڕوانی.
لە ئوتێلەکەوە بەرەو ناوچە بەناوبانگەکەی پەرستگاکان کەوتینە ڕێ، تەنها یەک دوو کیلۆمەترێک لە خۆرهەڵاتیەوە دووربوو. لەناوچەیەکی هەڵکەندراو نزیکبووینەوە، لەوێدا دەمی باوکم هەردەتگوت چیکەنەیە، بەهیچ جۆرێک نەدەوەستا؛
«خەڵکی بەدرێژایی سەدە کۆنەکان دەهاتنە ئێرە و داوای ئامۆژگاریان لە "ئەپۆلۆ"ی فاڵگرەوە دەکرد. پرسیاریان سەبارەت بە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



هەموو شتێک دەکرد، بۆ نمونە؛ کێ بهێنن و کێ نەهێنن، بەرەو کوێ سەفەربکەن، کەی لەگەڵ وڵاتانی تردا بکەونە شەڕەوە، لەسەر چساڵنامەیەک بڕۆن و هتد»
لەوێدا لێمپرسی؛
«فاڵگرتنەوە چیە؟»
باوکم کەوتە باسکردن و گوتی کاتی خۆی "زیۆس"ی خواوەند دوو هەڵۆی بەئاسماندا هەڵداوە، بۆئەوەی هەر یەکەیان لەلایەکی ئاسمانەوە بەدەوری زەویدا بفڕێ. دواتر لە "دێلفی"دا یەکتریان گرتۆتەوە، لێرەشەوە یۆنانیەکان لەو بڕوایەدابوون کە "دێلفی" ناوەڕاستی جیهان بێت. دواتر "ئەپۆلۆ" هاتووە و ویستویەتی لە "دێلفی"دا نیشتەجێ ببێت، بەڵام بەرلەوە دەبوایە ئەژدیها ترسناکەکەی بکوشتایە کە ناوی "پیسۆن"بوو. هەربۆیە دواتر ناوی ژنە قەشەکەیان نا "پیسیا". ئەوجا "ئەپۆلۆ" ئەژدیهاکە دەکوژێت و دەبێت بە مار. پاشانیش هەمیشە ئەو مارە لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو شوێنێک دەبات.
دەبێت دان بەوەدا بنێم کە زۆربەی ئەو شتانەی باوکم باسی کردن، من لێی تێنەدەگەیشتم. تەنانەت هەر وەڵامی پرسیارەکەشمی نەدایەوە و پێی نەگوتم "فاڵگرەوە" چیە. بەڵام ئیتر وا خەریکبوو لە شوێنی چوونەژورەوەی پەرستگاکە نزیک دەبووینەوە. پەرستگاکە کەوتبووە پانتاییەکی خواروی شاخی "پاتناس"ەوە. کاتی خۆی "نۆ



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

خواژنەکە"[25] لەو چیایەدا ژیاوون و بەهرەی هونەرییان بە مرۆڤ بەخشیوە.
بەرلەوەی بچینە ژورەوە، باوکم گوتی دەبێت لەپێشدا لە ئاوی کانیە پیرۆزەکە بخۆینەوە. کانیەکە کەمێک لە خواروی شوێنی چوونە ژورەوەی پەرستگاکەوەبوو. دواتر گوتی هەموو ئەو کەسانەی کە دەچنە ئەو شوێنە پیرۆزەوە، دەبێت لەپێشدا لێرەدا خۆیان پاکبکەنەوە. جگەلەوەش دەیگوت هەر کەسێک لەو ئاوە بخواتەوە حیکمەت و بەهرەی شیعری بۆ دێت.
چوینە ناو پەرستگاکەوە و باوکم نەخشەیەکی کڕی، کە شێوەی پەرستگاکەی بەر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەری نیشاندەدا. من نەخشەکەم زۆر بەدڵبوو، چونکە جگە لە چەند پاشماوەیەکی ئێرە و ئەوێ هیچی تری نەمابووەوە.
لەپێشدا بەلای چەند پاشماوەیەکدا تێپەڕین کە کاتی خۆی ژووری باجدانی گومرگ بووە. لەو سەردەمەدا هەر کەسێک داوای ئامۆژگاری لە "ئەپۆلۆ" بکردایە، دەبوایە دیاری نایابی بۆ بهێنایە و لە چەند خانویەکی تایبەتیدا کۆیاندەکردەوە. بێگومان ئەو خانوانەش لەلایەن وڵاتە جیاوازەکانی ئەو سەردەمەوە دروستکرابوون.
گەیشتینە لای پەرستگا گەورەکەی "ئەپۆلۆ" و لەوێدا باوکم بەشێوەیەکی باشتر مانای "فاڵگرەوە"ی بۆ ڕوونکردمەوە و گوتی؛
«ئەو پاشماوانەی کە لێرەدا دەیبینیت، کاتی خۆی پەرستگا گەورەکەی "ئەپۆلۆ" بووە. لەناو پەرستگاکەدا بەردێکی داتاشراوی گەورەیان

[25] ئەو خواژنانەی کە لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا هەریەکەیان جۆرە هونەرێک یان زانستێکیان هەبووە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



داناببوو و پێیان دەگوت "ناوک"، چونکە یۆنانییەکان ئەم پەرستگایەیان بە ناوکی جیهان داناوە. بەدەر لەوەش پێیان وابووە "ئەپۆلۆ" بەلایەنی کەمەوە بەشێکی ساڵەکە لەناو ئەم پەرستگایەدا ژیابێت. خەڵکیش دەهاتن و داوای ئامۆژگاریان لەو دەکرد. ئەویش لە رێگای "پیسیا"ی ژنە قەشەوە دەدوا. ئەمیش لەسەر کورسیەکی سێ قاچ دادەنیشت کە لەسەر درزێکی زەوی دانرابوو. هەندێ گاز لە درزەکەوە دەهاتە دەرەوە و پیسیای گێژ دەکرد، رێک لە رێگەی ئەو گێژبوونەشەوە دەبووە زمانی حاڵی ئەپۆلۆ. خەڵکی دەهاتنە دێلفی و پرسیارەکانیان دەبردە لای قەشەکانی شارەکە. ئەوانیش دەیانگەیاندە پیسیا. وەڵامە دژوار و پڕ نهێنییەکانی ئەمیش، قەشەکانی ناچاردەکرد سەر لەنوێ وەڵامەکان وەرگێڕنەوە. بەم شێوەیەش یۆنانیەکان سوودیان لە حیکمەتی ئەپۆلۆ وەردەگرت، چونکە بە بڕوای ئەوان ئەپۆلۆ هەموو شتێکی دەربارەی رابووردوو و داهاتووش دەزانی»

ئەوجا من پرسیارمکرد و گوتم؛

«ئەی باشە ئێمە پرسیاری چی بکەین؟»

باوکیشم لەوەڵامدا گوتی؛

«بزانین "ئەنیتا" لە ئەسینادا دەدۆزینەوە. تۆ ببە بە قەشەکە و پرسیاربکە، منیش دەبم بە "پیسیا" و وەڵامێکی خوایانەت دەدەمەوە»

باوکم لەبەردەم پاشماوەکانی پەرستگا بەناوبانگەکەی "ئەپۆلۆ"دا دانیشت و وەک شێت سەر و دەستی بەملاولادا بادەدا. هەندێک گەشتیاری فەرەنسی و ئەڵمانی لەو کاتەدا بەوێدا تێدەپەڕین، لەترساندا گەڕانەوە دواوە، بەڵام من زۆر بە راستی لێمپرسی؛

«لە ئەسینادا "ئەنیتا" دەبینین؟»





دیاربوو باوکم چاوەڕوانی هێزی "ئەپۆلۆ"بوو کە کاری تێبکات. پاش کەمێک گوتی؛

«کوڕە گەنجەکەی وڵاتی دوور... لەنزیک پەرستگا کۆنەکەوە... چاوی بە ژنە جوانەکە دەکەوێت»

هەر خێرا وەکو خۆی لێهاتەوە. بەدڵێکی خۆشەوە سەرێکی لەقاند و گوتی؛

«هێندەمان بەسە... هەرگیز وەڵامەکانی "پیسیا" هێندە ورد و روون نەبووە»

بەڵام وەڵامەکەی بەلای منەوە هێندە روون نەبوو، چونکە نەمدەزانی ئەو کوڕە گەنجە کێیە و ئەو ژنە جوانە کێیە و ئەو پەرستگا کۆنە لە کوێدایە. دواتر گوتم؛

«وەرە با شێروخەتی بۆ بکەین و بزانین دایکم دەدۆزینەوە. ئەگەر ئەپۆلۆ بتوانێت قسە بخاتە سەر زاری تۆ، ئەوا دەشتوانێت دەسەڵاتی بەسەر پارەیەکی ئاسنیشدا هەبێت»

باوکم ڕازیبوو و بیست درهەمیەکی دەرهێنا. لەسەرئەوە رێک کەوتین کە ئەگەر "شێر" بێت، ئەوا دایکم لە ئەسینادا دەبینین. پارەکەم بەئاسماندا هەڵدا و بەپەرۆشەوە تەماشای سەر زەویەکەم کرد.

"شێر" بوو! بەڕاستی بە "شێر"دا کەوتبووەوە. لای "شێر"ی پارەکە تەماشای دەکردین، هەر دەتگوت چەندەها هەزار ساڵە لەسەر ئەو زەویە کەوتووە و چاوەڕوانی ئێمە بووە کە بەلایدا بڕۆین و بیدۆزینەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



**پاشای سینەک**

**...ئەو پێیوابوو هیچی وا دەربارەی ژیان نازانێت و ئەوەش ئازاریدەدا...**

پاش ئەوەی "فاڵگرەوە"کە دڵنیای کردین کە دایکم لە ئەسینادا دەبینین، بەرەو سەروتری ناوچەکە کەوتینە ڕێ و چاومان بە شانۆیەکی کۆن کەوت کە جێگای 5000 بینەری هەبوو. لەسەری سەرەوەی شانۆکەوە تەماشای ناوچەی پەرستگاکەمان دەکرد، لەوێوە هەتا خواری خوارەوەی دۆڵەکەمان لێوە دیاربوو.

لەڕێگای هاتنە خوارەوەماندا باوکم گوتی؛

«هانس تۆماس، هێشتام شتێکی تریش ماوە دەربارەی "فاڵگرەوە"کە کە پێت بڵێم. دەزانی چۆن... ئەم شوێنە بەلای ئێمەی فەیلەسوفەوە گرنگیەکی تایبەتی هەیە»

لەسەر هەندێک لە پاشماوەکانی پەرستگاکە دانیشتین. من بەلامەوە سەیربوو کە چەند هەزار ساڵێک کۆن بوون. پاشان باوکم گوتی؛

«"سوکرات"ت لە یادە؟»

منیش گوتم؛

«بەتەواوەتی بیرم نیە، بەڵام وابزانم فەیلەسوفێکی یۆنانی بووە»

«ڕاستە... ئێستاکەش دەمەوێت مانای وشەی فەیلەسوفت بۆ باسبکەم...»

زانیم خەریکە یەکێک لە گوتارە بچکۆلەکانی دادەمەزرێنێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەستمدەکرد بەتەواوەتی کاتی خۆی نەبوو، چونکە خۆرەکە ڕێک لەدەموچاوی دەدام و ئارەقی پێدا دەهاتە خوارەوە.





«"فەیلەسوف" واتە کەسێک کە بەدوای حیکمەتدا دەگەڕێت. واتە مەبەست لەوە نیە کە فەیلەسوف کەسێکی پڕ حیکمەت بێت... جیاوازیەکە دەبینی؟»

سەرێکم بۆ لەقاند.

«سوکرات یەکەمین کەسبوو کە بەو شێوەیە دەژیا. بە شەقامەکانی ئەسینادا دەخولایەوە و لەگەڵ خەڵکیدا دەدوا، بەڵام نەک بەو مەبەستەی کە شتێکیان فێربکات. بەپێچەوانەوە، ئەو دەیویست لە ڕێگەی گفتوگۆکانیەوە لەگەڵ خەڵکیدا حیکمەتێکیان لێوە فێر ببێت. ئەو دەیگوت "دارەکانی وڵات هیچم فێر ناکەن". بەڵام دواتریش زۆر نائومێدبوو، چونکە دەیبینی ئەو خەڵکەی کە وایان نیشان دەدا کە زۆر دەزانن و شانازیان بەخۆیانەوە دەکرد، لە ڕاستیدا هیچی وایان نەدەزانی. بێگومان دەیانتوانی نرخی شەراب و ڕۆنی زەیتونی ئەو ڕۆژەی پێبڵێن، بەڵام هیچ شتێکی گرنگیان دەربارەی ژیان پێنەبوو کە بۆی باسبکەن. سوکراتیش خۆی زۆر جار دەیگوت "تەنها شت کە دەیزانم ئەوەیە کە هیچ نازانم"»

منیش یەکسەر گوتم؛

«کەواتە بەڕاستی زیرەک نەبووە»

باوکم لەوێدا گوتی؛

«تۆ هەروا خێرا بەپەلە شتێک مەڵێ. دوو کەس بهێنە بەرچاوت کە هیچیان هیچ شتێک نازانن، بەڵام یەکێکیان وای دەردەخات کە هەموو شتێک دەزانێت و ئەوی تریان هیچ. ئەوسا کامیانت بەلاوە زیرەکترە؟»

«بێگومان ئەو یەکەیانم بەلاوە زیرەکترە کە پێیوایە هیچ شتێک نازانێت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«کەواتە تێگەیشتیت. ئەو شتەی سوکراتی کردە فەیلەسوف کتومت ئەوە خاڵەبوو کە ئەو پێیوابوو هیچی وا دەربارەی ژیان نازانێت و ئەوەش ئازاریدەدا. ئەو هەستی دەکرد بەتەواوەتی لەدەرەوەی شتەکاندایە»
دیسانەوە سەرێکم بۆ لەقاندەوە.
«کەرەتێکیان پیاوێکی خەڵکی ئەسینا دەچێتە لای فاڵگرەوەکەی دێلفی و لە ئەپۆلۆ دەپرسێت؛ کێ زیرەکترین کەسی ئەسینایە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت "سوکرات زیرەکترین کەسە". دواتر سوکرات ئەوە دەبیستێتەوە و سەریدەسوڕمێت، چونکە بەبڕوای خۆی هیچ شتێکی تایبەتی وا نازانێت. بەڵام دواتر کە دەڕواتە دەرەوە و پرسیار لە هەموو ئەو کەسانە دەکات کە خۆیان لەو بە زیرەکتر دادەنێن و کۆمەڵێک پرسیاری زیرەکانەیان لێدەکات، ئەوجا بۆی دەردەکەوێت کە فاڵگرەوەکە ڕاستی گوتووە. جیاوازی نێوان سوکرات و هەموو ئەوانی تر لەوەدابوو کە ئەوان ڕازیبوون بەو زانیاریەی کە دەیانزانی، هەرچەندە لە سوکرات زیاتریشیان نەدەزانی. ئەو کەسانەش کە ڕازی بن بەو هێندەی کە دەیزانن، هەرگیز نابنە فەیلەسوف»
من پێم وابوو باسەکەی مەبەستێکی گرنگ دەربخات، بەڵام باوکم هەر بەوەندەوە نەوەستا. ئاماژەی بۆ هەموو گەشتیارەکانکرد، بەشەپۆل لە پاسەکاندا دەهاتنە دەرەوە و وەک مێرووڵە بە ناوچەی پەرستگاکەدا بڵاو دەبوونەوە و دەهاتن و دەچوون؛

«ئەگەر تەنها یەکێک لەوانە بەردەوام جیهان بە شێوەیەکی ئەفسوناوی و پڕنهێنی ببینێت...»
لەوێدا هەناسەیەکی هەڵکێشا و ئەوجا بەردەوامبوو؛



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«هانس تۆماس، وەک دەبینیت هەزاران خەڵک لەو خوارانەوە دێن و دەچن. دەمەوێت بڵێم... خۆزگە یەکێکیان ژیانی وەک شتێکی ئەفسوناوی و پڕنهێنی دەبینی... مەبەستم لەوەیە کە هەموو تاکە ڕۆژێک بەو شێوەیە ببینیبایە...»
دیسانەوە باوکم لەناوەڕاستی قسەکانیدا وەستایەوە، منیش گوتم؛
«ئێ... ئەوجا چی؟»
«ئەوساکە وەک جۆکەرێکی یاری کاغەز دەبوو»
«لەو بڕوایەدایت جۆکەرێکی ئاوها لەم ناوەدا هەبێت؟»
سیمایەکی پڕ لە نائومێدی کەوتە سەر دەموچاوی و گوتی؛
«بە هیچ جۆرێک لەو بڕوایەدا نیم! بێگومان لەسەدا سەد دڵنیانیم، بەڵام زۆر زۆر دەگمەنە»
«ئەی خۆت چی؟ هەموو ڕۆژێک جیهان وەک شتێکی ئەفسوناوی و پڕنهێنی دەبینیت؟»
«بەڵێ گەورەم!»
زۆر بە دڵنیاییەوە وەڵامی دامەوە، لەبەرئەوە نەموێرا هیچ شتێک بڵێم.
ئەوجا گوتی؛
«هەموو بەیانیەک بەدەم ڕاچڵەکینێکەوە خەبەرم دەبێتەوە. دەڵێیت دەرزیەکم پێدا دەکەن و هەستدەکەم کە دەژیم... هەستدەکەم کە بووکەشوشەیەکی پڕلەژیانم. تۆ وادەزانیت ئێمە کێین، هانس تۆماس؟ دەتوانی وەڵامی ئەوەم بدەیتەوە؟ ئێمە لە کۆبونەوەی کۆمەڵێک گەردی ئەستێرە پێکهاتووین. بەڵام ئەی ئەو گەردە چیە؟ ئەی ئەم گەردوونە لە چ دۆزەخێکەوە هاتووە؟»
«نازانم»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





هێندەم گوت و هەروەک سوکرات هەستم دەکرد لەدەرەوەی باسەکەدابم.

باوکیشم درێژەی بەقسەکانی دا و گوتی؛

«دەمەو ئێوارانیش دیسانەوە دەردەکەوێتەوە. منیش لەدڵی خومدا دەڵێم "من تەنها ئەم کەرەتە مرۆڤم، وە هەرگیزیش کەرەتێکی تر نایەمەوە"»

لەوێدا گوتم؛

«تۆ ژیانێکی سەخت بەسەردەبەیت»

«بەڵێ سەختە، بەڵام تا بڵێیت سەرنجراکێشەریشە. من پێویستم بەوە نیە بەدوای قەڵایەکی چۆڵ و ساردا بگەڕێم بۆ ئەوەی خێوێک ببینم... چونکە من خۆم خێوم»

«بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیگەران دەبیت گەر کورەکەت لەپەنجەرەی کابینەکەوە خێوێکی بچکۆلە ببینێت»

ڕاست و دروست نازانم بۆچی وام گوت، بەڵام هەستمدەکرد گرنگبێت قسەکانی دوێنێ شەوی ناو کابینەکەی بیربخەمەوە.

پێکەنینێک گرتی و گوتی؛

«خۆ بەرگەی ئەو شتانە دەگرێت»

دوا شتیش دەربارەی فاڵگرەوەکەی دێلفی گوتی یۆنانیەکان لەسەر پەرستگا کۆنەکەدا چەند وشەیەکیان هەڵکەندبوو و نووسیبویان "خۆت بناسە".

بەڵام دواتر هەر خۆی گوتی؛

«بەڵام بێگومان گوتنی ئاسانترە وەک لە کردنی»

دواتر هەروا بەپیاسە ڕۆیشتینەوە لای شوێنی چوونە ژورەوەکەی. باوکم دەیویست سەردانی مۆزەخانەیەکی ئەو ناوە بکات و لەنزیکەوە



لەو "ناوکی جیهان"ە وردبێتەوە، کە کاتی خۆی لە پەرستگاکەی ئەپۆلۆدا بووە. منیش زۆر لەسەرخۆ داوام لێکرد کە لەگەڵیدا نەچمە ژورەوە، پاش کەمێک ئەم سەروئەوسەر ڕێکەوتین کە لەژێر سێبەری دارێکدا چاوەڕوانی بکەم. لەدڵی خۆمدا گوتم کەواتە پێی وانیە هیچ شتێکی وا لەو مۆزەخانەکەدا بێت کە زۆر گرنگبێت بۆ پەروەردەکردنم.

دواتر باوکم گوتی؛

«لەژێر ئەو دار تووەی ئەوێدا دادەنیشیت»

بردمیە لای درەختێکەوە کە لە ژیانمدا شتێکی ئاوهام نەبینیبوو... باوەڕم بەچاوی خۆم نەدەکرد، بەڵام دارەکە تویەکی سووری یەکجار زۆری گرتبوو.

بێگومان منیش لەژێرەوە مەبەستێکم هەبوو، بۆیە نەمدەویست لەگەڵیدا بچمە مۆزەخانەکەوە؛ بەدرێژایی ئەو پێش نیوەڕۆیە کتێبە بچکۆلەکە و زەرەبینەکە هەر لە گیرفانی پانتۆڵەکەمدا بوون. ئیدی نەمهێشت هیچ شتێک ڕێگەی خوێندنەوەم لێبگرێت. حەزمدەکرد سەرم لەسەر ئەو کتێبە بچکۆلەیە هەڵنەگرم هەتا ئەو کاتەی تەواوی دەکەم. بەڵام دەبوایە کەمێک باوکیشم لەیادبوایە.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت لەوانەیە ئەو کتێبە بچکۆلەیە کتێبێکی فاڵگرتنەوە بێت و لەدواجاردا وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەم بداتەوە کە دەمکردن. بەڵام لەترساندا موچورکەیەکم پێدا هات، چونکە هێندەنەبوو باسێکی زۆرم دەربارەی جۆکەری سەر دوورگە خەیاڵیەکە خوێندبووەوە و ڕێک لەو کاتەشدا باسێکی زۆری جۆکەرمان کرد.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

جۆکەر

...ئەو وەک مارێکی ژەهراوی خۆی کرد بەلادێکەدا...

پیاوە پیرەکە هەستایە سەرپێ. ڕۆیشتە لای دەرگای بەرهەیوانەکە و کردیەوە. منیش دوایکەوتم. لەدەرەوە هەتا بڵێیت دونیا تاریکبوو. پاش نەختێک پیاوە پیرەکە لەبەرخۆیەوە گوتی؛

«هەمیشە کۆمەڵێک ئەستێرە لەسەرومەوە بووە و کۆمەڵێک ئەستێرەی تریش لەبەرپێمدابوون»

لە مەبەستی تێگەیشتم. لەسەرومانەوە ئەستێرەکانی ئاسمان دەیانجریواند. من هەرگیز لەوەوپێش نەمبینیبوو ئەستێرە بەو شێوەیە بدرەوشێتەوە. لەلایەکی تریشەوە ڕووناکیەکی کز لەلادێکەی خووارووومانەوە دەبریسکایەوە. دەتگوت هەندێک گەردی ئەستێرەکان لە ئاسمانەوە جودابوونەتەوە و لەناو لادێکەدا پەرشوبڵاوبوونەتەوە.

دواتریش پیاوە ریش سپیەکە گوتی؛

«هەردوو کۆمەڵە ئەستێرەکە وەک یەک پرلەنهێنین»

ئاماژەی بۆ لادێکەکرد و گوتی؛

«ئەوانە کێن؟ لە کوێوە هاتوون؟»

لەوەڵامدا گوتم؛

«بێگومان ئەوان خۆشیان هەمان ئەو پرسیارانە لە خۆیان دەکەن»

پیاوە پیرەکە بەپەلە ئاوڕێکی لێدامەوە و گوتی؛

«نا، نا. بۆیان نیە ئەو جۆرە پرسیارانە بکەن»

«بەڵام...»

«ناتوانن شان بەشانی ئەو کەسە بژین کە خوڵقاندوونی. لەوە تێناگەیت؟»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

دیسانەوە ڕۆیشتینەوە ناو کوخەکە، دەرگاکەمان بەدوای خۆماندا داخست و وەک پێشوو هەریەکەمان لەسەر کورسیەکانمان دانیشتینەوە.

ئەوجا پیاوە پیرەکە درێژەی بە قسەکانی دا؛

«52 کەسایەتی جیاوازبوون، هیچیان بەتەواوەتی لەوی تریان نەدەچوو. بەڵام هەموویان لە یەک خاڵدا هاوبەشبوون؛ هیچیان ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو پرسیارەی نەورووژاند و نەیگوت ئێمە کێین و لە کوێوە هاتووین. بۆ خۆیان لەو باخە بەپیتەدا دەهاتن و دەچوون. هەروەک ئاژەڵەکان بێخەم و بێباکبوون... بەڵام دواتر جۆکەر هات. ئەو وەک مارێکی ژەهراوی خۆی کرد بەلادێکەدا»

فیکەیەکی تونم لێدا.

«دەمێ ساڵ بەسەر هاتنی هەموو کاغەزەکاندا تێپەڕیبوو، ئیدی لەو بڕوایەدا نەبووم ڕۆژێک لەڕۆژان جۆکەرێک لەناو دوورگەکەدا دەرکەوێت. من وامدەزانی خۆم جۆکەرم. بەڵام ڕۆژێک لەناکاودا ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە خۆیکرد بە ناو لادێکەدا. کوڕی دینار یەکەمین کەسبوو کە بینیبووی، وە بۆ یەکەمین جاریش لەمێژووی دوورگەکەدا بەهۆی هاتنی کەسێکی نوێوە کەمێک پەشێوی و نیگەرانی کەوتە ناومانەوە. ئەو تەنها جلوبەرگەکەی سەیر نەبوو بەخۆی و کڵاو و زەنگۆڵەکانیەوە، بەڵکو لە هەمان کاتدا سەر بە هیچ یەکێک لەو چوار خێزانەش نەبوو. لەوەش زیاتر... هەندێ پرسیاری لە کورتەبنەکان دەکرد کە نەیاندەتوانی وەڵامی بدەنەوە، بەو شێوەیەش پەست و توڕەی دەکردن. ئیدی هێدی هێدی خۆی جودادەکردەوە و حەزی بەتەنهایی دەکرد، دواتریش لەقەراغ لادێکەوە خانویەکمان بۆ دروستکرد و بەتەنها تێیدا ژیا»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

«ئەو لەوانی تر زیاتر تێدەگەیشت؟»
لەوێدا پیاوە پیرەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا؛
«بەیانیەکیان لەبەر هەیوانەکەدا دانیشتبووم، لەپڕێکدا لەسوچێکی کوخەکەوە دەرکەوت. سەرمەقولاتێکی لێدا و لەبەردەممدا قوتبووەوە، سەرێکی بۆ لارکردمەوە و زەنگۆڵەی کڵاوەکەی زرنگایەوە و گوتی؛
«مێستەر! شتێک هەیە من لێیتێناگەم...»
«سەیربوو بەلامەوە کە گوتی "مێستەر"، چونکە هەموو کورتەبنەکانی تر هەر بەناوی "فرۆد"ەوە بانگیاندەکردم. لەلایەکی تریشەوە بەلامەوە ئاسایی نەبوو کە بەو شێوەیە دەست بەقسەبکەن و بڵێین "شتێک هەیە کە لێی تێناگەم". چونکە گەر ئەوەندە تێبگەین کە شتێک هەیە کە لێی تێناگەین، کەواتە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە چەند شتێک تێدەگەین»
جۆکەرە پچکۆلەکە یەک دووجار قورگی پاککردەوە و دواتر گوتی؛
«چوار پاشا لەلادێکەدان. هەروەها چوار کچ و چوار کوڕیش. چوار شازادەشمان هەیە[26]، چوار چواریش لە ژمارەی دووەوە بۆ دە لە لادێکەدان»
منیش گوتم؛
«وایە، ڕاستە»
جۆکەریش لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و گوتی؛
«کەواتە لە هەر جۆرەی چوار دانەمان هەیە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە ژمارەی هەر جۆرێک سیانزە دانەیە، مەبەستم لەوەیە بەسەر دینار و کوپ و سینەک و قەرەدا دابەشکراون»

[26] مەبەستی لە "بللی"ەکانە.و



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

سەرێکم بۆ لەقاند، ئەوە یەکەمین جاربوو کە یەکێک لە کورتەبنەکان ئاوها بەوردی وەسفی شێوازی ئەو ڕێکخستنەبکات کە هەموان بەشێکیان پێکدەهێنا. ئەوجا گوتی؛
«ئاخۆ کێ ئاوها بەو شێوە زیرەکانەیە ڕێکی خستبن؟»
درۆیەکم کرد و گوتم؛
«ئەوە هەر ڕێکەوتێکە و هیچی تر. وەک ئەوە وایە کۆمەڵێک تیر بەئاسماندا هەڵبدەیت. دواتریش کە کەوتنەوە سەر زەوی لێیان وردببیتەوە؛ بێگومان گەر بتەوێت دەتوانیت لە شێوەی کەوتنە خوارەوەکەیاندا جۆرە نەخشێک بدۆزیتەوە»
بەڵام ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە دواتر گوتی؛
«من بەو جۆرە نایبینم»
ئەوە یەکەمین جاربوو کە یەکێک لەسەر ئەم دوورگەیەدا شتێک بڵێت کە دژی بۆچوونی من بێت. من چیتر لەگەڵ کەسێکی کارتۆنیدا مامەڵەم نەدەکرد، بەڵکو لەگەڵ کەسێکی تەواودا قسەمدەکرد.
لەلایەکەوە دڵم پێی خۆشبوو، چونکە لە دڵی خۆمدا دەمگوت بەڵکو جۆکەر ببێتە هاودەمێکی ڕاستەقینەم. بەڵام لەلایەکی تریشەوە نیگەرانی کردم و خۆم بەخۆمم دەگوت ئاخۆ چی ڕوودات ئەگەر کورتەبنەکان لەپڕێکدا بزانن کێن و لە کوێوە هاتوون؟ بەهەرحاڵ دواتر پرسیارێکم لێکرد و گوتم؛
«تۆ خۆت لە چ بڕوایەکدایت؟»
بەردەوام تەماشای ناوچاوی دەکردم. لەشی وەک بتێک ڕەقکردبوو، بەڵام دەستێکی بادا و زەنگۆڵەکانی زرنگاندەوە. هەوڵیدا نیگەرانیەکەی بشارێتەوە و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

«ئەوەدەچێت هەموو شتێک بەپێی نەخشەیەک ڕوویدابێت... زۆر بەوردی و زیرەکانەش چنراوە. وابزانم پشتمان کردۆتە شتێک کە یان هەڵماندەگێڕێتەوە و دەمانخاتە سەر دیوی وێنەکەمان، یاخود وازمان لێدەهێنێت»

زۆر جار کورتەبنەکان چەند وشەیەکیان لە زمانی یاری کاغەزەوە دەهێنا و بەکاریاندەهێنا. بەو جۆرەش بەشێوەیەکی باشتر بیرکردنەوەکانیان دەردەبڕی. منیش زۆر بەئاسایی وەڵامم دەدانەوە.

لەناکاودا ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە چەند جارێک هەڵبەزیەوە و زەنگۆڵەکانی دەنگیان دایەوە و گوتی؛

«من جۆکەرم! ئەوەت لەبیر نەچێت مێستەر. من بەتەواوەتی وەک ئەوانی دیکە نیم، تێدەگەیت. من نە پاشام و نە کوڕ، نە دینار و سینەکم و نە کوپ و قەرەشم»

بەتەواوەتی نیگەران و نائارامی کردم، بەڵام دەشمزانی کە ناتوانم هەموو بیرکردنەوەکانمی بۆ ئاشکرابکەم. دواجار بڕیارمدا قومارێک بکەم و گوتم؛

«تۆ هەموو ئەو درەختانەت بینیوە کە من لەسەر ئەم دوورگەیە چاندوومن... چی دەڵێیت ئەگەر پێت بڵێم کە من تۆش و هەموو کورتەبنەکانی تری سەر ئەم دوورگەیەشم خوڵقاندووە؟»

بۆ ماوەیەک هەر وەستابوو و تەماشای نێو چاوی دەکردم. لەش و لارە باریکەکەی دەلەرزاندەوە و دەنگێکی مات لە زەنگۆڵەکانیەوە بەرزدەبووەوە.

لێوی دەلەرزی و گوتی؛



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«مێستەری ئازیز، لە هەموو بارێکدا من هەر هیچ چارەیەکم نەبوو. بەڵام دەبوایە بمکوشتیتایە، بەو شێوەیەش نرخ و بەهای خۆمم دەستدەکەوتەوە»

کەمێک پێکەنیم و گوتم؛

«بێگومان. بەڵام خۆشبەختانە بەو شێوەیە نیە»

بۆ ماوەی یەک دوو چرکەیەک بەچاوێکی پڕلەنهێنیەوە تەماشای کردم. لەپڕێکدا خۆی گەیاندە پشتی کوخەکە. پاش نەختێک لەبەردەممدا قوتبووەوە و بتڵێک ساردی ئەرخەوانی بەدەستەوە بوو. من بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەمەوبەر ئەو بتڵەم لە ناو دۆڵابێکی پشتی پشتەوەدا دانابوو. ئەوجا گوتی؛

«زۆر خۆشە... نۆش!»

پاشان بتڵەکەی نا بە دەمیەوە.

وشکبووبووم. من تەنها لە لەشی خۆم نەدەترسام، بەڵکو لەوەش دەترسام هەموو ئەو شتانە لەدەستبدەم کە لەسەر دوورگەکە خوڵقاندبوومن. مەبەستم لەوەیە هەروەک چۆن کاتی خۆی لەناکاودا هەموو شتێک سەریانهەڵدا، دەترسام بەهەمان شێوەش لەناکاودا بتوێنەوە و بفەوتێن.

«بەڵام بەو شێوە نەبوو، ها؟»

«من زانیم کە جۆکەر لەوەوپێش لە بتڵەکەی خواردبووەوە، وە هەر بەهۆی ئەو خواردنەوە سەیرەشەوە بوو کە لە پڕێکدا ئاوها مێشکی تیژ بووبوو»

«بەڵام تۆ خۆت نەتگوت ساردیە ئەرخەوانیەکە وا لە خەڵک دەکات کە مێشکیان خاوببێتەوە و ئاگایان لە خۆیان نەمێنێت؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«با، با، وامگوت... بەڵام لە سەرەتادا بەو شێوەیە نیە. خواردنەوەکە لە سەرەتادا هەتا بڵێیت زیرەکت دەکات، بەڵام ئەمەش تەنها لەبەرئەوەیە کە سەرتاپای تێگەیشتنت لەیەک کاتدا بەکاردەهێنیت. بەڵام دواتر مێشکت خاودەبێتەوە. مەبەستم لەوەیە کە دەڵێم خواردنەوەیەکی ترسناکە»

«ئەی جۆکەر چی بەسەر هات؟»

هاوارێکی کرد و گوتی؛

«لەوەندە زیاتر ناڵێین! بەڵام هەر یەکتری دەبینینەوە!»

دواتر بەپەلە خۆی کرد بەناو ئاواییەکەدا و ساردیەکەی بەناو دوایەکی کورتەبنەکاندا گێڕا. لەو کاتەشەوە هەر هەموویان لەو ساردیە ئەرخەوانیە دەخۆنەوە. سینەکەکان حەفتەی چەند جارێک دەچن ئەو ئاوە ئەرخەوانیە لەناو کونی قەدی درەختەکانەوە دەهێنن. کوپەکانیش تێکەڵی دەکەن و دینارەکانیش دەیخەنە ناو بتڵەوە.

«ئەوانی تریش وەکو جۆکەر زیرەکبوون پێی؟»

«نا، بەتەواوەتی نا. چەند ڕۆژێک هێندە مێشکیان تیژبوو کە دەترسام لێم تێبگەن. بەڵام دواتر لە جاران زیاتر دوورکەوتنەوە. ئەوانەی کە ئەمڕۆکە تۆ بینیوتن، تەنها پاشماوەی ئەوانەن کە لەوەوپێش هەبوون»

یەکسەر بیرم لەو هەموو جلوبەرگە پڕڕەنگانە دەکردەوە کە بینیمن. بۆ چرکەیەک بللی کوپم بە خۆی کراسە زەردە درێژەکەیەوە هاتە بەرچاو و گوتم؛

«بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پاشماوەیەکی جوانن»

«ڕاستە جوانن، بەڵام بێئاگان. هەموویان لەناو ئەو سروشتە بەپیتەدان، بەڵام نازانن کە لەوێدان. خۆر و مانگ دەبینن، تامی





هەموو شتەکانی ئێرە دەکەن، بەڵام هەستی پێناکەن. لەسەرەتادا کە هاتنە بوونەوە، مرۆڤی ڕاستەقینەبوون. بەڵام پاش ئەوەی کە کەوتنە خواردنەوەی ساردیە ئەرخەوانیەکە هێواش هێواش لێم تەرەبوون. وردە وردە لێم دوورکەوتنەوە و زیاتر تەنهاییان گەرەکبوو. ئێستاکەش بەشێوەیەک لە شێوەکان هەر دەتوانن قسەبکەن، بەڵام هەر پاشئەوەی لەدەمیان دێتە دەرەوە، ئیدی هێندە نابات و لەیادی دەکەن. تەنها جۆکەر تا ئێستاکەش هەندێک لە پریشکە کۆنەکەی تێداماوە. لەوانەیە بللی کوپیش بەهەمان شێوە بێت، چونکە ئەو تا ئێستاکەش هەر دەڵێت هەوڵدەدەم "خۆم بدۆزمەوە"»

ئەوجا من گوتم؛

«شتێک هەیە کە بە هیچ جۆرێک لێی تێناگەم»

«چی؟»

«تۆ گوتت هەر پاش چەند ساڵێکی کەم لەدوای ئەوەی کە خۆت گەیشتیتە سەر ئەم دوورگەیە، هەندێک لە کورتەبنەکان دەرکەوتن. بەڵام هەموویان وەک یەک گەنج دێنە بەرچاو. باوەڕ بەچاوی خۆم ناکەم کە هەندێکیان تەمەنیان نزیکەی پەنجا ساڵێک ببێت»

لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانمدا بزەیەکی پڕلەنهێنی کەوتە سەر لێوانی پیرە؛

«ئەوان پیر نابن»

«بەڵام...»

«لەو کاتەدا کە من بەتەنها لەسەر ئەم دوورگەیەدا دەژیام، وێنە خەونیەکانم بەردەوام بەهێزتر و بەهێزتردەبوون. بەڵام دواتر لەبیرکردنەوەکانمدا هاتنە دەرەوە و خۆیان فرێدایە ئەم ژیانەی ئێرەوە. بەڵام هێشتام هەر فەنتاسیان. فەنتاسیش ئەو خاسیەتە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



سەیرەی هەیە کە بۆ هەتاهەتایە هەروەک ئەو کاتەی کە خوڵقێنراون بەگەنجی و پڕ لە ژیان دەمێننەوە»
«سەختە لەوە تێبگەین...»
«تۆ ناوی "ڕاپونزڵ"ت بیستووە؟»
سەرێکم بۆ ڕاوەشاند.
«بەڵام خۆ ناوی "گەلاوێژی کلاوسوور" و "بەفرەسپی"ت بیستووە؟ یان "هانس و گرێتە"؟»
سەرێکم بۆ لەقاند.
«بەبڕوای تۆ ئێستاکە تەمەنیان چەندە؟ سەد ساڵ؟ هەزار ساڵ؟ ئەوانە بەشێوەیەکی ئاسایی گەنجن و لە هەمان کاتیشدا بەشێوەیەکی نائاساییش بەتەمەنن. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوانە لە فەنتاسیای مرۆڤەوە هاتوونەتە دەرەوە. منیش خۆم لەو بڕوایەدا نەبووم کە کورتەبنەکانی سەر ئەم دوورگەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان پیر ببن و قژیان سپی ببێت. جلوبەرگەکانیشیان هەروەک خۆی ماوەتەوە، تەنانەت کەمێکیش نەڕووشاون. بەو شێوەیەش وەک ئێمەی خەڵکانی ئاسایی نین کە شیاوی مردنین. ئێمە پیردەبین و سەرمان سپی دەبێت. ڕۆژێک لە ڕۆژان پەکماندەکەوێت و دەفەوتێین. بەڵام خەونەکانمان بەو شێوەیە نین؛ ئەوان هەر زۆر زۆر لەدوای ئەوەی کە خۆمان دەمرین، بەردەوام لەناو خەڵکانی تردا هەر دەژین»
لەوێدا دەستێکی هێنا بە قژە سپیەکەیدا. ئاماژەشی بۆ چاکەتە پەککەوتە و کۆنەکەی کرد، دواتریش گوتی؛
«واتە پرسیارە هەرە گەورەکە لەوەدا نەبوو کە کورتەبنەکان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا دەفەوتێن یان نا، بەڵکو لەوەدابوو کە بەڕاستی لە





باخچەکەدا بوون یان نا، وە خەڵکانی تریش کە دێنە سەر دوورگەکە دەتوانن بیانبینن یان نا»
منیش گوتم؛
«هەر واشبوون! لەپێشدا دووی سینەک و سێی سینەکم بینی. دواتریش لە کارگەی بەرهەمهێنانی شوشەکە دینارەکانم بینی»
«ئمممم...»
پیاوە پیرەکە بەتەواوەتی خەیاڵی ڕۆیشتبوو، هەر دەتگوت گوێی لەو وشانە نەبوو کە کەمێک لەووبەر پێم گوت. دواتریش گوتی؛
«بڵێیت لەدوای مردنی من کورتەبنەکان لێرەدا هەر بمێنن؟... ئەوەش دووهەمین پرسیاری گەورەیە کە بەمێشکمدا دێت و دەچێت»
«خۆت لە چ باوەڕێکدایت؟»
«من هیچ وەڵامێکی ئەو پرسیارەم پێ نیە. هەرگیزیش ناتوانم وەڵامێکی ئەو پرسیارەم دەستبکەوێت. چونکە ئەو کاتەی کە من دەمرم ئیدی ناتوانم بزانم کورتەبنەکانم دەژین یان نا»
دیسانەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر بەبێ دەنگی بۆی دانیشتەوە. خۆم لە خۆمم دەپرسی "بڵێیت هەمووی خەون نەبێت؟" خۆ لەوانەیە لە کوخەکەی فرۆددا نەبم، کێ دەزانێت؟ لەوەیە لە شوێنێکی تەواو جیاوازدا بم و هەموو ئەو شتانەی چواردەوریشم تەنها لەناووەوەی خۆمدا بن و هیچی تر.
«برادەر... بەیانی زیاترت بۆ باسدەکەم. دەبێت باسی ساڵنامەکە و یاریە گەورەکەی جۆکەریشت بۆ بکەم»
«یاری جۆکەر؟»
«بەیانی بۆت باسدەکەم برادەر. ئێستاکە هەردووکمان پێویستمان بەوەیە بخەوین»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



جێگایەکی خەوی تەختەی نیشاندام و بەتانی بەدەست چنراو و چەرمی لەسەردانرابوو. جلوبەرگێکی خەوی لە خوری دروستکراویشی دامێ. پێم خۆشبوو کە ئەو جلوبەرگە دەریاوانیە پیسەم بگۆڕم.

بۆ دەمەوئێوارە من و باوکم لەسەر سەربانی ئوتێلەکە دانیشتبووین و تەماشای شارەکە و کەناڵی "کۆرینت"مان دەکرد. باوکم هێندە قسەی نەدەکرد، وابزانم ئەو ڕۆژە شتی زۆر بینیبوو. پێموابێت لەدڵی خۆیدا دەیگوت بڵێت قسەکانی فاڵگرەوەکە ڕاست بێت و بەم زوانە "ئەنیتا" بدۆزینەوە.

بۆ شەوێ درەنگانێک مانگی چواردە لە ئاسۆی خۆرهەڵاتەوە بەرزبووەوە. دۆڵە تاریکەکەی ڕووناککردەوە و هاوکاتیش ڕەنگی ئەستێرەکانی ئاسمانی زەردترکرد.

هەردەتگوت لەبەردەم کوخەکەی "فرۆد"دا دانیشتووین و تەماشای لادێی کورتەبنەکان دەکەین.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**بللی دینار**

**...پیاوێکی دادپەروەربووە و دەیویست هەموو شتێک ئاشکرابکات...**

وەک هەموو ڕۆژێک من لەپێش باوکمەوە خەبەرم بووەوە. بەڵام هێندەی پێنەچوو باوکیشم کەوتە جوڵەجوڵ.

بڕیارمدا بەوردی سەیری بکەم و بزانم بەڕاستی هەر بەو شێوەیەی کە خۆی ڕۆژی پێشووتر گوتی هەموو تاکە بەیانیەک ڕادەچڵەکێت و ئەوجا خەبەری دەبێتەوە.

تاڕادەیەک پێموابوو ڕاستبکات، ڕێک لەو کاتەدا کە چاوی کردەوە تەماشای دەموچاویم کرد، بەڕاستی ساکابوو. لەو بڕوایەدابووم گەر لەشوێنێکی تری جیهانیشدا خەبەری ببوایەتەوە، بۆ نمونە لە هیندستاندا یان لەسەر ئەستێرەیەکی بچوکی ناو گەلەهەسارەیەکی تردا، هەر هێندە بساکایە.

لەوێدا گوتم؛

«تۆ مرۆڤێکی زیندوویت. ئا ئێستاکە لە "دێلفی"دایت. دێلفی شارێکی سەر زەویە، زەویش ئەستێرەیەکی زیندووە و لەکاتی ئێستادا لە خولگەیەکدا بەدەوری ئەستێرەیەکی "ڕێگای کاکێشان"دا دەخولێتەوە. بڕینی ئەو خولگەیەش نزیکەی 365 ڕۆژی پێدەچێت»

ڕێک تەماشای ناو چاوی کردم. لەوەدەچوو بیەوێت چاوی لە جیهانی خەوەوە بگەڕێنێتەوە ناو دونیای پڕ لە قاوقیژی چواردەوری. پاش کەمێک گوتی؛

«سوپاس بۆ زانیاریەکانت. ئەو شتانەی کە پێت گوتم، ئەوە دەهێنن هەموو بەیانیەک بەرلەوەی لە جێگادا بێمە دەرەوە، بە خۆمی بڵێمەوە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەجێگاکەیدا هاتە دەرەوە و گوتی؛

«هانس تۆماس، ئەگەر هەموو بەیانییەک ئەو وشانەم بە گوێدا بچرپێنیت، ئەوا بێگومان زووتر خۆم دەگەیەنمە گەرماوەکە و خۆم دەشۆم»

بەپەلە شتەکانمان کۆکردەوە و بە خێرایش نانی بەیانیمان خوارد. پاش کەمێک لەناو ماشێنەکەماندا دانیشتبووین. لەو کاتەدا کە بەلای ناوچەی پەرستگا کۆنەکەدا تێپەڕین، باوکم گوتی؛

«سەیرە بەلامەوە کە کاتی خۆی خەڵکی هێندە خۆشباوەڕبوون»

«مەبەستت لەوەیە کە باوەڕیان بە فاڵگرەوەکە کردووە؟»

یەکسەر وەڵامی نەدامەوە. لەوە ترسام گومان لە قسەکانی فاڵگرەوەکە بکات کە گوتی دایکم لە ئەسینادا دەدۆزینەوە. پاش نەختێک گوتی؛

«بەڵێ ئەوەش. بەڵام بیر لەو هەموو خودایەش بکەرەوە؛ "ئەپۆلۆ"، "ئاسکەلیپیۆس"، "ئەسینا و زیۆس"، "پۆسیادۆن و دیۆنیۆس". بۆ ماوەی چەندەها سەدە پەرستگای گرانبەهای مەرمەڕیان بۆ ئەو خوایانە دروستکردووە. زۆر جاریش ناچاربوون پارچە بەردی مەرمەڕی گەورە لە ناوچەیەکی دوورەوە بهێنن»

زۆر شارەزای ئەو بابەتە نەبووم کە باسی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوتم؛

«چۆنە وا دڵنیایت کە کاتی خۆی خواکان بوونیان نەبووە؟ لەوانەیە ئێستاکە ڕۆیشتبن -یان خەڵکێکی خۆشباوەڕی تریان دۆزیبێتەوە- بەڵام لەوانەیە لە کاتی خۆیدا لەسەر ئەم زەویە لەناو خەڵکیدا بووبن»

لە ئاوێنەکەوە سەیرێکی کردم و گوتی؛



«تۆ لەو بڕوایەدایت هانس تۆماس؟»

منیش گوتم؛

«زۆر دڵنیا نیم. بەڵام هەتا ئەو کاتەی خەڵکی باوەڕیان پێ کردوون، دەتوانین بڵێین بەشێوەیەک لە شێوەکان لە جیهاندابوون. چونکە خەڵکی ئەو شتانە دەبینن کە بڕوایان پێیانە. وە ئەو کاتەش کە خەڵکی گومانی لێکردوون، ئەوجا پیر و پەککەوتە بوون و تەواو»

هاوارێکی کرد و گوتی؛

«ئافەرم، باشت باسکرد. بەڕاستی باشی بۆ چوویت هانس تۆماس. لەوانەیە تۆش لە داهاتوودا ببیت بە فەیلەسوف»

بەلامەوە خۆشبوو کە شتێکی هێندە گرنگ و سەنگینم گوتووە کە تەنانەت باوکیشم دەبوایە بەباشی هەڵیبسەنگاندایە. بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بێدەنگ بوو.

لەڕاستیدا کەمێک هەڵمخەڵەتاند، لەبەرئەوەی ئەگەر کتێبە بچکۆلەکەم نەخوێندبایەتەوە، ئەو کاتە نەمدەتوانی ئەو قسانە بکەم. لە بنەڕەتدا من بیرم لە خوداکانی یۆنانی کۆن نەدەکردەوە، بەڵکو مەبەستم لە کاغەزەکانی "فرۆد"بوو.

بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بەبێدەنگی ماینەوە، منیش بە هێواشی هەوڵمدا زەڕەبینەکە و کتێبە بچکۆلەکە دەربهێنم. بەڵام ڕێک لەو کاتەدا کە خەریکبوو دەستبکەمەوە بە خوێندنەوە، باوکم ماشێنەکەی هێواشکردەوە و لە شوێنێکدا لایدا. بەپەلە لە فیاتەکەدا هاتە دەرەوە و جگەرەیەکی بۆ داگیرساند. نەخشەیەکی بەدەستەوە بوو و هەر تەماشای دەکرد، دواتریش گوتی؛

«ئێرەیە! دەبێت لێرەدا بێت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



من هیچم نەگوت. بەلای چەپدا دۆڵێکم دەبینی، بەڵام هیچ شتێکی وا تایبەتم بەرچاونەدەکەوت. پاش نەختێک باوکم گوتی؛

«دانیشە»

زانیم گوتارێکی بچکۆلەی پێیە، لەبەرئەوە بەلامەوە ئاسایی بوو. من دەمزانی باوکم چەندێک منی خۆشدەوێت. ئاماژەی بۆ دۆڵەکەی خوارەوە کرد و گوتی؛

«کاتی خۆی ئا لەوێدا "ئۆدیب" باوکی خۆی کوشت»

منیش گوتم؛

«بێگومان هەتا بڵێیت بێ ئەقڵ بووە. بەڵام بەڕاستی نازانم باسی چی دەکەیت»

«چارەنووس، هانس تۆماس. من باسی چارەنووس دەکەم. گەر پێشت خۆش بێت دەتوانیت ناوی بنێیت "نەفرینی نەوەکان". ئەوەش شتێکە کە بەتایبەتی من و تۆ دەگرێتەوە. ئێمە هەردووکمان بەو مەبەستە هاتووینەتە ئەم شوێنە، بۆ ئەوەی دایک و هاوسەر بدۆزینەوە»

ئینجا پرسیارێکم لێکرد و گوتم؛

«باوەڕت بە چارەنووس هەیە؟»

باوکم بەپێوە وەستابوو و قاچێکی خستبووە سەر ئەو بەردەی کە من لەسەری دانیشتبووم، جگەرەکەشی هەر بەدەستەوەبوو. سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی؛

«بەڵام یۆنانیەکان بڕوایان پێبووە. وە ئەگەر کەسێکیش دژی چارەنووسی خۆی بوەستایە، ئەوا ئەو کاتە بەپێی خۆی سزای وەردەگرت»

لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانی باوکمدا هەستمدەکرد کەمێک گوناحبارم، بەڵام ئەو تازە خەریکبوو باسەکەی دادەمەزراند؛



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«پاش ماوەیەک بەناو شارێکی کۆندا تێدەپەڕین کە پێیدەڵێن "تیبیس"، کاتی خۆی لەوێدا پاشایەکی لێبووە و ناوی "لایۆس" بووە، ژنەکەشی ناوی "ئۆکاستا" بوو. لەو کاتەدا فاڵگرەوەکەی دێلفی گوتوویەتی "لایۆس" نابێت بهێڵێت منداڵی ببێت، چونکە ئەگەر کوڕی ببێت ئەوا دواتر کە گەورەبوو باوکی خۆی دەکوژێت و دایکی خۆی دەهێنێت. بەڵام دواتر "ئۆکاستا" کوڕێکی بوو، "لایۆس"یش بڕیاریدا کوڕەکە فڕێبدەنە دەرەوە. بۆ ئەوەی یان لە برساندا بمرێت یان ئاژەڵە درەندەکان بیخۆن»

منیش گوتم؛

«بەربەر بووە»

«بێگومان، بەڵام گوێبگرە هێشتام چیرۆکەکە تەواو نەبووە. "لایۆس"ی پاشا فەرمان بە شوانێک دەدا کە کوڕەکە لەگەڵ خۆیدا بەرێت و فڕێی بدات. بەڵام بەرلەوە هەر بۆ دڵنیایی فەرماندەدات کە هەردوو ژێی پاژنەی پێی منداڵەکە کونبکرێت، بۆ ئەوەی بە هیچ جۆرێک نەتوانێت لەو شاخ و دەشت و دەرە بجوڵێتەوە و دواتر ڕێگای ماڵەوە بدۆزێتەوە. شوانەکەش فەرمانی پاشاکەی بەجێدەهێنێت، بەڵام لەو کاتەدا کە لەگەڵ مەڕوماڵەتەکەدا دەگاتە شاخەکان، چاوی بە شوانێکی شاری "کۆرینت" دەکەوێت، چونکە لەو سەردەمەدا بنەماڵەی پاشای "کۆرینت"یش لەو ناوچەیەدا لەوەڕگایان هەبووە. شوانەکەی "کۆرینت" زۆر بەزەیی بە منداڵەکەدا دێتەوە و پێیناخۆشە کە فڕێبدرێت و لە برساندا بمرێت یان بکەوێتە بەردەم ئاژەڵە درەندەکان. لەبەرئەوە داوا لە شوانەکە دەکات کە منداڵەکەی بداتێ و لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە بۆ ماڵی پاشاکەی خۆیان. ئا بەو شێوەیەش منداڵەکە ڕزگاری دەبێت و وەک کوڕی پاشا لە شاری "کۆرینت"دا پەروەردە دەکرێت،



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

چونکە پاشای ئەو شارە هیچ منداڵێکی تری نەبووە. ناویشی دەنێن "ئۆدیب"، لەڕاستیدا "ئۆدیب" واتە "قاچ ئاوساو". چونکە هەردوو قاچی ئەو منداڵە بچکۆلەیە لەپاش ئەو کردارە توندوتیژە و نارەوایەی باوکیەوە هەڵئاوسابوون. پاشان "ئۆدیب" گەورەدەبێت و پیاوێکی قۆزی لێدەردەچێت، هەموو کەسێک خۆشیدەوێت. بەڵام لە هەمان کاتدا کەس پێیناڵێت کە لە ڕاستیدا کوڕی ئەو پاشایە نیە. هەتا ڕۆژێکیان لە میواندارییەکی گەورەدا یەکێک لە میوانەکان بەڕاشکاوی پێی دەڵێت "تۆ لە ڕاستیدا کوڕی ئەم خێزانی پاشایە نیت"...»

لەوێدا گوتم؛

«ئێ خۆ لەڕاستیشدا کوڕی ئەوان نەبووە»

«تەواوە، هەرلەبەرئەوەش پرسیار لە شاژندەکات، بەڵام ئەو هیچ وەڵامێکی ڕاست و دروستی ناداتەوە. دواتر بۆ ئەوەی ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوێت بڕیاردەدات پرسیار لە فاڵگرەوەکەی "دێلفی" بکات. دەڕواتە ئەوێ و لێی دەپرسێ؛ "دەمەوێت بزانم من کوڕی ڕاستەقینەی پاشای "کۆرینت"م یان نا؟"، "پیسیا"ش لەوەڵامدا دەڵێت؛ "دوورکەوەرەوە لە باوکت، چونکە ئەگەر چاوت پێبکەوێتەوە دەیکوژیت. دواتریش دایکی خۆت دەهێنیت و پاش ماوەیەکیش منداڵت لێی دەبێت".

فیکەیەکی توندم لێدا. هەمان ئەو پێشبینیەبوو کە کاتی خۆی فاڵگرەوەکە بە پاشای "تیبیس"ی گوتبوو. باوکم لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و گوتی؛

«دوای ئەوەش "ئۆدیب" نەیوێرا بگەڕێتەوە بۆ "کۆرینت"، لەبەرئەوەی هێشتام وایدەزانی پاشا و شاژنی ئەوێ دایک و باوکی ڕاستەقینەی خۆین. بەو شێوەیەش بڕیاریدا ڕوو لە شاری "تیبیس" بکات. کاتێکیش



کە گەیشتە ئا ئەم شوێنەی کە ئێستاکە ئێمەی تێداین، ڕووبەڕوی پیاوێکی نەجیبزادە دەبێتەوە. لەناو گالیسکەیەکی قەشەنگدا دانیشتووە و چوار ئەسپ ڕایدەکێشن، چەندەها پاسەوانیشی لەگەڵدایە. یەکێکیان پاڵێک بە "ئۆدیب"ەوە دەنێ بۆ ئەوەی ڕێگای گالیسکەکە چۆڵبکات. ئۆدیبیش لەبەرئەوەی وەک کوڕە پاشا گەورەبووە، بەو کارە ڕازینابێت. بەهەرحاڵ پاش گێرمەوکێشەیەکی زۆر ئۆدیب لەو چاوپێکەوتنە چارەڕەشەدا پیاوە دەوڵەمەندەکە دەکوژێت»

«لەڕاستیشدا باوکی خۆی بوو، وا نیە؟»

«ڕاستە. هەموو پاسەوانەکانیش دەکوژێت، بەڵام لە کۆتایدا ئەسپ سوارێکیان خۆی قورتاردەکات و بۆی دەردەچێت. دەگەڕێتەوە بۆ "تیبیس" و هەواڵی کوشتنی پاشا بڵاودەکاتەوە و دەڵێت؛ چەتەیەکی سەر ڕێگا، "لۆبس"ی پاشای کوشت. شاژن و هەموو خەڵکی "تیبیس" ماتەمینی دەیانگرێت، بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی تریش بەردەوام خەڵکی ئەو شارەی نیگەراندەکرد»

«ئەویان چی بوو؟»

«گیانەوەرێکی یەکجار دڕندە و گەورە (سفینکس)، سەری وەک ئافرەت و لەشولاری وەک شێربووە، پاسەوانی سەر ڕێگای "تیبیس"ی کردووە. هەر کەسێک بەوێدا بڕۆیشتایە مەتەڵێکی پێدەگوت، وە ئەگەر وەڵامەکەی نەزانیبایە یەکسەر دەیکوشت. خەڵکەکەش بڕیاریاندا و گوتیان هەر کەسێک بتوانێت مەتەڵی دڕندەکە هەڵبهێنێت، "ئۆکاستا"ی شاژنی لێمارەدەکەین و دەبێتە پاشای "تیبیس"»

فیکەیەکی تریشم لێدا.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«ئۆدیبیش هەر زوو رووداوی کوشتارەکە لەیاد دەکات و پاش ماوەیەک دەگاتە لای ئەو چیایەی کە دڕندەکەی تێدایە. لەوێدا گیانەوەرەکە پێیدەڵێت؛ بەرلەوەی ڕێگات پێبدەم کە بڕۆیت، دەبێت ئەم مەتەڵە هەڵبهێنیت؛ «ئەو شتە چیە کە لەسەر دوو قاچ و سێ قاچ و چوار قاچیش دەڕوات؟»

لەوێدا باوکم تەماشایەکی کردم و دەیویست بزانێت منیش دەتوانم مەتەڵەکە هەڵبهێنم یان نا، بەڵام من تەنها سەرێکم بۆ ڕاوەشاند.

«ئۆدیبیش گوتی "ئەوە مرۆڤە". بەیانیان بەچوارپەل گاگۆڵکێ دەکەن، نیوەڕوانیش لەسەر دوو قاچ دەڕۆن. ئێوارانیش لەسەر سێ، چونکە دەبێت گۆچان بەکاربهێنن. ئۆدیب وەڵامێکی ڕاستی دایەوە و گیانەوەرەکەش بەرگەی نەگرت، بۆیە بەپشتا لە شاخەکەوە کەوتە خوارەوە و هەپرون بەهەپرون بوو. بەو شێوەیەش لەشاری "تیبیس"دا وەک پاڵەوانێک پێشوازیان لە ئۆدیب کرد. هەروەک بڕیاریشی لەسەردرابوو، "ئۆکاستا"ی شاژنیان دایە ـ هەڵبەتە لەڕاستیدا دایکی خۆی هێنا. پاشانیش دوو کوڕ و دوو کچیان بوو»

یەکسەر گوتم؛

«هووووها!»

تا ئەو کاتە بەردەوام هەر تەماشای باوکمم دەکرد، بەڵام لەوێدا ناچاربووم سەیرێکی ئەو شوێنە بکەم کە کاتی خۆی ئۆدیب باوکی خۆی تێدا کوشتووە.

ئەوجا دیسانەوە باوکم کەوتەوە سەر باسەکەی؛

«بەڵام لێرەدا چیرۆکەکە تەواو نابێت. پاش ماوەیەک تاعوون لە شارەکەدا بڵاودەبێتەوە. لەو سەردەمەدا یۆنانیەکان لەو بڕوایەدابوون ئەو جۆرە نەهامەتیانە بەهۆی توڕەبوونی "ئەپۆلۆ"وە بوویێت، وە





پێشیانوابووە توڕەبوونەکەی هۆکاری قوڵ و گەورەی هەبوویێت. واتە دیسانەوە ناچاربوون بچنەوە لای فاڵگرەوەکەی دێلفی، پرسیاری لێبکەن و بزانن بۆچی خودا دووچاری ئەو تاعوونە پیسەی کردوون. "پیسیا"ش لەوەڵامدا دەڵێت "بڕۆن ئەو کەسە بدۆزنەوە کە "لایۆس"ی پاشای کوشتووە. ئەگەر نا، ئەوا تەخت و تاراجی شارەکەتان تێکدەدرێت". پاشان "ئۆدیب"ی پاشا بە هەموو هێز و توانایەکیەوە دەکەوێتە گەڕان بەدوای ئەو کەسەدا کە پاشا کۆنەکەی کوشتوون. خۆی هیچ پەیوەندیەک لە نێوان کوشتنی پاشا و شەڕەکەی خۆی لەسەر ڕێگاکەدا نابینێت. واتە بەبێئەوەی ئۆدیب ئاگای لێبێت، خۆی دەبێتە ئەو پیاوکوژەی کە بەدوای دۆزینەوەی تاوانەکەی خۆیدا دەگەڕێت. یەکەم شت دەچێت پیاوێکی پەنهانبین دەدۆزێتەوە و لێیدەپرسێت؛ "پێم بڵێ بزانم کێ "لایۆس" پاشای کوشتووە؟". بەڵام پیاوەکە نایەوێت وەڵامی بداتەوە، چونکە بەبڕوای ئەو وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، هەقیقەتێکی زۆر تاڵ و ناخۆش دەردەخات. "ئۆدیب"یش بەڕاستی دەیەوێت یارمەتی خەڵکەکەی بدات، لەبەرئەوە لەدواجاردا بەزۆر ئەو هەقیقەتە تاڵە لە پیاوەکە دەردەهێنێت؛ پیاوە پەنهانبینەکەش پێی دەڵێت "تاوانەکە لە ئەستۆی ئێوەی پاشادایە". ئەوجا ئۆدیب شەڕەکەی سەر ڕێگاکەی بیردەکەوێتەوە و دان بەوەدا دەنێت کە پاشای کوشتووە، بەڵام تا ئەو کاتەش هیچ بەڵگەیەک شکنابات کە ئەو کوڕی "لایۆس"ی پاشایە. دەبێت ئەوە بڵێین کە ئۆدیب پیاوێکی دادپەروەربووە و دەیویست هەموو شتێک ئاشکرابکات، لەبەرئەوە لەدواجاردا هەردوو شوانەکەی "تیبیس" و "کۆرینت" دەدۆزێتەوە و ڕووبەڕوویان دەکاتەوە. لەوێدا ئیدی بەدڵنیاییەوە دەزانێت کە باوکی خۆی کوشتووە و دایکی خۆشی هێناوە. دەرکەوتنی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

ئەو هەقیقەتەش وای لێدەکات کە هەردوو چاوی خۆی دەربهێنێت. لەڕاستیدا بەشێوەیەک لە شێوەکانیش ئەو بەدرێژایی ژیانی هەر کوێر بووە»

ئینجا هەناسەیەکی ترم هەڵکێشا. بەبڕوای من ئەو چیرۆکە کۆنە تابڵێیت غەمگین و لەهەمان کاتیشدا تابڵێیت ناهەق بوو. پاشان گوتم؛

«ئەوەیە کە پێیدەڵێن "نەفرینی نەوەکان"»

«بەڵام ئۆدیب و "لایۆس"ی پاشا چەندین جار هەوڵیاندا لەدەست چارەنووسیان هەڵبێن. ئەوەش بەپێی یۆنانیەکان شتێکی مەحاڵبوو»

لەو کاتەدا کە بە "تیبیس"دا تێپەڕین، هەردووکمان بێدەنگ دانیشتبووین. وابزانم باوکم بیری لە "نەفرینی نەوەکانی" خۆی دەکردەوە. هەرچۆنێک بێت... تەنانەت یەک وشەشی لەدەم نەهاتە دەرەوە.

پاش ئەوەی لە هەموو لایەنێکەوە چیرۆکە غەمگینەکەی ئۆدیبم تاوتوێکرد، زەرەبین و کتێبە بچکۆلەکەم دەرهێنایەوە.



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

## دووی دینار

...مێستەرە پیرەکە چەند پەیامێکی گرنگی لە وڵاتەکەی خۆیەوە پێدەگات...

بۆ بەیانی زوو دەنگی کەڵەشێرێک خەبەریکردمەوە. بۆ چەند ساتێکی کەم وامزانی لە شاری "لیوبیک"دام و لەماڵی خۆماندام. بەڵام هەر پێش ئەوەی بەتەواوەتی خەبەرم بێتەوە، کەشتی نقوومبونەوەکەم هاتەوە یاد. ئەو کاتەم بیرکەوتەوە کە پاڵم بە بەلەمی فریاگوزاریەکەوەنا و خستمە سەر قەراغ دەریاکە، ڕێک لای دەریاچە تەنکەکەوەی کە پڕبوو لە دارخورما... دواتریش بەناو دوورگەکەدا کەوتمە ڕێ. ئەوجا لەلای دەریاچەیەکی گەورەوە خەوتم، هەر لەوێشدابووم کە مەلەمکرد و چاوم بە ڕەوە ماسیە پرتەقاڵیەکان کەوت. لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بڵێیت ئێستاکەش هەر لەوێدا نەبم و تازە خەبەرم بێتەوە؟ بڵێیت خەوم بە پیاوێکی پیرەوە نەبینیبێت کە پتر لە پەنجا ساڵ لەسەر ئەم دوورگەیەدا ژیاوە و **53** کورتەبنەی زیندووشی خولْقاندووە؟"

بەرلەوەی چاوم بکەمەوە، هەوڵمدەدا وەڵامی پرسیارەکانم بدەمەوە. نا... نابێت خەون بووبێت! بیرمدێت لەسەروی ئاواییەکەوە لە کوخەکەی "فرۆد"دا پاڵکەوتم و خەوم لێکەوت...

ئینجا چاوم کردەوە، بینیم خۆری ئەو بەیانیە ژورێکی دارینی ناو کوخێکی ڕووناکدەکردەوە. پاشان دڵنیابووم کە هەموو ئەو شتانەی بینیبووم وەک خۆر و مانگ ڕاستەقینەبوون.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

له جێگاکەمدا هاتمە دەرەوە و خۆم بە خۆمم گوت "ئەی فرۆد کوا؟" لە هەمان کاتیشدا چاوم چووە سەر قتوویەکی دارینی بچکۆلە، لەسەر ڕەفەیەکی سەر دەرگای دەرەوەدا دانرابوو.

دامگرت و تەماشایەکی ناوەکەیم کرد... بەتاڵبوو. بەمەزەندەم کاتی خۆی کاغەزە کۆنەکان بەرلەوەی گۆڕانکاریە گەورەکەیان بەسەردابێت لەو قتووەدابوون.

خستمەوە شوێنی خۆی و خۆم گەیاندە دەرەوە. لەوێدا فرۆدم بینی بە پێوە وەستابوو، هەردوو دەستی خستبووە ژێر کەلەکەی و بۆ خۆی تەماشای لادێکەی دەکرد. منیش چووم لە تەنیشتیەوە وەستام، بۆ ماوەیەک هەردووکمان بێدەنگ بووین و تەنانەت وشەیەکیشمان لەدەمەوە نەهاتە دەرەوە.

کورتەبنەکان هەر بەو بەیانیە زووە لەو پەڕی چالاکیدابوون. تیشکی خۆریش بەسەر لادێکە و بەرزاییەکانی چواردەوریدا پەخشبووبووەوە.

پاش نەختێک پیاوە پیرەکە گوتی؛

«ڕۆژی جۆکەرە...»

نیگەرانیەک کەوتە سەر سیمای و منیش بەدوایدا گوتمەوە؛

«ڕۆژی جۆکەر؟»

«نانی بەیانیمان لێرەدا دەخۆین، برادەر. تۆ لێرەدا دانیشە، منیش دەڕۆم خواردنەکەمان دێنم»

لەتەنیشت دیواری کوخەکەوە کورسیەکی نیشاندام، لەبەردەمیشیدا مێزێکی بچکۆلە دانرابوو. لەسەر کورسیەکە دانیشتم، لەوێشەوە دیمەنێکی جوانم لەبەردەمدابوو. هەندێک لە کورتەبنەکان گالیسکەیەکیان بەرەو دەرەوەی لادێکە ڕادەکێشا. لەوەدەچوو



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

سینەکەکانبن و بۆ کارکردن بەرەو کێڵگەکان بڕۆن. لەلایەکی تریشەوە گوێم لە تەپوهوڕێک بوو کە لە وەرشەکەوە بەرزدەبووەوە.

فرۆد گەڕایەوە و لەگەڵ خۆیدا نان و پەنیر و شیری "مۆلووک" و "توف"ی گەرمی پێبوو. ڕێک لە تەنیشتمەوە دانیشت. پاش نەختێک زیاترێکی دەربارەی سەرەتای هاتنی خۆی بۆ سەر دوورگەکە بۆ باسکردم و گوتی؛

«زۆر جار لەم کاتەدا ئەو سەردەمەم بیردەکەوێتەوە کە یاری کاغەم دەکرد. من ئەو کاتە لەو پەڕی تەنهایدابووم. لەبەرئەوە لەوانەیە ئاسای بووبێت کە 53 کاغەزەکە نەختە نەختە گۆڕان و بوونە 53 کەسایەتی فەنتاسی. بەڵام هەر بەوەندەشەوە نەوەستان، چونکە کاغەزەکان ڕۆڵێکی گرنگیشیان لەو ساڵنامەیەدا بینی کە ئێستاکە ئێمە لەسەر ئەم دوورگەیەدا پەیڕەوەی دەکەین»

«ساڵنامە؟»

«بەڵێ. ساڵێک بریتیە لە 52 حەفتە، بەو شێوەیەش هەر کاغەزەی حەفتەیەکی بەر دەکەوێت»

لەوێدا کەوتمە ژماردن و دواتر گوتم؛

«حەوت کەڕەت 52 دەکاتە 364»

«تەواوە. بەڵام ساڵێک 365 ڕۆژە. ئەو ڕۆژەش کە دەمێنێتەوە، ئێمە پێی دەڵێین "ڕۆژی جۆکەر". ئەو ڕۆژە سەربە هیچ مانگێک و حەفتەیەک نیە. ڕۆژێکی زیادەیە و ڕێیتێدەچێت هەموو شتێکی تێدا ڕوویدات. هەموو چوار ساڵێک دوو ڕۆژی جۆکەری ئاوهای تێدەکەوێت»

«زیرەکانە...»

«جگەلەوەش 52 حەفتەکە -یان هەروەک من پێی دەڵێم "کاغەزەکان"- بەسەر 13 مانگدا دابەشکراون و هەر مانگێکیش 28



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



رۆژی هەیە. چونکە **13** کەڕەت **28**یش دەکاتە **364**. "بللی" یەکەمین مانگە و "پاشا"ش دواهەمینە. هەموو چوار ساڵێکیش دوو رۆژی جۆکەری تێدەکەوێت. ساڵنامەکە بە ساڵی "دینار" دەستپێدەکات، ئینجا "سینەک"ی بەدوادا دێت و دواتریش "کوپ" و "قەرە". بەو شێوەیەش هەموو کاغەزەکان حەفتە و مانگی تایبەتی خۆیان بەردەکەوێت»

پیاوە پیرەکە بەپەلە تەماشایەکی کردم، لەوەدەچوو لە هەمان کاتدا شەرمیش و شانازیش بە ساڵنامە زیرەکانەکەیەوە بکات.

منیش گوتم؛

«لەسەرەتادا کەمێک ئاڵۆز هاتە بەرچاوم. بەڵام بەڕاستی دۆزینەوەیەکی جوانە»

فرۆد سەرێکی بۆ لەقاندم و گوتی؛

«بێگومان دەبوایە بیرم لە شتێک هەر بکردایەتەوە. بەدەر لەوانەش هەموو ساڵێک بەسەر چوار وەرزدا دابەشکراوە. "دینار" وەرزی بەهارە، "سینەک"یش هاوین، "کوپ" وەرزی پایزە و "قەرە"ش زستان. هاوین بە "بللی سینەک" دەست پێدەکات، پایزیش بە "بللی کوپ". زستان بە "بللی قەرە" و دواهەمین حەفتەی ساڵیش حەفتەی "پاشای قەرە"یە»

«ئێستاکە لە چ حەفتەیەکداین؟»

«وێنێ دواهەمین رۆژی حەفتەی پاشای قەرە بوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دواهەمین رۆژی مانگی پاشای قەرەشبوو»

«ئەمرۆش...»

«... ئەمرۆ رۆژی جۆکەرە. یان یەکەمین رۆژی دووڕۆژی جۆکەرە. بەو بۆنەیەشەوە ئەمرۆ ئاهەنگێکی گەورە سازدەکرێت»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«سەیرە کە...»

«ڕاستدەکەیت هەی تەنیا کەسی شارەکەم. سەیرە کە تۆ ڕێک لەو رۆژەدا دەگەیتە سەر دوورگەکە کە ئێمە جۆکەری تێدا نیشاندەدەین و پێشوازیش لە ساڵێکی نوێ و وەرزێکی نوێش دەکەین. بەڵام شتێکی تریش...»

لەوێدا دەریاوانە پیرەکە کەوتە بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە.

«چی تریش؟»

«لە رێگەی کاغەزەکانەوە مێژوو و ساڵەکانی دوورگەکەشم دەژمارد»

«بەتەواوەتی تێناگەم»

«وتمان بۆ ئەوەی رۆژەکانی ساڵ رێکبخەم، هەر کاغەزێک حەفتە و مانگی خۆیم پێبەخشی. بە هەمان شێوەش هەر ساڵەو ناوی کاغەزێکم لێنا. یەکەمین ساڵی سەر دوورگەکەم ناونا ساڵی "بللی دینار". ساڵی دواتریشی "دووی دینار" و هەتادوایی، واتە پەیڕەوی هەمان شێوەی ڕیزکردنی **52** حەفتەکەم کرد. لەوەوپێش پێم گوتتیت کە **52** ساڵە لەسەر ئەم دوورگەیە دەژیم...»

«ئممم...»

«دەریاوانەکە، وا ساڵی پاشای قەرەمان پڕکردەوە. لەوەش زیاتر بیرم نەکردۆتەوە، چونکە بەسەربردنی **52** ساڵ لەسەر ئەم دوورگەیەدا زۆرە و منیش...»

«تۆش لەو بڕوایەدا نەبووت هێندە بمێنیتەوە ها؟»

«نەخێر لەوبڕوایەدا نەبووم. بەڵام ئەمرۆکە جۆکەر ساڵی دەستپێکردنی "جۆکەر" ڕادەگەیەنێت. ئاهەنگە گەورەکە بۆ یەکەمین جار، ئەم پاش نیوەڕۆیە دەستپێدەکات. قەرەکان و کوپەکان دارتاشخانە گەورەکە ڕێکدەخەن و دەیکەنە هۆڵی ئاهەنگەکە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





سینەکەکان میوە و توو کۆدەکەنەوە و دینارەکانیش قاپی شوشە لەسەر مێزی هۆڵی ئاهەنگەکەدا دادەنێن»

«منیش... منیش بێم بۆ ئاهەنگەکە؟»

«تۆ دەبیتە میوانی شەرەفی ئاهەنگەکە. بەڵام بەرلەوەی بڕۆینە خوارەوە بۆ ناو لادێکە، شتێکی تر ماوە و دەبێت بیزانیت... هێشتام چەند کاتژمێرێکمان ماوە و با بەکاریان بهێنین...»

هەندێک لە خواردنەوە قاوەییەکەی ناو شوشەی کوخەکەی ڕۆکردە ناو پەرداخێکەوە. بەئەسپایی قومێکم لێدا و دەریاوانە پیرەکەش لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛

«واتە لە کۆتایی ساڵەکەدا ئاهەنگی جۆکەر سازدەکەین -دەشتوانین بڵێین لەسەرەتای دەستپێکردنی ساڵێکی نوێدا ئاهەنگەکە دەگێڕین. بەڵام تەنها چوار ساڵ جارێک یاری کاغەز دادەنرێت...»

«یاری کاغەز؟»

«بەڵێ، چوار ساڵ جارێک. لەوێشدا یاریە گەورەکەی جۆکەری تێدا دەکرێت»

«لێت تێناگەم، بەیارمەتیت بۆم ڕوونبکەرەوە»

دووجار قورگی بۆ پاک کردەوە و ئەوجا گوتی؛

«هەروەک چەند جارێک لەوەوپێش پێم گوتیت، ئەو کاتەی کە بەتەنها لەسەر ئەم دوورگەیەبووم، پێویستیم بە شتێکبوو کە کاتی پێ بەسەربەرم. جارجارێک بە هێواشی کاغەزەکانم هەڵدەدایەوە و لە خەیاڵی خۆمدا وامدادەنا کە هەر کاغەزەی ڕستەیەک "دەڵێت". لەیادکردنی ئەو هەموو ڕستانەشم وەک وەرزشێکی هزری دەبینی. کاتێکیش کە هەموو ڕستەکانم لەبەردەکرد، بەشی دووهەمی یاریەکەم دەستی پێدەکرد. ئەوجا هەوڵمدەدا کاغەزەکان بەشێوەیەکی تر



ڕیزبکەم و بەو شێوەیەش ڕستەکان دەبوونە یەک زنجیرەی دوورودرێژی لێکنەپچڕاو. زۆرجاریش شێوە چیرۆکێکی لێدەردەچوو -هەڵبەتە هەر لەو ڕستانە پێک هاتبوو کە کاغەزەکان بەشێوەیەکی سەربەست لەیەکتر "دایانهێنابوو"»

«ئەوەبوو یاری جۆکەر؟»

«ئمم... دەتوانین بڵێین ئەوە جۆرە یاریەکی کاغەزبوو کە من کاتم پێوە بەسەردەبرد. بەڵام هەر ئەوە بووبە سەرەتای سەرهەڵدانی یاریە گەورەکەی جۆکەر کە ئێستاکە هەر چوار ساڵ جارێک لە ڕۆژی جۆکەردا دەکرێت»

«بۆم باسبکە!»

«لەماوەی ئەو چوار ساڵەدا، کە دەکەوێتە نێوان ماوەی دوو چوار ساڵیەوە، هەریەکێک لەو **52** کورتەبنانە دەبێت ڕستەیەک بدۆزنەوە. لەوانەیە ئەمە شتێکی هێندە سەرنجڕاکێش نەبێت بەلاتەوە، بەڵام هێندەت لەیادبێت کە ئاستی بیرکردنەوەی ئەوان هەر زۆر کەمە. وە دەشبوایە ڕستەکانیان لەیادبوایە. لەیادکردنی ڕستەیەکی تەواویش لەگەڵ تێپەڕبوونی ئەو هەموو ڕۆژانەدا خۆی لە خۆیدا بەلای کورتەبنەیەکەوە کارێکی سەختە، چونکە تاڕادەیەک مێشکی هیچی تێدا نیە»

«دواتریش دەبێت هەر یەکەیان ڕستەکەی خۆی لە ئاهەنگی جۆکەردا بڵێت؟»

«تەواوە. بەڵام ئەوە تەنها بەشی یەکەمی یاریەکەیە. دواتر نۆبەی جۆکەر دێت. ئەو خۆی هیچ ڕستەیەک نالێت، بەڵام کە هەموو ڕستەکان دەگوترێت، دەچێتە شوێنێکی بەرزەوە و تێبینی خۆی دەنووسێتەوە. لەماوەی ئاهەنگەکەدا دەبێت کاغەزەکان بەشێوەیەک



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



ریزبکات کە رستەکانیان زنجیرەیەکی تەواوی یەک لەدوای یەک پێکبهێنێت. ئەو، کورتەبنەکان بەشێوەیەکی ڕاست یەک بەدوای یەکدا دادەنێت و دیسانەوە هەریەکەیان ڕستەکەی خۆی دەڵێتەوە، بەڵام ئیدی هەر ڕستەیەک بەشێکی بچکۆلەی حەکایەتێکی گەورە پێکدەهێنێت»

لەوێدا گوتم؛

«جوانە»

«ڕاست دەکەیت، لەوانەیە جوان بێت. بەڵام ڕێشی تێدەچێت بەتەواوەتی سەرت بسوڕمێنێت»

«مەبەستت لە چیە؟»

«بەسەرزارەکی لەوە دەچێت کە جۆکەر بەپێی توانای خۆی هەوڵبدات "بابەتێکی کۆ" لە شتێکی پەرشوبڵاوەوە بخوڵقێنێت. چونکە کەسایەتیەکان هەریەکەیان بەسەربەستی ڕستەکانی خۆیان دەهێننەوە و پەیوەست نین بەوانی ترەوە»

«ئەی چۆنە؟»

«بەڵام لەوانەیە "بابەتە کۆ"کە -مەبەستم لە چیرۆکەکە یان حەکایەتەکەیە- هەر لەوەوپێشەوە هەبووبێت»

«ئەوە ڕێی تێدەچێت؟»

«نازانم. بەڵام ئەگەر وابێت، کەواتە 52 کورتەبنەکە لە ڕاستیدا شتێکی تەواو جیاوازن، شتێکی زۆر قوڵترن لەوەی کە تەنها 52 کەسایەتی بن و هیچی تر. کەواتە هەندێک پەتی نەبینراو پێکەوەیان دەبەستێتەوە... بەڵام من هێشتام هەموو شتێکم نەگوتووە»

«بەردەوام بە!»





«لەسەرەتادا کە گەیشتمە ئێرە و یاریم بە کاغەزەکان دەکرد، هەوڵمدەدا لە ڕێگەی کاغەزەکانەوە پێشبینی ڕووداوەکان بکەم. بێگومان هەر بۆ یاری بوو. بەڵام لە هەمان کاتیشدا لە دڵی خۆمدا دەمگوت "لەوانەشە ڕاست بێت، کێ دەزانێت؟ من زۆر جار لەبەندەرە جیاوازەکانی دونیادا گوێم لێبووە کە دەریاوانەکان دەیانگوت ڕێیتێدەچێت کاغەزەکان پێشبینی پاشەڕۆژ بکەن. وە بەڕاستیش ڕوویدا... پێش ئەوەی کوڕی سینەک و پاشای کوپ بۆ یەکەمین جار لەسەر دوورگەکەدا دەرکەون، هەموو کەڕەتێک کە کاغەزەکانم دادەنا ڕێک ئەو دوو کاغەزە لەسەرەتادا دەردەکەوتن»

«سەرسوڕهێنەرە»

«لەسەرەتادا کە دەستمانکرد بە یاری جۆکەر و هەموو کاغەزەکان لەشوێنی تەواوی خۆیاندا دەوەستان، من هێندە زۆر بیرم لە قسەکانیان نەدەکردەوە. بەڵام ئەزانی چوار ساڵ لەمەوبەر لە ئاهەنگی جۆکەری پێشوودا دواهەمینی ڕستەکان چی بوون؟»

«نەخێر، چوزانم»

«دە کەواتە گوێ بگرە؛ "دەریاوانێکی گەنج لە دواهەمین ڕۆژی مانگی پاشای قەرەدا دێتە لادێکەوە. دەریاوانەکە مەتەڵی کوڕە شوشەچیەکە هەڵدەهێنێت. مێستەرە پیرەکە چەند پەیامێکی گرنگی لە وڵاتەکەی خۆیەوە پێدەگات»

«ئەوە... ئەوە هەر زۆر سەیرە»

«هەڵبەتە من لەم چوار ساڵەی ڕابوردوودا بەردەوام بیرم لەو قسانە نەکردۆتەوە. بەڵام کە تۆ دوێنێ ئێوارە لە لادێکەدا دەرکەوتیت -کە دواهەمین ڕۆژی حەفتە و مانگی پاشای قەرەبوو- بەڵێ... ئەوساکە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



ئەو پێشبینیە کۆنەم هاتەوە یاد. بەشێوەیەک لە شێوەکان هاتنی تۆ شتێکی چاوەڕوانکرابوو، دەریاوان...»

لەپڕێکدا شتێکم بەخەیاڵدا هات. ڕستەکەی "فرۆد"م هەروەک خۆی گوتمەوە؛

«مێستەرە پیرەکە چەند پەیامێکی گرنگی لە وڵاتەکەی خۆیەوە پێدەگات»

«ئێ؟»

پیاوە پیرەکە زۆر بەسەرنجەوە چاوی تێبڕیبووم و چاوەڕوان بوو شتێک بڵێم. پاشان گوتم؛

«تۆ نەتگوت ناوی "ستینا" بوو؟»

پیرە سەرێکی لەقاند.

«خەڵکی "لیوبیک"یش بوو؟»

دیسانەوە سەری لەقاندەوە.

«باوکم ناوی "ئۆتۆء"ە. ئەو بە هەتیوی گەورەبووە و دایکیشی ناوی "ستینا"بووە. "ستینا"ش چەند ساڵێک لەمەوبەر مرد»

«بەڵام ئەو ناوانە لە ئەڵمانیادا زۆرن»

«بێگومان... باوکم وەک دەڵێن "زۆڵ"بووە، چونکە نەنکم هەرگیز شووی نەکردووە. ئەو... ئەو دەریاوانێک نیشانەی کردبوو کەدواتر لە دەریادا ونبوو. هەتا دوا دیداریشیان هیچ یەکێکیان نەیزانیبوو کە سکی هەیە... قسەوقسەڵۆکیان لەو بارەیەوە زۆر دەکرد، دەیانگوت لەگەڵ دەریاوانێکی سەرەڕۆدا ڕێک کەوتووە و دواتریش خۆی لە بەرپرسیاری منداڵەکەی دزیوەتەوە»

«ئمم... باوکت کەی لەدایک بووە، برادەر؟»

«من...»





«پێم بڵێ! کەی باوکت لەدایک بووە؟»

«ئەو لە **8** ی مانگی **5** ی **1791**دا لە شاری "لیوبیک"دا لەدایک بووە»

«ئەو "دەریاوانەش"، کوڕی کابرایەکی شوشەچی بوو؟»

«نازانم. نەنکم زۆر باسی ئەوی نەدەکرد، هەڵبەتە لەوانەیە بە هۆی ئەو هەموو قسەوقسەڵۆکانەوە بووبێت. بەڵام بەردەوام شتێکی بۆمان دەگێڕایەوە و دەیگوت "ئەو" کەرەتێکیان بە کۆڵەکەی بەلەمەکەدا هەڵگەڕا و خواحافیزبوونی لێکردم، لەو کاتەدابوو کە لە "لیوبیک"ەوە بەبەلەم سەفری کرد. دواتریش کەوتە خوارەوە و دەستێکی برینداربوو. هەمیشەش کە ئەو باسەی دەگێڕایەوە، لەوێدا پێدەکەنی. وەک ئەوەی هەموو ڕووداوەکە تەنها بۆ ڕێزلێنانی ئەو بووبێت»

لەوێدا پیاوە پیرەکە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر دانیشتبوو و تەماشای لادێکەی دەکرد. پاشانیش گوتی؛

«ئەو دەستە... ئەو دەستە هەر زۆر نزیکە لێتەوە. لەوەش نزیکترە کە مەزەندەی دەکەیت»

ئەوجا قۆڵی چاکەتەکەی هەڵکرد و جێشوێنی چەند بریندارییەکی کۆنی سەر قۆڵی نیشاندام. منیش هاوارمکرد و گوتم؛

«باپیرە!»

دەستم کردە ملی و زۆر بەتووندی باوەشم پێداکرد. پاش نەختێک دایە پرمەی گریان و بەدەم هەنسکەوە هەر دەیگوت؛

«کوڕەکەم... کوڕەکەم... کوڕەکەم»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

سێی دینار

...دایکم وێنە ئاوێنەییەکەی خۆی ڕایکێشاوە بۆ ئێرە...

لەوێشدا لە کتێبەکەدا دیسانەوە شێوەیەکی "نەفرینی نەوەکان" دەرکەوتەوە. هەستمدەکرد بابەتەکە خەریکبوو بەتەواوەتی ناخۆشبێت.

بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لە چێشتخانەیەکی گوندێکدا لاماندا. لەوێدا لەژێر سێبەری لقوپۆپی چڕی یەک دوو درەختدا لەسەر مێزێکی درێژ دانیشتین. ڕەزێکی چڕی دار پرتەقاڵیش چواردەوری چێشتخانەکەی گرتبوو.

گۆشتی برژاو و زەلاتەی یۆنانیمان بەپەنیری چەورەوە خوارد. بۆ پاش نانخواردنیش داوای چەند میوە و شیرینیەکمان کرد. لەو کاتەدا باسی ساڵنامەکەی دوورگە خەیاڵیەکەم بۆ باوکم گێڕایەوە. بێگومان نەمدەتوانی پێی بڵێم لە کوێوە فێری بووبووم، لەبەرئەوە ناچاربووم بڵێم لەو کاتانەدا کە هەروا لە پشتی ماشێنەکەدا دانیشتبووم، خەیاڵم بۆی چووە و خۆم دامهێناوە.

باوکم بەتەواوەتی سەریسوڕمابوو و بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو. قەڵەمێکی دەرهێنا و هەر لەسەر دەسڕی سەر مێزەکە کەوتە ژماردن و گوتی؛

«52 کاغەز دەکاتە 52 حەفتە. تەواوە، 364 دەکات. سیانزە مانگی 28 ڕۆژیش هەر دەکاتە 364 ڕۆژ. لە هەردوو بارەکەدا ڕۆژێک دەمێنێتەوە...»

منیش گوتم؛

«ئەوە ڕۆژی جۆکەرە»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«وایە، بێگومان! ئای شەیتان!»

بۆ ماوەیەکی دورودرێژ هەر دانیشتبوو و تەماشای دار پرتەقاڵەکانی دەکرد. پاشان گوتی؛

«تۆ کەی لەدایکبوویت، هانس تۆماس؟»

نەمزانی مەبەستی چی بوو، بەڵام گوتم؛

«29ی 2ی 1972»

«ئەی ئەوە چ ڕۆژێکە؟»

لەناکاودا شتێکم بۆ دەرکەوت. من لە یەکێک لەو سڵانەدا لەدایکبووم کە پێی دەڵێن "ساڵی پڕ". وە بەپێی ساڵنامەکەی دوورگە خەیاڵیەکە من لە ڕۆژی جۆکەردا لەدایکبووم. لەدڵی خۆمدا گوتم "بۆ لەکاتی خوێندنەوەمدا ئەو خاڵەم نەبینی؟ ئەوجا گوتم؛

«ڕۆژی جۆکەرە»

«ڕاستە!»

لەوێدا پرسیارێکم لێکرد و گوتم؛

«بەبڕوای تۆ لەبەرئەوەیە کە من کوڕی جۆکەرم، یان پێت وایە من هەر خۆم جۆکەر بم؟»

باوکم زۆر پڕمانا تەماشای کردم و گوتی؛

«بێگومان هەردووکیان؛ کە من کوڕێکم دەبێت، ئەوا دەبێت لەڕۆژی جۆکەردا لەدایک ببێت. تۆش کە لەدایک دەبیت، ئەوا دەبێت لە ڕۆژی جۆکەردا لەدایک ببیت. مەبەستم لەو شێوەیەیە، تێدەگەیت؟»

ڕاستە من بەشێوەیەک لە شێوەکان لە ڕۆژی جۆکەردا لەدایکبووم، بەڵام زۆر دڵنیانەبووم لەوەی باوکم ئەوەی پێخۆشبێت. هەر بەشێوەی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



دەنگیدا دیاربوو، بەڕاستی لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بڵێیت لەوە بترسێت کە منیش وەک ئەو ببمە جۆکەر؟
بەلایەنی کەمەوە بەپەلە گەڕایەوە سەر ساڵنامەکە و دیسانەوە هەمان پرسیاری لێکردمەوە؛
«تۆ خۆت ئەمەت بەخەیاڵدا هات؟ ئمم... هەر حەفتەیە و کاغەزێکی هەیە، هەموو مانگێکیش لە ژمارەی یەکەوە بۆ سیانزەی بەردەکەوێت و هەر وەرزەش لەبەرامبەر ڕەنگێک لە چوار ڕەنگەکەدا دەوەستێت. هانس تۆماس، دەتوانیت ئەمە وەک داهێنانێک بەناوی خۆتەوە بینووسیتەوە و مافی داهێنانەکەشت بپارێزیت. هێندەی من ئاگاداربم هەتاوەکو ئێستاکە هیچ جۆرە ساڵنامەیەکی ڕاستەقینە لەسەر یاری کاغەز دروستنەکراوە»
هەر سەیری کوپی قاوەکەی دەکرد. پاش نەختێک گوتی؛
«لەسەرەتادا ساڵنامەی "جولیان"ی بەکاردەهێنرا، دواتریش گۆڕدرا بۆ ساڵنامەی "گریگۆری". ئێستاکەش وابزام کاتی ئەوە هاتووە کە بیگۆڕین بە ساڵنامەیەکی نوێ»
لەوەدەچوو باوکم بەتەواوەتی سەرقاڵی ساڵنامەکەبێت و منی بیرچووبێتەوە. بەردەوام هەر دانیشتبوو و لەسەر دەسڕەکەی خەریکی ژماردنبوو. پاش ماوەیەک هەروەک جۆکەرێک بەچاوێکی برسیکەدار و پرمەکرەوە تەماشایکردم و گوتی؛
«کۆی هەموو هێماکانی ڕەنگێک دەکاتە 91. بللی یەکە و پاشا سیانزە و کچ دوانزە و هتد... بەڵێ سەرجەمی هەموویان دەکاتە 91»
بەتەواوەتی لێی تێنەگەیشتم و گوتم؛
«91؟»





قەڵەمەکە و دەسڕەکەی دانا و زۆر بە قوڵی سەیرێکی ناو چاوی کردم و گوتی؛
«4 کەڕەت 91 دەکاتە چەند؟»
«4 کەڕەت 9 دەکاتە 36... هەمووی دەکاتە 364! شەیتان، بەڕاستی دەکاتە 364!»
«ڕاستە! هەموو دەستەیەک 364 نیشانەی تێدایە، هەڵبەتە جگە لە جۆکەر. بەڵام چەند ساڵێکمان هەیە کە دوو ڕۆژی جۆکەری تێدایە، لەبەرئەوە لەوانەیە هەر لەبەرئەوەشبێت کە هەموو دەستەیەکی یاری دوو کاغەزی جۆکەری تێدایە، هانس تۆماس. ڕێی تێناچێت ئەوە هەروا بەڕێکەوت بێت»
منیش گوتم؛
«لەو بڕوایەدایت مەرامێکی دیاریکراو لە داهێنانی یاری کاغەزدا هەبێت؟ بەڕاستی پێت وانیە کە بەئانقەست ژمارەی نیشانەکانی دەستەیەکیان بەقەدەر ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ دانابێت؟»
«نا، من لەو بڕوایەدا نیم. بەڵام بەبڕوای من ئەمە نمونەیەکە لەو نمونە باشانەی بەردەستمان و بەئاشکرا پێمان دەڵێت کە ئێمەی مرۆڤ ناتوانین ئەو نیشانە و هێمایانە لێکبدەینەوە کە ڕێک لەبەردەمماندایە. ڕاستە بە ملیۆن دەستەی یاری کاغەز هەیە، بەڵام هیچ کەسێک گرنگی بەوە نەداوە کە ژمارەکانی کۆبکاتەوە»
دیسانەوە هەروا دانیشتبوو و کەوتەوە بیرکردنەوە. لەپڕێکدا ڕەنگی دەموچاوی تێکچوو و گوتی؛
«بەڵام لێرەدا گرفتێکی گەورەم ڕووبەڕوودەبێتەوە... ئەگەر شوێنێک لە ساڵنامەکەدا بە جۆکەر ببەخشرێت، ئەوا ئەوکاتە بەئاسانی لە خەڵکی جودا ناکرێتەوە!»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



پاشان پێکەنی. ئیدی پێموابوو کە هێندە قورس وەرینەگرتبێت.
کەوتینەوە ڕێ و لە ماشێنەکەشدا هەر لەبەرخۆیەوە خنەی دەهات.
وابزانم تا ئەو کاتە هەر بیری لە ساڵنامەکە دەکردەوە.

نزیکبووینەوە لە ئەسینا و لەو کاتەدا لەناکاودا چاوم بە نیشانەیەکی گەورەی سەر جادەکە کەوت. بێگومان ئەو نیشانەیەم چەند جارێک لەوەوپێش بینیبوو، بەڵام لەوێدا خەریکبوو دڵم لە سنگمەوە بێتە دەرەوە. هاوارێکم کرد و گوتم؛

«بوەستە! بوەستە!»

باوکم بەتەواوەتی پەشۆکا. خێرا لایدا و ئیستۆپێکی قایمی گرت. ئاورێکی لێدامەوە و گوتی؛

«چی بووە؟»

منیش گوتم؛

«بۆ دەرەوە! بابڕۆینە دەرەوەی ماشێنەکە!»

باوکم دەرگای ماشێنەکەی کردەوە و بەپەلە خۆی گەیاندە دەرەوە و گوتی؛

«دڵت تێکەڵیەت؟»

ئاماژەم بۆ نیشانەکە کرد، تەنها چەند مەترێکمان مابوو بیگەینێ.
ئەوجا گوتم؛

«ئەو نیشانەیە نابینیت؟»

باوکم بەتەواوەتی سەری لێشێوابوو و لەوێدا دەبوایە بەزەیم پێدا بهاتایەتەوە، بەڵام من بەردەوام بیرم لە نووسراوی سەر نیشانەکە دەکردەوە.
وابزانم باوکم پێیوابوو بەیەکجاری شێتبووبم، بۆیە گوتی؛



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«چیەتی؟... ئەو نیشانەیە چیەتی؟»

منیش گوتم؛

«بیخوێنەوە»

لەو کاتەدا ئیدی باوکم خەریکبوو هێمن ببێتەوە و گوتی نووسراوە؛

«ATHINA، ئەوەش بە یۆنانی نووسراوە و واتە ئەسینا»

«لەوە زیاتر نابینینیت؟ باشە، بەیارمەتیت دەتوانیت بە پێچەوانەشەوە بیخوێنیتەوە؟»

ئەوجا گوتی؛

«ANIHTA، "ئەنیتا"»

من لەوە زیاترم نەگوت، بەڵام بەچاوێکی پرمەبەستەوە سەیرم کرد و سەرێکم بۆ لەقاند.
دواتر ناچاربوو بڵێت؛

«کەمێک سەیرە»

ئەوجا جگەرەیەکی بۆ داگیرساند.
هێمنیەکەی باوکم بەتەواوەتی پەست و بێزاری کردم و گوتم؛

«"سەیرە؟" ناتوانیت شتێک لەوە زیاتر بڵێیت؟ دایکم لێرەدایە. خۆ هەر نەبێت دەبێت ئەوەندە ببینیت. مەبەستم لەوەیە کە ڕووی لێرە کردووە. دایکم وێنە ئاوێنەییەکەی خۆی ڕایکێشاوە بۆ ئێرە. ئەوە چارەنووسی ئەو بوو. ئیدی پێم وابێت کاتی ئەوە هاتووە ئەو پەیوەندیە ببینیت»

نازانم چۆن بوو، بەڵام توانیم سوود لە تووڕەبوونەکانی جاری جارانم ببینم.

«هانس تۆماس، بەیارمەتیت هێمن ببەرەوە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

بەئاشکرا دیاربوو کە بابەتی چارەنووس و وێنەی ئاوێنەییەکەی بەدڵنەبوو.

لەو کاتەدا کە لە ماشێنەکەدا دانیشتینەوە گوتی؛

«جارجارێک زیاد لەپێویست لە سنووری "داهێنانەکانت" تێدەپەڕیت» لەوێدا تەنها بیری لە نیشانەکە نەدەکردەوە. وابزانم بیری لە کورتەبنەکە و ساڵنامە سەیرەکەش دەکردەوە. بەڵام ئەگەر وابووبێت، ئەوا بەبڕوای من شتێکی ناهەقانەی کردووە. من پێم وانەبوو ئەو مافی ئەوەی هەبێت کە لە "داهێنانەکانی" خەڵکانی تر تووڕەببێت. لەلایەکی تریشەوە بەڕاستی من نەبووم کە بۆ یەکەمین جار باسی نەفرینی نەوەکانم کرد.

لەڕێگاماندا بەرەو ئەسینا، دیسانەوە کتێبە بچکۆلەکەم دەرهێنایەوە و کەوتمەوە خوێندنەوە. دەربارەی ئەو کاتەم خوێندەوە کە خۆیان بۆ ئاهەنگی جۆکەری سەر دوورگە خەیاڵییەکە ئامادەدەکرد.







## چواری دینار

...دەستە بچکۆلەکەی هەروەک شەونمی بەیانیان ساردبوو...

ئەوە باپیرەی خۆم بوو کە لەسەر دوورگە خەیاڵییەکەدا بینیم، چونکە من کوڕی ئەو منداڵە بووم کە لە ئەڵمانیادا بەر لەدایکبوونی بەجێی هێشتبوو. لەو کاتەشدا ئیدی باپیرەم بەرەو ئۆقیانووسی ئەتلەسی کەوتبووە ڕێ و لەوێدا کەشتییەکەی تێکشابوو.

خۆم بەخۆمم دەگوت کامیانت بەلاوە سەیرترە؟ تۆوێکی بچکۆلە کە هێواش هێواش گەورەدەبێت و دواتریش دەبێتە مرۆڤێکی زیندوو و لە ژێر ئاسمانێکی شیندا دێت و دەچێت؟ یاخود مرۆڤێکی زیندوو کە فەنتاسیاکانی هێندە پڕژیانبن کە دواتر بڕژێنە ناو ژیانەوە؟ من نەمدەزانی کام یەکە لەو دوانە سەیرترە. بەڵام لەدڵی خۆمدا دەمگوت "باشە ناتوانین بڵێین مرۆڤەکانیش کۆمەڵێک فەنتاسیای پڕژیانی ئاوهان؟ کێ ئێمەی هێناوەتە ژیانەوە؟"

وا نزیکەی نیو سەدەیە "فرۆد" بەتاقی تەنها لەسەر ئەم دوورگە گەورەیەدا دەژی. خۆم بە خۆمم گوت بڵێیت ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانین پێکەوە بگەڕێینەوە بۆ ئەڵمانیا؟ بڵێیت لەپڕێکدا دیسانەوە لە "لیوبیک" خۆم بکەم بە نانەواخانەکەی باوکمدا و ئەم پیاوە پیرە بە باوکم بناسێنم و بڵێم «بابە، هاتمەوە و ئەم پیاوەشم لەگەڵ خۆمدا هێناوەتەوە؛ ئەم ناوی "فرۆد"ە و باوکی تۆیە».

چەندەها کەسوکار و هەزارەها خەیاڵ و چیرۆک بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون، هێشتام دەستیشم هەر بەملی فرۆدەوە بوو. بەڵام فریانەکەوتم لەوە زیاتر بیربکەمەوە، چونکە کۆمەڵێک کورتەبنەی جل سوور بەسەر گردەکەدا بەرەولامان سەردەکەوتن. بەهێواشی گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«سەیرکە! میوانمان هات!»
فرۆد هێشتام دڵی هەر پڕبوو، بەڵام گوتی؛
«ئەوە "کوپ"ەکانن. هەمیشە کە ئاهەنگی جۆکەرمان دەبێت، ئەوان دێن بەشوێنما و دەمبەنە خوارەوە»
منیش گوتم؛
«زۆر بەپەرۆشم»
«منیش بەپەرۆشم کوڕەکەم. گوتم جاری پێشوو لەیەکێک لە ڕستەکانیاندا گوتیان "پەیامێکی گرنگت لە وڵاتەوە پێدەگات"، بەڵام پێم گوتیت کە "کوڕی قەرە" ئەو قسەیەی کرد؟»
«نەخێر... بۆ؟»
«"قەرە" کان شوومن، هەمیشە بەختی ڕەش دەهێنن. من بەرلەوەی کەشتیەکەمان تێک بشکێت لە بارەکانی بەندەرەوە ئەو ڕاستیەم بۆدەرکەوت. بەڵام دواتریش کە گەیشتمە سەر ئەم دوورگەیە هەر هەمان شتم بینی. هەر کەڕەتێک لەلادێکەدا تووشی "قەرە"یەک ببم، دڵنیام دواتر نەگبەتیەک ڕووم تێدەکات»
فریانەکەوت لەوەندە زیاتر بڵێت، چونکە کورتەبنەکان، لە دووەوە بۆ دەی کوپ، گەیشتنە لامان و لەبەردەم کوخەکەدا دەستیانکرد بە هەڵپەڕین. هەموویان قژێکی کاڵ و درێژیان بەردابووەوە، هەمووشیان کراسی سووری درێژیان لەبەردابوو کە نیشانەی دڵی پێوەبوو. کراسە سوورەکانیان لەچاو جلوبەرگە قاوەییەکەی فرۆد و جلە دەریاوانیە کۆنەکەی مندا، زۆر دەبریسکانەوە و ناچاربووم چاوم هەڵبگلۆفم.
بەرەوروویان ڕۆیشتین و ئەوانیش بەشێوەی بازنەیەک بەچواردەورماندا وەستان. بەدەم پێکەنینەوە هاواریاندەکرد و دەیانگوت؛





«جەژنی جۆکەرتان پیرۆزبێت!»
ئەوجا کەوتنە خولانەوە بەدەورماندا و کراسەکانیان ڕادەوەشاند و گۆرانیان دەگوت. پاش نەختێک پیاوە پیرەکە گوتی؛
«باشە! هێندەمان بەسە»
هەروەک چۆن خەڵکی لەگەڵ ئاژەڵە ماڵیەکانیاندا قسە دەکەن، فرۆدیش ئاوها قسەی لەگەڵدا دەکردن.
ئیدی کچەکان هێدی هێدی بەرەو خوارووی گردەکە پاڵیانپێوەناین. پێنجی کوپ دەستی گرتم و بەدوای خۆیدا ڕایکێشام. دەستە بچکۆلەکەی هەروەک شەونمی بەیانیان ساردبوو.
کە گەیشتینە خوارەوە، گۆڕەپان و ناو کۆڵانەکانی لادێکە هێمن و ئارامبوو، بەڵام لە هەندێک خانووەوە دەنگی هەراوهوریا بەرزدەبووەوە. دواتر "کوپ"ەکانیش خۆیانکرد بە یەکێک لە خانووەکاندا.
هەرچەندە خۆر لە ئاسماندا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چرای داگیرساویان بە چواردەوری دارتاشخانە گەورەکەدا هەڵواسیبوو. فرۆد گوتی؛
«لێرەدایە»
ئیدی چووینە ناو هۆڵی ئاهەنگەکەوە.

هێشتام هیچ یەکێک لە کورتەبنەکان نەهاتبوون، بەڵام چوار مێزی گەورەیان ڕازاندبۆوە و قاپی شوشەیان لەم سەرەوە بۆ ئەوسەری مێزەکان دانابوو. چەند بەلەمێکی گەورەشیان لیپاولیپ کردبوو لە میوە. چەندین بتڵ و شوشەی پڕ لە خواردنەوە بریسکەدارەکەشیان لەسەر مێزەکە دانابوو. هەر مێزەو سیانزە کورسی بەدەوردا دانرابوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





دیوارەکان لە داری سپی دروستکرابوون، لە کۆڵەکەکانی سەقفەکەشەوە چەند چرایەکی شوشەی ڕەنگ ئاویان شۆڕکردبووەوە. یەکێک لە دیوارە درێژەکانی ژوورەکە چوار پەنجەرەی تێدابوو، لەسەر هەر چوار مێزەکە و قەراغی پەنجەرەکانیش شوشەی ماسیان دانابوو، ماسی سوور و زەرد و شینیان تێدابوو. لەپەنجەرەکانەوە شەپۆلی تیشکی خۆر دەیدا لە شوشەی ماسیەکان و بتڵەکان، لەویشەوە چەندەها ڕەنگ هەروەک پەلکەزێڕینە بەسەر زەویەکە و دیوارەکاندا پەرشوبڵاو دەبوونەوە. دیوارە درێژەکەی تر پەنجەرەی تێدانەبوو، بەڵام سێ کورسی درێژیان لەناوەڕاستی دیوارەکەدا دانابوو. هەر لەو کورسیانە دەچوو کە لە دادگاکاندا هەیە و دادوەرەکانی لەسەر دادەنیشن.

هێشتام پڕبەدڵی خۆم تەماشای هەموو لایەکم نەکردبوو کە دەرگاکە کرایەوە، جۆکەر بوو... لەدەرەوەوە بەبازێک خۆی هەڵدایە ناو هۆڵی ئاهەنگەکەوە. زەردەخەنەیەکی گەورە لەسەر لێوەکانی بوو و گوتی؛

«ئەم کاتەتان باش!»

جلێکی وەنەوشەیی پۆشیبوو و زەنگۆڵەکانی سەر جلەکەی لەگەڵ بچوکترین جوڵەدا دەزرنگانەوە. تەنانەت لەگەڵ هێواشترین سەر جوڵانەوەشیدا، زرنگەیەک لە کڵاوە ڕەنگ سوور و سەوزەکەی سەریەوە بەرزدەبووەوە.

لەپڕێکدا بەرەوڕووی من خۆی هەڵدا، هەڵبەزیەوە و نووقورچێکی لە گوێچکەم گرت. زەنگۆڵەکانی بەچەشنی زەنگۆڵەی گالیسکەیەک دەزرنگانەوە کە ئەسپێکی بەهێز ڕایبکێشێت. ئەوجا گوتی؛

«ئێ... پێت خۆشە کە بۆ ئەم ئاهەنگە گەورەیە بانگکراویت؟»

من تاڕادەیەک لەو کوڕە بچکۆلەیە دەترسام، بەڵام لە وەڵامدا گوتم؛



«بەڵێ، سوپاستان دەکەم»

هەر پاش قسەکانی من جۆکەر گوتی؛

«بەڕاست؟ فێری ئەو هونەرەش بویت کە بڵێیت سوپاس؟ باشە، باشە... خراپ نیە»

پاشان فرۆد بە زمانێکی توندوتیژەوە گوتی؛

«بەیارمەتی خۆت ئەتوانیت کەمێک هێمن ببیتەوە هەی زۆرزان؟»

جۆکەر بەچاوێکی پڕگومانەوە تەماشایەکی دەریاوانە پیرەکەی کرد و گوتی؛

«چیتە... دەڵێیت ئاهەنگە گەورەکە نیگەرانی کردویت، ها؟ بەڵام جۆکەر دەڵێت ئێستاکە کاتی پەشیمانبوونەوە نەماوە، چونکە ئەمڕۆکە دەبێت هەموو کاغەزەکان هەڵبگێڕدرێنەوە و بەدیوی وێنەکەیاندا دەربخرێن. هەقیقەتیش لە کاغەزەکاندایە. ئێستاکە ئیتر لەوەندە زیاتر نالێین! تەواو!»

ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە دیسانەوە ڕۆیشتە دەرەوە و فرۆدیش بەپێوە وەستابوو و سەری ڕادەوەشاند. پاش نەختێک گوتم؛

«دەمەوێت بزانم گەورەترین دەسەڵات لەسەر ئەم دوورگەیەدا بەدەست کێوەیە؟ گەورەترین کەس تۆیت یان ئەو زۆرزانە بچکۆلەیەیە؟»

سەرلێشێواو و سەرسوڕماو دەهاتە بەرچاوم و گوتی؛

«تا ئێستاکە من بووم!»

هێندەی نەبرد و دیسانەوە دەرگاکە کرایەوە. لەپێشدا جۆکەر هاتە ژورەوە. زۆر بە وریاییەوە لەسەر کورسیەک لە کورسیە بەرزەکانی لای دیوارە درێژەکەوە دانیشت و ئاماژەی بۆ من و فرۆد کرد کە لە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





تەنیشتیەوە دانیشین. بەو شێوەیەش جۆکەر دەکەوتە لای ڕاستی فرۆدەوە و منیش دەکەوتمە لای چەپیەوە. ئێمەش دانیشتین، هەرچەندە هیچمان قسەمان نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆکەر گوتی؛

«بێدەنگ بن!»

پاش نەختێک لەدوورەوە دەنگی فلووت لێدانێک دەهات، هێواش هێواش دەنگەکە نزیکدەبووەوە. لەدەرگاکەوە هەموو "دینار"ەکان هێدی هێدی هاتنە ژورەوە. لەپێشدا پاشا بچکۆلەکەیان خۆی پێداکرد و دواتریش کچی دینار و ئەوجا کوڕی دینار، دواتریش "دینار"ەکانی تر یەک بەدوای یەکدا هاتنە ژورەوە. بللی دینار دواهەمین کەسیان بوو کە هاتە ژورەوە. جگە لە پاشاکەیان هەر هەموویان یەکی فلووتێکی شوشەییان بەدەمەوەبوو و لێیاندەدا. ئاوازێکی هێواش و نەرمیان دەژەند، هەرلە ئاوازی نەرمی ئۆرگە باریکەکانی کڵێسە دەچوو. هەر هەموویان جلوبەرگێکی سووری کاڵیان لەبەردابوو، قژێکی خاو و بریقەداریان بەردابووەوە. هەمووشیان چاویان شینبوو. جگە لە پاشا و کوڕەکەیان، هەر هەموویان کچ بوون.

لەپڕێکدا جۆکەر گوتی؛

«ئافەرم!»

چەپڵەیەکی لێدا و فرۆدیش هەروەها. منیش بەدوایاندا کەوتمە چەپڵەلێدان.

دینارەکان لە سوچێکی ژورەکەدا لەتەنیشتی یەکەوە وەستان، بەو جۆرەش شێوەی چارەکە بازنەیەکیان پێک هێنا. ئینجا سینەکەکان بە خۆیان و کراسە شینە تۆخەکانیانەوە هاتنە ژورەوە. کراسە درێژەکەی بەری کچی سینەک و بللی سینەک هەمان ڕەنگ بوو.



ڕەنگی پێستی هەموویان تۆخبوو و قژێکی لولی قاوەیی باویان بەردابووەوە، هەمووشیان چاویان قاوەیی بوو. لەشولاری ئەمان لەچاو دینارەکاندا قەڵەوتربوو. تەنها کچی سینەک و بللی سینەک پیاونەبوون، دەنا ئەوانی تر هەموویان پیاوبوون.

سینەکەکان لەتەنیشت دینارەکانەوە ڕاوەستان و بەو شێوەیەش هەموویان نیوەی بازنەیەکیان پێکهێنا. پاشان لەکۆڵانەکەی دەرەوەوە "کوپە"ەکان هاتنە ژورەوە، ئەوان کراسی سووری تۆخیان لەبەردابوو. تەنها پاشا و کوڕەکەیان پیاوبوون، هەردووکیان دوو جلوبەرگی سووری تۆخی وەک یەکیان لەبەردابوو. "کوپ"ەکان چاویان سەوز و قژێکی کاڵیان هەبوو، ڕەنگی پێستیشیان زۆر جوانبوو و دەچوونە دڵەوە. لەنێو هەموویاندا بللی کوپ دیاربوو. ئەو کراسێکی زەردی درێژی لەبەردابوو، کاتی خۆشی کە لە دارستانەکەدا بینیم هەمان ئەو کراسەی لەبەردابوو. پاش نەختێک چووە لای پاشای سینەکەوە وەستا. دواتر کوپەکانیش لەتەنیشت ئەوانی ترەوە وەستان و بەو جۆرەش هەموو کورتەبنەکان سێ بەشی بازنەیەکیان پێک هێنا.

دواجار "قەرە"کان هاتنە ژورەوە. چاوی ئەوان ڕەشبوو و هەمووشیان قژێکی ڕەش و بژیان بەسەرەوەبوو. هەروەها جلوبەرگی ڕەشیشیان لەبەردابوو. ناوشانی ئەوان لەچاو کورتەبنەکانی تردا کەمێک پانتربوو. هەر هەمووشیان پەست و تورە و مرومۆچ بوون. لەناو ئەماندا تەنها کچی قەرە و بللی قەرە کچبوون، هەریەکەو کراسێکی مۆریان لەبەردابوو.

بللی قەرە لە تەنیشت پاشای "کوپ"ەوە وەستا و دواتریش هەموو **52** کورتەبنەکە بازنەیەکی خڕیان پێک هێنا.

لەوێدا بەهێواشی چرپاندم بەگوێی فرۆدادا و گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

«بەلامەوە زۆر سەیرە»
فرۆدیش بەچرپەچرپ گوتی؛
«هەموو ساڵێک ئاهەنگی جۆکەر بەم جۆرە دەستپێدەکات. بەو شێوەیە 52 حەفتەی ساڵەکە نیشان دەدەن»
«بەڵام ئەی بۆچی بللی کوپ کراسێکی زەردی لەبەردایە؟»
«ئەو وەک خۆری هاوین وایە و لە ئاسماندا دەدرەوشێتەوە»
بۆشاییەکی بچکۆلە لەنێوان پاشای قەرە و بللی دیناردا هەبوو. جۆکەر لەسەر کورسیەکەی دابەزی و خۆی خنیە نێوانیانەوە. بەو شێوەیەش بازنەیەکی پراوپریان پێک هێنا. لەوێدا بللی کوپ ڕێک بەرامبەر جۆکەر وەستابوو.
کورتەبنەکان تەوقەیان لەگەڵ یەکدا دەکرد و بەیەکتریان دەگوت؛
«جەژنی جۆکرەت پیرۆزبێت! ساڵێکی خۆشت بۆ دەخوازم!»
جۆکەر دەستێکی ڕاوەشاند، زەنگۆڵەکانی زرنگانەوە و بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی؛
«تەنها ئەوەندە نیە کە ساڵێک بەڕێدەکەین! بەڵکو لە هەمان کاتیشدا یاریەکی کاغەز تەواودەکەین کە 52 ساڵی پێچووە. ئێستاکە هەموو پاشەڕۆژ لەبەردەستی جۆکەردایە. هاوڕێیانی جۆکەر، من ئەم ڕۆژەتان پیرۆزدەکەم! ئیدی لەوەندە زیاتر ناڵێین! تەواو!»
پاشان هەردوو دەستی خۆی بەیەکەوە نووساند، دەتگوت پیرۆزبایی لەخۆی دەکات. هەموو کورتەبنەکان چەپڵەیان بۆ لێدا، هەرچەندە لەوەنەدەچوو کە هیچیان لە قسەکانی تێگەیشتبن. دواتریش کۆمەڵ کۆمەڵ لەسەر چوار مێزەکە دانیشتن.
فرۆد دەستێکی خستە سەرشانم و بەهێواشی گوتی؛





«لەڕاستیدا ئەوان نازانن چی دەکەن. هەروەک چۆن من کاتی خۆی کاغەزەکانم بە شێوەی بازنە دادەنا، ئەوانیش هەموو ساڵێک بەهەمان شێوەی بازنە دەوەستنەوە»
«بەڵام...»
«برادەر، قەت لەوەوپێش سەگ و ئەسپت نەبینیوە کە لە سێرکدا دەخولێنەوە؟ ئەم کورتەبنانەش بە هەمان شێوەن. وەک ئەو ئاژەڵانەن کە لەوەوپێش مەشقیان پێکرابێت. تەنها جۆکەر نەبێت کە...»
«کە چی؟»
«هەرگیز لەوەوپێش نەمبینیوە کە هێندە لەخۆی ڕاببینێت و هێندە دڵنیابێت لە خۆی»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



## پێنجی دینار

**...خواردنەوەکەم لەڕاستیدا تامێکی شیرین و خۆشی هەبوو...**

لەپڕێکدا باوکم گوتی؛

«وا خەریکە لە ئەسینا نزیکدەبینەوە. شارێکی هێندە خۆشە و تایبەتیە کە دڵت بەرایی نایەت بەجێیبهێڵێت»

"بەڕێوەبەر" هەر بەهۆی نەفەسدرێژی خۆی و بەکارهێنانی نەخشەی شارەکەوە، توانی نووسینگەیەکی گەشتیاری بدۆزێتەوە. من بۆ خۆم لەناو ماشێنەکەدا مامەوە و سەیری یۆنانیە کورتەباڵاکانم دەکرد، باوکیشم خویکرد بە نووسینگەکەدا و دەیویست ئوتێلێکی گونجاو بدۆزێتەوە.

کاتێکیش گەڕایەوە لام، یەک پێکەنینی گەورە دەموچاوی داپۆشیبوو. لەشوێنی خۆیدا دانیشت و گوتی؛

«دەچینە ئوتێلی "تیتانیا". گەراجی ماشێن و ژوری چۆڵیشیان هەیە، بێگومان ئەوە خۆی لە خۆیدا بەسە، بەڵام من لەوەپێش گوتم گەر لە ئەسینادا چەند ڕۆژێک بمێنینەوە، ئەوا دەمەوێت "ئەکرۆپۆلیس" ببینم. ئێستاکەش ئەو ئوتێلەمان دۆزیەوە و لەسەربانە گەورەکەیەوە دیمەنی هەموو ئەسینا دەبینیت»

باوکم ڕاستیکرد. ژورەکەمان کەوتبووە قاتی دوانزەوە و هەر لەوێوە دیمەنێکی قەشەنگی ئەسینامان لەبەرچاودابوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر زوو خۆمان گەیاندە سەربانی سەرەوە. لەوێوە ئەکرۆپۆلیس ڕێک بەرامبەرمان بوو.

باوکم بەتەواوەتی بێدەنگبوو و هەر بەپێوە تەماشای پەرستگا کۆنەکانی دەکرد. بەڵام پاش ماوەیەک گوتی؛



تایبەته بە پێگەی پەڕتووک

«زۆر جوانە هانس تۆماس. زۆر قەشەنگە»

ئۆقرەی لێبڕابوو و لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر دەهات و دەچوو. دواتر هێمن بووەوە داوای بیرەیەکی کرد. لە شوێنێکدا دانیشتین کە ڕێک بەسەر "ئەکرۆپۆلیس"دا دەیڕوانی. پاش نەختێک پرۆجکتۆرە گەورەکانیان داگیرساند و هەموو ناوچەی پەرستگا کۆنەکە ڕووناکبووەوە. لەوێدا باوکم خەریکبوو ببوورێتەوە.

پاش ئەوەی تێر بەدڵی خۆی تەماشای ئەو ناوەی کرد گوتی؛

«هانس تۆماس، بەیانی من و تۆ دەچین سەردانێکی ئەو شوێنە دەکەین. بەناو گۆڕەپانە دێرینەکەی ئەسیناشدا دەڕۆین. لەوێدا ئەو شوێنەت نیشاندەدەم کە کاتی خۆی فەیلەسوفە گەورەکان پێکەوە پرسیارە گرنگەکانیان تێدا تاوتوێکردووە. جێگەی داخە کە ئەو پرسیارانە لە ئەمڕۆکەی ئەوروپادا لەیادکراوون»

ئەوە سەرەتای وتەیەکی دوورودرێژبوو دەربارەی فەیلەسوفەکانی ئەسینا. پاش ماوەیەک ناچاربووم قسەکانی بپڕم و گوتم؛

«وابزانم بۆ ئەوە هاتووینەتە ئەسینا کە دایکم بدۆزینەوە... خۆ ئەوەت لەیادنەکردووە؟»

تا ئەو کاتە دوو سێ بیرەی داواکردبوو. ئەوجا گوتی؛

«نا، نا. بەڵام ئەگەر ئەکرۆپۆلیس نەبینین، ئەوا دواتر باسی چی لەگەڵ دایکتا بکەین، ها؟ من پێم وایە دوای ئەو هەموو ساڵە ناخۆشە شتێک نەبێت باسی لەسەربکەین، تۆش لەو بڕوایەدانیت هانس تۆماس؟»

لەوێدا کە خەریک بوو لە دایکم نزیک دەبووینەوە، بۆ یەکەمین جار هەستمکرد کە باوکم لەوە دەترسێت کە دایکم ببینێت. ئازاری ئەو ڕاستیەش لەناوەوەمدا هێندە زۆربوو تاڕادەیەک گەورەی کردم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

من تا ئەو کاتەش هەروا وەک شتێکی ئاسایی لەدڵی خۆمدا لێکمدەدایەوە و دەمگوت ئەگەر تەنها بگەینە ئەسینا، ئەوا دایکم دەدۆزینەوە. وە ئەگەر دایکیشم بدۆزینەوە، ئەوا هەموو گرفتەکانمان چارەسەردەبێت. بەڵام تەنها لەوێدا بۆمدەرکەوت کە بەهەڵەدا چووبووم.

هەڵبەتە خەتای باوکم نەبوو کە من هێندە درەنگ لەوە گەیشتم. ئەو چەند جارێک لەووبەر ئاماژەی بۆ ئەوە کرد و گوتی مەرج نیە لەگەڵماندا بگەڕێتەوە ماڵەوە. بەڵام هەموو قسەکانی بەلای منەوە لەو بارەیەوە بێسوودبوو و وەک ئەوە وابوو ئاو بکەیت بە مراویەکدا و بتەوێت تەڕی بکەیت. من لەوە تێنەدەگەیشتم، بەتایبەتیش کە بەوپەڕی توانامانەوە هەوڵماندەدا بیدۆزینەوە.

ئەوجا تێگەیشتم کەکاتی خۆی چەندە منداڵ بووم و لە پڕێکدا بەزەییم بە باوکمدا دەهاتەوە. بێگومان بەزەیشم بە خۆمدا دەهاتەوە.

وابزانم هەروا بەرێکەوت ئەو باسە لەوێدا نەهاتەپێشەوە.

پاش ئەوەی چەند شتێکی سەرزارەکی تری دەربارەی دایکم و یۆنانیە کۆنەکان باسکرد، گوتی؛

«حەز ناکەیت پەرداخێک شەراب بخۆیتەوە هانس تۆماس؟ من خۆم پێمخۆشە گەر بتەوێت بخۆیتەوە، چونکە خواردنەوەی شەراب بە تەنها زۆر ناخۆشە»

منیش گوتم؛

«بەر لە هەموو شتێک حەزم لە شەراب نیە، جگەلەوەش هێشتام هێندە گەورەنەبووم کە بخۆمەوە»

ئینجا بەدەنگێکی پڕلەدڵنیاییەوە گوتی؛



«شتێکت بۆ داوادەکەم کە حەزت لێبێت، بەڕاستیش هێندەت نەماوە کە گەورە ببیت»

دەستێکی بەرزکردەوە و بۆیەکەی بانگکرد، پەرداخێک "مارتینی" سووری بۆ من و پەرداخێک "مەتاکسا"ی بۆ خۆی داواکرد.

بۆیەکە زۆر بەسەرسامیەوە تەماشایەکی منی کرد و دواتریش بەهەمان شێوە سەیرێکی باوکمی کرد و بە ئینگلیزی گوتی؛

«بەڕاست؟»

باوکم سەرێکی بۆ لەقاند و ئەویش داواکەی بەجێهێنا.

قسەکەی باوکم دەرچوو، چونکە خواردنەوەکەم لەڕاستیدا تامێکی شیرین و خۆشی هەبوو، جگەلەوەش چەند پارچە سەهۆڵێکی تێدابوو.

هەر لەبەرئەوەش دوو سێ پەرداخم لێ خواردەوە و دواتریش قەوما.

دەموچاوم سپی هەڵگەڕا و خەریکبوو لەسەر سەربانەکەدا بکەوم.

باوکیشم وەک ئەوەی داوای لێبووردن بکات گوتی؛

«ئای، کوڕە شیرینەکەم»

هەتاوەکو ژوری ئوتێلەکە لەگەڵمدا هات و لەوەندە زیاتر هیچم بیر نایەتەوە. تەنها ئەو کاتەم بیردێتەوە کە بۆ بەیانیەکەی خەبەرم بووەوە، بەڵام دەشزانم لەو کاتەدا کە خەوتم، تێکچووبووم. وابزانم شەرابەکە باوکیشمی تێکدابوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

شەشی دینار

**...جارجارێک هاتوونەتە خوارەوە و لەنێو مرۆڤدا ژیاون...**

بۆ بەیانی خەبەرمبووەوە و یەکەمین شت کە بەخەیاڵمدا هات خواردنەوە بێتامەکەی باوکم بوو. بەتەواوەتی بێزاربووم لەوەی هەموو ڕۆژێک دەیخواردەوە.
لەدڵی خۆمدە دەمگوت لەوانەیە باوکم زیرەکترین کەسی ناوچەی سەروی "ئەلپ"ەکان بێت، کەچی ڕێک مێشکی ئەو کەسە زیرەکە بەرەبەرە بەهۆی دڵۆپە خواردنەوەی ناو بتڵەکانەوە سست و لاوازدەبێ! من لای خۆمەوە بڕیارمدا بەرلەوەی دایکم ببینین، بەیەکجاری ئەو بابەتەی لەگەڵدا یەکلابکەمەوە.
باوکم لەخەو هەستا و یەکسەر کەوتە باسکردنی ئەکرۆپۆلیس، لەبەرئەوە وام بەباشزانی کەمێک دان بەخۆمدا بگرم و هەتا کاتی نانخواردنی بەیانی هیچ شتێک لەو بارەیەوە باسنەکەم.
هەتا لەنانخواردنیش بووینەوە هەر چاوەڕوانبووم. باوکم هەندێک قاوەی تریشی داواکرد و جگەرەیەکی بۆ داگیرساند، لەو کاتەدا نەخشەیەکی گەورەی ئەسینای لەبەردەمیدا کردبووەوە و تەماشای دەکرد.
لەوێدا گوتم؛
«تۆش وەک من هەست ناکەیت خەریکە لەتام دەردەچێت؟»
سەیرێکی کرم و منیش لەسەر قسەکانم بەردەوامبووم؛
«خۆت باش دەزانیت مەبەستم چیە. لەووەپێش چەندین جار باسی ئەو هەموو خواردنەوە بێتامەی تۆمان کردووە، بەڵام گەر بتەوێت کوڕەکەشت تێوەبگلێنیت، ئەوا بەبڕوای من لەسنووری خۆت لادەدەیت»







یەکسەر دانی پێدانا و گوتی؛
«داوای لێبووردن دەکەم هانس تۆماس. وابزانم بەرگەی ئەو دوو سێ پەرداخەت نەگرت»
«ئەوە زۆر گرنگ نیە... مەبەستم لەوەیە خۆزگە تۆش دەتتوانی کەمێک خواردنەوە کەمبکەیتەوە. من پێم حەیفە گەر تاکە جۆکەری شاری "ئارەندالْ" وەک کەسێکی دورەپەرێز و نەویستە کۆتایی پێبێت»
بەئاشکرا دیاربوو ویژدانی ئازاریدەدا و منیش یەکسەر بەزەییم پێدا هاتەوە، بەڵام خۆ نەشمدەتوانی هەمیشە هەر ئافەرینی بکەم و دڵی ڕابگرم. پاش نەختێک گوتی؛
«بیرێکی لێدەکەمەوە»
«بەبڕوای من تا زوو بیری لێبکەیتەوە درەنگە، چونکە پێم وانیە دایکم فەیلەسوفێکی لاوازی بەدڵبێت، بەتایبەتیش کە هەمیشە بیەوێت بەهۆی خواردنەووە خۆی بگونجێنێت»
لەسەر کورسیەکە دانیشتبوو و هەر پیشیدەخواردەوە. وابزانم زۆر ناخۆشە گەر بەو شێوەیە بەرامبەر کوڕەکەت بوەستیت و ئاوها پەستت بکات، لەبەرئەوە بەلامەوە ئاسایی بوو کە گوتی؛
«لەڕاستیدا هانس تۆماس منیش بیرم لە هەمان شت کردۆتەوە»
هێندە بەدڵنیاییەوە وەڵامی دامەوە، هەستمکرد چیتر پێویست نەکات لەسەر ئەو باسە بڕۆین. بەڵام لە هەمان کاتدا دڵم خورپەیەکی سەیری کرد، نازانم بۆ... لەپڕێکدا هەستمکرد بەتەواوەتی هۆی کۆچکردنی دایکمم بۆ باسنەکراوە.
دواتر تەماشایەکی نەخشەکەی بەردەستیم کرد و گوتم؛
«لە کوێوە بڕۆین بۆ ئەکرۆپۆلیس؟»
پاش نەختێک کەوتینە ڕێ.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





بۆ ئەوەی کات بەفیڕۆنەدەین، تەکسیەکمان گرت و تا شوێنی بەر چوونە ژوورەوەکەی بردین. لەوێشەوە بەرلەوەی بگەینە ناوچەی پەرستگاکە، بەپێ بەدرێژایی بەرزاییەکەیدا سەرکەوتین.

پاش ماوەیەک گەیشتینە بەردەمی گەورەترین پەرستگا، ناوی "پارسینۆن" بوو، لەوێدا باوکم بەردەوام لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر دەڕۆیشت و دەیگوت؛

«بێ وێنەیە... بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە»

پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی باش بەو ناوەدا خولاینەوە، لەشوێنێکدا وەستاین و تەماشای دوو شانۆ دێرینەکەمان کرد، هەردووکیان ڕێک کەوتبوونە خوارووی بەرزاییەکەوە. کاتی خۆی لەسەر شانۆ هەرە کۆنەکەیاندا چەندەها شانۆگەریان نمایشکردووە، شانۆی "ئۆدیب"ی پاشاش هەر لەوێدا پێشکەشکراوە.

دواجار باوکم ئاماژەی بۆ تاشەبەردێک کرد و گوتی؛

«لێرەدا دانیشە»

ئینجا وتەیەکی دوورودرێژی دەربارەی ئەسینایییەکان بۆ هەڵڕشتم.

پاش ئەوەی قسەکانی کۆتایی پێهات، خۆر گەیشتبووە ناوەڕاستی ئاسمان و لەو کاتەدا سێبەرێکی کەمی شتەکان دەبینرا. دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ، لەپەرستگایەکەوە بۆ پەرستگایەکی تر دەڕۆیشتین و بەوردی تەماشامان دەکردن. باوکم بەهەرچوارلادا دەستی ڕادەکێشا و باسی جیاوازی نێوان پایەکانی ناو پەرستگاکانی بۆ دەکردم. دواتریش پەرستگای "پارسینۆن"ی نیشاندام و گوتی ئەو پەرستگایە لەهیچ لایەکەوە قەراغی ڕێکی نیە، وە تەنها شت کە کاتی خۆی لەوێدا



دانراوە پەیکەرێکی دوانزە مەتری "ئەسینا"ی خواژن بووە، ئەویش خواژنی پارێزەری ئەسینابووە.

هێندەش فێربووم کە خودا یۆنانیەکان لە شوێنێکدا ژیاون کە ناوی "ئۆلۆمپی" بووە، "ئۆلۆمپی"ش ناوی شاخێکی مەزنی باکوری یۆنانە.

بەڵام خوداکان جارجارێک هاتوونەتە خوارەوە و لەنێو مرۆڤدا ژیاون.

باوکم دەیگوت ئەوساکە ئەوان لەناو "دەستەیەکی یاری کاغەزی مرۆییدا"، هەروەک جۆکەری گەورە وابوون.

لەوناوەدا مۆزەخانەیەکی بچکۆلەشی لێبوو، دیسانەوە لەوێشدا داوام لە باوکم کرد کە لەگەڵیدا نەچمە ژوورەوە. یەکسەر ڕازیبوو و لەسەر شوێنێک ڕێککەوتین کە دابنیشم و چاوەڕوانییکەم.

هەڵبەتە من پێم خۆشبوو لەگەڵ کەسێکی هێندە شارەزادا بڕۆمە ناو مۆزەخانەکەوە، بەڵام خەیاڵێکیشم هەر لەلای کتێبەکەی گیرفانم بوو، من لە بەیانیەوە لەگەڵ خۆمدا دەمگێڕا.

ڕاستە من گوێم بۆ باوکم شلدەکرد کە باسی پەرستگا کۆنەکانی بۆ دەکردم، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەر بیرم لە ئاهەنگە گەورەکەی جۆکەر دەکردەوە. لەوێدا هەر 52 کورتەبنەکەی سەر دوورگە خەیاڵیەکە لە هۆڵی ئاهەنگەکەدا بەشێوەی بازنەیەک وەستابوون و چاوەڕوانی ئەوەدەکرا کە هەریەکەو ڕستەکەی خۆی بڵێت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

حەوتی دینار

...هەروەک کەرنەفاڵێکی گەورە دەهاتە بەرچاوم کە بەمیوانەکانیان گوتبێت "وەرن و هەریەکەتان جۆرە جلوبەرگێک بپۆشن کە وێنەی کاغەزێکی یاری بنوێنێت"...

کورتەبنەکان دانیشتبوون و لەگەڵ یەکتردا کەوتبوونە ورتەورت، بەڵام هێندەی نەبرد جۆکەر چەپڵەیەکی لێدا و گوتی؛

«ئێ... بابزانین هەریەکەو ڕستەی خۆی ئامادەکردووە؟»

هەموو کورتەبنەکان بەیەکەوە گوتیان؛

«بەڵێێێ»

«کەواتە جۆکەر دەڵێت فەرموو با ئێستاکە هەموو ڕستەکان بگوترێن!»

پاشان هەموو کورتەبنەکان لەیەک کاتدا ڕستەکانیان گوت. **52** دەنگ بەیەکەوە بۆ ماوەی چەند چرکەیەک غەڵبەغەڵبێکی دروستکرد و دواتریش بەتەواوەتی بێدەنگبوون؛ هەردەتگوت کۆبوونەوەکەیان تەواوبووە.

لەوێدا فرۆد بەچرپەچرپ پێیگوتم؛

«هەموو جارێک هەمان شت ڕوودەدات. بێگومان بەو شێوەیەش هیچ یەکێکیان جگە لەدەنگی خۆی گوێی لە هیچی ترنیە»

ئینجا جۆکەر گوتی؛

«سوپاستان دەکەم... دەبا ئێستاکەش یەکە یەکە گوێ بۆ ڕستەکانتان شلبکەین. فەرموو با لە بللی دینارەوە دەستپێبکەین»

بللی دینار وەک شازادەیەک هەستایە سەرپێ. قژە زیوینیەکەی لەسەر ناوچەوانی لادا و گوتی؛





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«چارەنووس وەک گوڵەکەلەرم وایە، لە هەموو لایەکەوە وەک یەک گەشەدەکات»

ئەوجا دانیشتەوە، کوڵمە کاڵەکانی سوور سوور بووبوونەوە.

جۆکەر سەرێکی بۆ خوراند و گوتی؛

«ئمم... گوڵەکەلەرم. وشەکانت... وشەکانت زیرەکانە هەڵبژاردووە. ئیدی نۆبەی دووی دینارە»

دووی دینار یەکسەر لەشوێنی خۆی هەستایە سەرپێ و گوتی؛

«زەڕەبینەکە ڕێک بە ئەندازەی پارچە شکاوەکەی شوشەی ماسیەکەیە»

جۆکەر بەدوایدا گوتی؛

«بەڕاست؟ بێگومان قسەکانت زۆر بەسوودتر دەبوو ئەگەر پێت بگوتینایە کە مەبەستت لە چ زەڕەبینێکە و هەروەها بۆ کام شوشەی ماسییش دەبێت. بەڵام دواتر ڕووندەبێتەوە، دواتر ئەوەش دێت! ئێ خۆ سەرتاپای هەقیقەتەکە نەخنراوەتە ناو دوو کاغەزی دینارەوە... دوای ئەو!»

سێی دینار هەستایە سەرپێ و گوتی؛

«باوک و کوڕ بەدوای ئەو ژنە جوانەدا دەگەڕێن کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە»

ڕێک بەدوای قسەکانیدا کەوتە مشەمشکردن و دواتریش دایە پڕمەی گریان. من لەوەوپێش بینیبووم کە کەڕەتێکی تریش گریا. پاشای دینار ژیری دەکردەوە و لەو کاتەدا جۆکەر گوتی؛

«ئەی بۆ ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە؟ بزانن... هەتاوەکو یاری کاغەزەکە تەواو نەبێت و هەموو کاغەزەکان بەدیوی وێنەکانیاندا دانەنرێن، کەس نیە کە پەی بەوە بەرێت. دوای ئەو!»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





دوابەدوای ئەوەش هەموو "دینار"ەکان یەک بەدوای یەکدا ڕستەکانیان گوت.

سەرەکە گەیشتە حەوتی دینار و گوتی؛

«لە ڕاستیدا کوڕی شوشەچیەکە فێڵی لە فەنتاسیەکانی خۆی کردووە» یەکسەر شتێکم بیرکەوتەوە، لەوەپێش حەوتی دینار لە کارگەی شوشەکەدا کتومت هەمان شتی گوت.

پاشانیش نۆی دینار گوتی؛

«کەسایەتیەکان لەقۆڵی چاکەتی جادووبازەکەوە دێنە دەرەوە و لەپڕێکدا بەئاسمانەوە هەست بەوە دەکەن کە پرلەژیانن»

هەر ئەویش بوو کە کاتی خۆی گوتی "حەزدەکەم بیر لەشتێک بکەمەوە کە هێندە سەخت بێت کە نەتوانم بیری لێبکەمەوە". من پێموابوو بەپێی بۆچوونەکەی خۆی قسەیەکی نایابی هەڵبژاردبێت.

دواجار نۆبەی پاشای دینار هات؛

«یاری کاغەزەکە نەفرینی نەوەکانە»

یەکسەر جۆکەر بەدوایدا هاواریکرد و گوتی؛

«جێگەی سەرنجە. هێشتام تەنها یەک بەشمان تەواوکردووە، بەڵام زۆر بەشی وێنە گەورەکەمان بۆ دەرکەوتووە. بڵێیت بتوانین لەمەبەستە قوڵەکەی تێبگەین؟»

بە هێواشی و بە چرپەچرپ کەوتنە قسەکردن لەگەڵ یەکتریدا، بەڵام جۆکەر بەردەوامی بە قسەکانی دا؛

«هێشتام سێ بەشی بازنەی چارەنووسەکەمان ماوە. ئینجا سەرەی "سینەک"ەکانە»

بللی سینەک گوتی؛



«چارەنووس وەکو مارێکی برسی وایە و لەبرسێتیدا خۆی خۆی دەخوات»

دووی سینەکیش بەدوایدا گوتی؛

«ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات»

لەڕاستیدا ماوەیەکی زۆربوو لەبەرخۆیەوە بەردەوام ئەو قسەیەی دەگوتەوە. ئەو کاتی خۆشی لەوە دەترسا کە بیری بچێتەوە، هەربۆیە بەرلەوەی لە کێڵگەکەدا خەوی لێبکەوێت هەمان ئەو قسەیەی کردەوە.

دواتریش هەموو کورتەبنەکان یەک بەدوای یەکدا هەستانە سەرپێ. لەپێشدا ئەو سینەکانەی کە مابوونەوە قسەکانیانکرد و ئینجا هەموو "کوپ"ەکان و دواجاریش قەرەکان ڕستەکانیان پێشکەشکرد.

بللی کوپ ڕێک هەروەک ئەو کاتەی کە لە دارستانەکەدا بینیم گوتی؛

«قتووەکەی ناوەوە قتووەکەی دەرەوە دەکاتەوە، وە لە هەمان کاتیشدا قتووەکەی دەرەوە قتووەکەی ناوەوە دەکاتەوە»

گوێم لێبوو کورتەبنەیەکی تر گوتی؛

«لەبەیانیەکی خۆشدا، پاشا و کوڕ لە زیندانی ئاگایدا دێنە دەرەوە»

یەکێکی تریش گوتی؛

«لە گیرفانی کراسەکەیدا دەستەیەک کاغەزی تێدایە و دواتر بۆ ئەوەی وشک ببنەوە لەبەر خۆردا دایاندەنێت»

بەو شێوەیەش پاشماوەی هەر هەموو پەنجاودوو کورتەبنەکە یەکە یەکە هەستانە سەرپێی، هەریەکەو بەخێرایی و بەسەرزارەکی ڕستەکەی خۆی گوت. یەک بەدوای یەکدا ڕستەی شێتانەتریان هەڵدەڕشت. هەندێکیان بەچرپەچرپ ڕستەکانیان دەگوت، هەندێکی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تریان بە پێکەنینەوە، بەشێکیان بەشێوەیەکی هونەری و شاعیرانە قسەکانیاندەکرد و یەک دوو دانەیەکیشیان بەدەم هەنسک و گریانەوە ڕستەکانیان گوت. مەبەستی گشتی قسەکانیان (نازانم گەر لێرەدا بتوانین دوو وشەی "مەبەستی گشتی" بەکاربهێنین، چونکە لەڕاستیدا قسەکانیان زۆر چەواشەبوون و زۆر جیاوازیشبوون لەیەکەوە) هیچ مانایەکی نەبوو، هیچ پەیوەندیەکی بەیەکەوە نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆکەر بەو پەڕی تواناوە دەیویست هەموو ڕستەکان بەڕیز لەبەربکات.

دواهەمین کەس پاشای قەرە هەستا و زۆر بە سەرنج و دڵنیاییەوە تەماشای جۆکەری کرد و گوتی؛

«ئەو کەسەی کە بەباشی لە چارەنووس تێدەگات، دەمێنێتەوە»

ئەو دواهەمین کەس بوو. بیرمە لەو کاتەدا بەلامەوە ئەو ڕستەیە زیرەکانەترین ڕستەبوو کە لەوێدا گوترا. وابزانم جۆکەریش هەمان بڕوای هەبوو، چونکە لەدوای قسەکەی پاشای قەرە زۆر بەپەرۆشەوە چەپڵەی لێدا و زەنگۆڵەکانی هەروەک ئامێرێکی تایبەتی ئۆرکێسترا زرنگەیان لێوەدەهات. بەڵام فرۆد لە ناچاریدا سەری ڕادەوەشاند.

لەسەر کورسیەکان هاتینە خوارەوە و بەهێواشی چووینە لای مێزەکانەوە، ڕێک لەو شوێنەدا وەستاین کە لەوەوپێش کورتەبنەکان تێیدا دەخولانەوە.

بۆ ساتێک دیسانەوە وام هەستکرد کە دوورگەکە پەناگای مرۆڤی نەخۆشی دەروونیە و لەدڵی خۆمدا دەمگوت لەوانەیە "فرۆد" خۆی پەرستار بووبێت و لەناکاودا شێت بووبێت. هەر بۆیە ناتوانێت یارمەتی کورتەبنەکان بدات.



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

خۆم بە خۆمم دەگوت لەوانەشە هەموو باسەکانی قسەیەکی چەواشەی کەسێکی شێت بێت، هەر لەباسی کەشتی تێکشکانەکەیەوە هەتا چیرۆکی دەستەی یاری کاغەزەکەی کە خۆی دەیگوت لەپڕێکدا بوونەتە بوونەوەری پڕلەژیان... بەهەرحاڵ من لە خاڵێک دڵنیابووم؛ نەنکم ناوی "ستینا"بووە، دایک و باوکیشم باسی "باپیرە"میان بۆ دەکردم و دەیانگوت لەسەر چارۆکەی کەشتیەکەوە کەوتۆتە خوارەوە و دەستی خۆی بریندارکردووە.

پێدەچێت فرۆد بەڕاستی لەماوەی پەنجا ساڵی ڕابووردودا لەسەر دوورگەکە ژیابێت... کێ دەزانێت؟ من لەوەوبەر چیرۆکی ئەو کەسانەم بیستبوو کە کەشتیەکەیان تێکشاوە و بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێکدا ماونەتەوە. لەوانەشە دەستەیەک یاری کاغەزی پێبووبێت، بەڵام بە هیچ جۆرێک پێموانەبوو کە کورتەبنەکان بەرهەمی فەنتاسی "فرۆد" بن.

بێگومان بیرم لە بوارێکی تریش دەکردەوە و لەدڵی خۆمدا دەمگوت؛ لەوانەیە ئەو هەموو شتە سەیروسەمەرانە لە ئاگایی خۆمدا ڕوویدەن. پێدەچێت من لەناکاودا شێتبووبم. بەڕاست... یەکەمجار گەیشتمە قەراغ ئاوێک کە پڕبوو لەماسی پرتەقاڵی، لەوێدا توویەکی سەیرم خوارد... خوا دەزانێت ئەو تووە چی تێدا بووە؟ ئممم... خۆم بەخۆمم گوت تازە درەنگە بیر لەوە بکەیتەوە...

لەناکاودا دەنگێک لەئەندێشە و خەیاڵی خۆمی دەرهێنام، هەرلە دەنگی زەنگی پاپۆڕدەچوو. ئەوجا هەستمکرد یەکێک جلوبەرگە دەریاوانیەکەم ڕادەتەکێنێت. جۆکەربوو، دەنگەکەش لە زەنگۆڵەکانی جلوبەرگی ئەو زۆرزانەوە دەهات.

پرسیارێکی لێکردم و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«ڕیزکردنی کاغەزەکان چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟»
هەروا وەستابوو و تەماشای دەکردم، شێوەی دەموچاوی بەڕوونی نیشاندەدا کە ئەو لە من زیاتر دەزانێت. من وەڵامم نەدایەوە.
دواتریش گوتی؛
«باشە... بەلاتەوە شتێکی ناهەق و سەیر نیە ئەگەر کەسێک بیر لەشتێک بکاتەوە و دواتر ئەو شتە لەپڕێکدا لە سەری ئەو کەسەوە بێتەدەرەوە و لەبۆشاییدا بجوڵێتەوە؟»
ئینجا وەڵامم دایەوە و گوتم؛
«بێگومان... ئەوە... بێگومان ئەوە ڕێیتێناچێت»
ئەویش لەگەڵ قسەکەمدا تەبابوو و گوتی؛
«بەڵێ ڕێیتێناچێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوەدەچێت ئەوە هەقیقەت بێت»
«مەبەستت چیە؟»
«هەروەک ئەوەی لەوەپێش گوتم... هەقیقەتە، لەبەرئەوەی ئێمە لێرەداین و تەماشای یەکتری دەکەین. لەڕاستیدا لەژێر ئاسمانێکیشداین و ... پڕ لە ژیانیشین. چۆن ڕێیتێدەچێت "لە زیندانی ئاگایی بێینە دەرەوە"؟ چ جۆرە پەیژەیەکمان بۆ ئەو مەبەستە پێویست دەبێت؟»
ویستم خۆم لەدەستی ڕزگاربکەم و گوتم؛
«لەوانەیە هەمیشە هەر لێرەدا بووبین»
«بێگومان. بەڵام هێشتام پرسیارەکە بەبێ وەڵام دەمێنێتەوە. دەریاوان... ئێمە کێین؟ ئێمە لە کوێوە هاتووین؟»





زۆرم پێخۆشنەبوو کە منی ڕادەکێشایە ناو ئەندێشە فەلسەفیەکانیەوە. بەڵام خۆم بۆ خۆم دانم بەو ڕاستیەدانا کە هیچ وەڵامێکی پرسیارەکانیم پێنەبوو.
دواتریش گوتی؛
«جادووگەرەکە قۆڵی چاکەتەکەی ڕاتەکاند و ئێمەش لە ئاسماندا خۆمان بەزیندوویی بینیەوە. جۆکەر دەڵێت ئەوە شتێکی سەیرە! ئەی تۆی دەریاوان دەڵێیت چی؟»
لەوێدا زانیم کە "فرۆد" لەوێدا نەمابوو، لەبەرئەوە لێمپرسی؛
«"فرۆد" بۆ کوێ چووە؟»
جۆکەریش لە وەڵامدا گوتی؛
«بەشێوە ئاساییەکەی خەڵکی بەرلەوەی پرسیارێک بکەن، وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەنەوە کە لێیانکراوە»
دەستیکرد بە پێکەنین و منیش دیسان هەمان پرسیارم کردەوە؛
«"فرۆد" چی لێهات؟»
«لەوانەیە چووبێتە دەرەوە و کەمێک هەوای پاک هەڵبمژێت. ئەوە ئیشی یەکەم جاری نیە... ئەو هەموو جارێک کە دەگەینە ئەم کاتەی یاری جۆکەرەکەمان، هەمان شت دەکات. لەترسی ئەو وشانەی کە لێرەدا دەگوترێن، خەریکە میز بەخۆیدا بکات. لەبەرئەوە بەبڕوای جۆکەر بڕواتە دەرەوە باشترە»
لەو کاتەدا زۆر هەستم بەتەنهایی دەکرد. لەپڕێکدا بەتەنها لەو ئاهەنگە گەورەیەدا لەگەڵ ئەو هەموو کورتەبنانەدا خۆمم بینیەوە. زۆربەیان مێزەکانیان بەجێهێشتبوو. هەموویان بە جلوبەرگە پڕڕەنگەکانیانەوە بەو ناوەدا دەخولانەوە و جمەیاندەهات، هەر



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





دەتگوت ئاهەنگێکی گەورەی لەدایکبوونی منداڵانە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت "جا چ پێویستیدەکرد هەموو ئاواییەکە بانگبکەن؟"

بەڵام بەووردی تەماشایەکم کردن و بۆم دەرکەوت کە کۆبوونەوەکەیان لە ئاهەنگێکی ڕۆژی لەدایکبوونی ئاسایی ناچێت. زیاتر هەروەک کەرنەفاڵێکی گەورە دەهاتە بەرچاوم کە بەمیوانەکانیان گوتبێت "وەرن و هەریەکەتان جۆرە جلوبەرگێک بپۆشن کە وێنەی کاغەزێکی یاری بنوێنێت". زیاتریش وادەهاتە بەرچاوم کە بەرلەوەی ئەو هەموو میوانە بێنە ژورەوە، خواردنەوەیەکیان پێشکەشکرابێت، تەنها بۆ ئەوەی لە هۆڵەکەدا جێگای ئەو هەمووە ببێتەوە. هەستم دەکرد خۆشم کەمێک درەنگ هاتبێتمە ئەو ئاهەنگە و فریای ئەو خواردنەوە ئەفسوناویە نەکەوتبم.

لەوێدا جۆکەر خەندەیەکی مەکراوی و پڕفیتنەی کەوتە سەرلێوانی و گوتی؛

«تامێکی خواردنەوە پرشنگدارەکە ناکەیت؟»

بتڵێکی بچکۆلەی لەبەر لوتمدا ڕاگرت و منیش لەبەر سەرلێشێواوی خۆم، نام بەدەممەوە و قومێکی چکۆلەم لێدا. من پێموانەبوو قومێکی هێندە کەم زیانی هەبێت.

ڕاستە قومێکی پچکۆلەم لێدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوەتی کاری تێکردم. هەموو ئەو تامانەی لە ژیانمدا کردبوومن، بگرە تامی زیاتریش، بەناو لەشمدا دەهاتن و دەچوون. هەروەک شەپۆلێکی پڕ لە خۆشی و لەزەت بەسەرتاپای لەشمدا ڕۆیشت. لەپەنجەیەکی قاچمەوە زۆر بە ڕوونی تامی شلیکم دەکرد وە لە لایەکی قژمەوە تامی قۆخ و مۆزم دەکرد. لە ئانیشکی چەپیشمەوە تامی ئاوی هەرمێم دەکرد. لەبەر لوتیشمدا بۆنی تێکەڵەیەکی  خۆشی عەتر دەهات.



هەستێکی زۆر خۆشم هەبوو، هەربۆیە بۆ ماوەی چەند خولەکێک لە شوێنی خۆمدا وشکبووبووم. لەو کاتەدا کە تەماشای کورتەبنە پڕڕەنگەکانم دەکرد، هەردەتگوت لە فەنتاسیای خۆمەوە هاتوونەتە دەرەوە. بۆ ساتێک هەستمدەکرد لە ئەندێشەی خۆمدا ونبووم. کەمێک دواتر وامدەزانی کەسایەتیە فەنتاسیەکان بۆیە لە مێشکمەوە هاتوونەتە دەرەوە، چونکە دژی ئەوە بوون کە بیرکردنەوەکانی خۆم سنووربەندیان بکەن.

چەندەها و چەندەها بیرۆکەی سەیروسەمەرە بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون. هەردەتگوت شتێک لەناوەوە ختوکەی مێشکم دەدات. یەکسەر بڕیارمدا کە هەرگیز واز لەو بتڵە نەهێنم، خۆم بەخۆم دەگوت هەرکاتێکیش کە هیچی تیا نەما، خێرا پڕیدەکەمەوە. چونکە هیچ شتێک لە دونیادا بەلامەوە هێندەی هەبوونی ئەو خواردنەوە پرشنگدارە گرنگتر نەبوو.

لەو کاتەدا جۆکەر دانیشتبوو و بزەیەکی گەورەی لەسەر لێوانبوو، ئینجا گوتی؛

«تامەکەی... خۆشبوو یان ناخۆشبوو؟»

لەوێدا یەکەمین جاربوو کە دانەکانی ببینم. تەنانەت لەو کاتانەشدا کە زەردەخەنەیەک دەیگرت، زەنگۆڵەکانی سەر جلەکەی دەزرنگانەوە. لەوەدەچوو هەریەکێک لەو دانە وردانەی بەشێوەیەک لە شێوەکان بە زەنگۆڵەیەکەوە بەسترابنەوە. پاشان گوتم؛

«قومێکی تریش دەخۆمەوە»

ڕێک لەو کاتەدا "فرۆد" بەڕاکردن لەدەرەوەوە هاتە ژورەوە. بەرلەوەی بگاتە لامان و بتڵەکە لە جۆکەر بسەنێت، خۆی بە دەی قەرە و پاشای قەرەدا کێشا. دواتریش هاوارێکی بەسەر جۆکەردا کرد و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«خوێڕی!»

**هەموو کورتەبنەکانی هۆڵەکە بۆ ماوەیەکی کەم ئاوڕێکیان دایەوە، بەڵام هەر خێرا ڕووی خۆیان بەرەو کۆبوونەوە خۆشەکەیان وەرگێڕایەوە.**

لەپڕێکدا بینیم دوکەڵ لە کتێبە بچکۆلەکەوە هەڵدەستێت. پەنجەیەکیشم ئارەقی کردبووەوە. کتێب و زەڕەبینەکەم بەیەکەوە فڕێدایە سەر زەویەکە. خەڵکی بەشێوەیەک تەماشایان دەکردم هەروەک ئەوەی مارێکی ژەهراوی پێوەی دابم. منیش کتێب و زەڕەبینەکەم هەڵگرتەوە و بەئینگلیزی گوتم؛

«هیچ نیە!»

بەهۆی تیشکی خۆرەوە زەڕەبینەکە لە پڕێکدا دوکەڵی لە کتێبە بچکۆلەکە هەڵساندبوو. تەماشایەکی کتێبە بچکۆلەکەم کردەوە و لەسەر ئەو دوا لاپەڕەیەی کە خوێندبوومەوە پەڵەیەکی ڕەشی سوتاوم بەدیکرد.

لەڕاستیدا شتێکی تریش هەروەک فتیلەیەک هێدی هێدی دەسوتا؛ من چیتر نەمدەتوانی خۆم بەهەڵەدا بەرم، چونکە زۆربەی ئەو شتانەی لە کتێبەکەدابوون وەک ڕەنگدانەوەی ئەو شتانەبوون کە من پێیدا دەڕۆیشتم.

هەروا هەندێک لەو ڕستانەم دەهێنایەوە خەیاڵم کە کورتەبنەکانی سەر دوورگەکە گوتیان؛

باوک و کوڕ بەدوای ئەو ژنە جوانەدا دەگەڕێن کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە... زەڕەبینەکە ڕێک بە ئەندازەی پارچە شکاوەکەی شوشەی ماسیەکەیە... ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات... یاری کاغەزەکە نەفرینی نەوەکانە...

چیتر بواری هیچ جۆرە گومانێک نەمایەوە؛ پەیوەندیەکی سەیر و نهێنی لەنێوان کتێبەکە و ژیانی مندا هەبوو. بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەمدەزانی شتێکی ئاوها چۆن ڕێیتێدەچێت. من تەنها دوورگەکەی "فرۆد"م بەلاوە خەیاڵی نەبوو، بەڵکو بەلامەوە کتێبە بچکۆلەکەش خۆی بۆ خۆی نووسراوێکی خەیاڵی بوو.

بۆ ساتێکی کەم وام بەخەیاڵدا هات کە کتێبەکە لەگەڵ گەڕانی مندا بە جیهاندا، خۆی خۆی بنووسێتەوە. بەڵام لاپەڕەکانم هەڵدایەوە و بینیم تا دوا لاپەڕەی نووسرابووەوە.

هەرچەندە دونیا زۆر گەرمیش بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موچوڕکەیەکی سارد بە پشتمدا هاتە خوارەوە.

ئەو کاتەی کە باوکم هاتەوە بۆ لام، لەسەر بەردەکە خۆم هەڵدایە خوارەوە و هەر بۆئەوەی بیر لە شتێکی تر بکەمەوە، خێرا سێ چوار پرسیارم دەربارەی ئەکرۆپۆلیس و یۆنانیەکان لێکرد.





PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

**هەشتی دینار**

**...بەجادوویەک دێینە دەرەوە و دواتر دیارنامێنین...**

دیسانەوە بەلای شوێنی چوونە ژورەوەی ئەکرۆپۆلیسدا تێپەڕینەوە. باوکم بۆ ماوەیەکی دورودرێژ هەر وەستابوو و تەماشای شارەکەی دەکرد.
ئاماژەی بۆ سەر تەپۆڵکەیەک کرد و گوتی ئەوە ناوی "ئاریۆپاگۆس"ە. هەروەها گوتی کاتی خۆی لەو شوێنەوە "پاولۆس"ی پەیامبەر وتەیەکی دورودرێژی بۆ ئەسینایەکان خوێندۆتەوە و تێیدا باسی خودا نەناسراوەکەی بۆ کردون و گوتوویەتی "ئەو خودایە لەو پەرستگایانەدا ناژی کە بەدەستی مرۆڤ دروستکراوە".
گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینا لە خواروی "ئاریۆپاگۆس"ەوە بوو. ناوی "ئاگۆرا" بووە و هەر لەوێدا فەیلەسوفە گەورەکان لەبەردەم پایەکانیدا هاتووچۆیان کردووە و بیریان کردۆتەوە. کاتی خۆی لەو شوێنەدا چەندەها پەرستگای جوان و بینای بانک و هۆڵی دادگای لێبووە، بەڵام ئێستاکە تەنها پاشماوەکانیان ماوەتەوە. پەرستگا مەرمەڕییە دێرینەکەی خودای ئاگر و میتاڵ "هیفایستۆس"، تەنها شتە کە تا ئێستاکەش بەتەنها لەسەر گردۆڵکەیەک ماوەتەوە.
لەو کاتەدا باوکم گوتی؛
«با بڕۆینە خوارەوە هانس تۆماس... هەروەک چۆن موسڵمانێک سەردانی "مەکە" دەکات، تاڕادەیەک منیش ئێستاکە هەر هەمان هەستم هەیە. تەنها جیاوازیمان لەوەدایە کە "مەکە"کەی من تەنها پاشماوەیە و هیچی تر»



وابزانم لەوە دەترسا کە "ئاگۆرا" هیچی وای تێدا نەمابێتەوە و بەتەواوەتی نائومێدی بکات. بەڵام هەر کە گەیشتینە ناو ئەو گۆڕەپانە دێرینە و لەنێوان پارچە مەرمەڕەکانیدا خولاینەوە، خێرا کەلتوری ئەو شارە کۆنەی هاتەوە بەرچاو. هەڵبەتە سوودی لەیەک دوو کتێبی تایبەت بە ئەسیناش وەرگرتووە.
لەوێدا هێندە خەڵکی لێنەبوو. ئەو کاتەی لەسەرەوەدا لە "ئەکرۆپۆلیس"بووین، بە هەزاران خەڵک لەو ناوەدا جمەیان دەهات، بەڵام لەو خوارەوە تاوناتاوێک "جۆکەر"ێکمان دەبینی.
لەیادمە لەو کاتەدا خۆم بە خۆمم دەگوت خەڵکانێک هەن کە لەو بڕوایەدان مرۆڤ چەندین ژیان بژی، ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، ئەوا باوکم دوو هەزارساڵێک لەمەوبەر لەم گۆڕەپانەدا هاتوچۆی کردووە. چونکە لەو کاتانەدا کە باسی ژیانی ئەسینای کۆنی بۆ دەکردم، لەوەدەچوو هەموو شتەکانی "بیربکەوێتەوە".
گومانەکەشم لەو کاتەدا زیاتربوو کە لە پڕێکدا وەستا و ئاماژەی بۆ پاشماوەکان کرد، پاشانیش کەوتە قسە و گوتی؛
«ئا لەوێدا لمیان داناوە و مندالێک قەلای لمین دروستدەکات. یەک لەدوای یەک قەلای نوێ دروستدەکات، بۆ ساتێکی کەم بەخۆشیەوە تەماشایەکی دەکات و دواتر تێکی دەداتەوە. ئابەو شێوەیەش کات زەویەکی لەبەردەستابووە و تاقیکردنەوەی خۆی لەسەرکردووە. مێژووی جیهان لێرەدا نووسرایەوە، لێرەدا ڕووداوەکان ڕوویانداوە و لێرەشدا کۆتاییان پێهاتووە. لێرەدا ژیان لە مەنجەڵێکی پڕلەجادوودا دەکوڵێنرێت. ئێمەش هەر لێرەدا ڕۆژێک لەڕۆژان دروستدەکرێن، وە لەهەمان ئەو مادە هەستیارەش پێکهاتووین کە دایک و باوکمانی لێپێکهاتووە. لێرەدا ڕەشەبای کات لەناوەوەماندا دەمان شەکێنێتەوە،



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



لێرەدا لەگەڵ خۆیدا هەڵماندەگرێت و لەناکاودا دیسانەوە فڕێمان دەداتە خوارەوە. بەجاوویەک دێینە دەرەوە و دواتر دیارنامێنین. هەمیشە کەسێک چاوەڕوانە و دەیەوێت شوێنەکەمان بگرێت... چونکە عەردێکی یەکجارەکی و ڕەق لەژێر قاچامندا نیە. تەنانەت لمیش لەژێر قاچماندا نیە. ئێمە خۆمان لمین»

قسەکانی بەتەواوەتی ترساندمی. تەنها وشەکانی نەیترساندم، بەڵکو شێوەی گوتنەکەی زیاتر کاریتێکردم.

پاش کەمێک بەردەوامی بە قسەکانی دا و گوتی؛

«بەهیچ شێوەیەک ناتوانین خۆمان لە کات بشارینەوە. دەتوانین خۆمان لە پاشا و بەگزادەکان بشارینەوە، لەوانەیە بشتوانین خۆمان لە خودا بشارینەوە. بەڵام هەرگیز ناتوانین خۆمان لە کات بشارینەوە. کات لە هەموو شوێنێکدا دەمانبینێت، چونکە هەموو شتێکی چواردەورمان لەناو ئەو شتە بێ ئۆقرەیەدا نقوومبووە»

پڕبەدڵ سەرێکم بۆ لەقاند، بەڵام باوکم تازە خەریکبوو بەقووڵی دەچووە ناو باسی دەسەڵاتی کاتەوە و گوتی؛

«کات تێناپەڕێت هانس تۆماس. کات چرکەچرکە ناکات، بەڵکو لەڕاستیدا ئێمەین کە دەڕۆین و کاتژمێرەکانمان چرکەچرکیانە. کات، هەروەک چۆن خۆر بەئارامی و بەشێوەیەکی بێبەزەییانە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرزدەبێتەوە و لە ڕۆژئاواوە ئاوادەبێت، ئەویش بە هەمان شێوە بەدرێژایی مێژوو خۆی خۆی دەفەوتێنێت. هەر "کات"یش تەخت و تاراجی شارستانیە گەورەکان دەرمێنێت، بەڕاشکاویش پاشماوە کۆنەکان دادەکرۆژێت و نەوە لەدوای نەوەی مرۆڤیش لولدەکات. هەربۆیە ئێمە دەڵێین "کات ددانی هەیە". "کات" بەردەوام شت دەجوێت و ئێمەش لەنێوان شەویلگەکانی کاتداین»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەوێدا لێمپرسی؛

«کاتی خۆی فەیلەسوفەکان گفتوگۆیان لەسەر ئەو بابەتانە کردووە؟»

بەپەلە سەرێکی بۆ لەقاندم و بەردەوامبوو؛

«ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم، بەشێکی کۆمەڵە گەورەکە پێکدەهێنین. لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری سەر زەوی دەڕۆین و پێمان وایە ئەوە شتێکی هەر زۆر ئاسایی بێت. تۆ خۆت بەچاوی خۆت ئەو کۆمەڵە زۆرەی سەرەوەت بینی کە لە "ئەکرۆپۆلیس"دا جمەیان دەهات و بەهێواشی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆیشتن! بەڵام هیچیان بۆ هەتاهەتایە لەوێدا نامێننەوە. ئەوان دەڕۆن و کۆمەڵە خەڵکێکی تر دێتە جێگایان، چونکە چەندەها خەڵکی تریش لە سەرەدا وەستاون. فۆرمەکان دێن و دەڕۆن... "ماسک"ەکانی سەر دەمووچاو دێن و دەڕۆن. بەردەوامیش بیرۆکەی نوێ دێتەئاراوە. هیچ بابەتێک دووبارە ڕوونادادتەوە، هیچ ڕووداوێک دوو کەڕ’ت دەرناکەوێتەوە... برادەر، هیچ شتێک نیە هێندەی مرۆڤ ئاڵۆز بێت، لەگەڵ ئەوەشدا وەک شتێکی هەرزان دەبینرێین»

پێم وابوو زۆر ڕەشبینانە دەڕوانێت، لەبەرئەوە وێرام ڕستەیەکی پێ بڵێم؛

«بەڕاستی هەموو شتێک هێندە ڕەشە؟»

هاوارێکی کرد بەسەرمدا و گوتی؛

«بێدەنگ بە... هێشتام هەموو ئەو قسانەم نەکردووە کە دەمەوێت بیانڵێم»

دواتر لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و گوتی؛

«ئێمە وەک چەند کەسایەتیەکی قەشەنگی حەکایەتێک لەسەر ئەم زەویە دێین و دەچین. سەر بۆیەکتری دەلەقێنین و بۆ یەکتری



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



پێدەکەنین، هەروەک ئەوەی بەیەکتری بڵێین؛ "چۆنیت... ئێمە پێکەوە دەژین! ئێمە هەموومان لەناو هەمان هەقیقەتداین، لەناو هەمان حەکایەتداین"... ئەمەت بەلاوە سەیر نیە هانس تۆماس؟ هەموومان پێکەوە لەسەر ئەستێرەیەکی گەردوون دەژین. بەڵام پاش ماوەیەک وندەبین... وەک ئەوەی جادوویەکمان لێبکرێت و لەناکاودا ونببین»

من هەر دانیشتبووم و تەماشامدەکرد. من ئەوم لە هەموو کەسێکی تر باشتر دەناسی. هەر ئەویشم لە هەموو کەسێکی تر زیاتر خۆشدەویست. بەڵام ئێستاکە بەپێوە وەستابوو و تەماشای پارچە مەرمەڕەکانی دەکرد و بەشێوەیەکی سەیر و نامۆ دەدوا. باوکم بەو شێوەیە قسەی نەدەکرد، لەدڵی خۆمدا دەمگوت لەوانەیە "ئەپۆلۆ" یان شەیتانێکی تر دەسەڵاتی بەسەردا گرتبێت.

پاشان درێژەی بە وتەکەی دا و گوتی؛

«ئەگەر لە سەدەیەکی تردا بژیاینایە، ئەوا ئەو کاتە ژیانمان لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تردا بەسەردەبرد. ئێستاکەش تەنها ئەوەندە دەتوانین کە سەر بۆ هەزارەها کەسی هاوچەرخمان بلەقێنین، بەدەمیانەوە پێبکەنین و پێیان بڵێین "ڕۆژتان باش، ئێوە چۆنن!". سەیرە... سەیرە کە ڕێک من و تۆ لە هەمان کاتدا دەژین. لەوانەیە لەناکاودا ڕووبەڕووی کەسێکی ئاشنا ببمەوە و دەرگایەک بکەمەوە، لەوێوە هاوارێک بکەم و بڵێم؛ ڕۆحەکە چۆنیت!»

بە هەردوو دەستی شێوەی کردنەوەی دەرگای ڕۆحی نیشاندام و گوتی؛

«گوێت لێمە، ئێمە دەژین. بەڵام تەنها ڕێک لەکاتی ئێستاکەدا دەژین. دەستمان ڕادەوەشێنین و دەڵێین؛ "ئێمە هەین". بەڵام دواتر وەلاوەدەنرێین و دەکەوینە نێو تاریکایی مێژووەوە. چونکە ئێمە شتێکین کە تەنها یەک کەڕەت بەکاردەهێنرێین. ئێمە لە



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

کەرنەفاڵێکی هەتاهەتایی ڕووبەندپۆشیدا بەشداردەبین کە "ماسک"ەکان تێیدا دێن و دەڕۆن؛ زنجیرەیەکی دوورودرێژین و کۆمەڵ کۆمەڵ بەجێیدێڵین... بەڵام هانس تۆماس من و تۆ شایانی شتێکی زۆرترین. هەردووکمان شایانی ئەوەین ناومان لە شتێکی هەتاهەتاییدا بنووسرێتەوە و نەسڕدرێتەوە... لەناو شتێکدا کە جیاوازبێت لەم لمە گەورەیەی کە تێیداین»

هەر بەرامبەر پارچە مەرمەڕەکان وەستابوو و هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا. لەوێدا تێگەیشتم کە ئەو دەمێکە لەلای خۆیەوە ئەو وتەیەی ئامادەکردبوو و چاوەڕوانی ئەوە بووە کە بگەینە گۆڕەپانە کۆنەکەی ئەسینا و لەوێدا هەڵیبڕێژێت. بەو شێوەیەش لەگەڵ قسەکانیدا بەشداری گفتوگۆ فەلسەفیە کۆنەکانیشی دەکرد.

لەڕاستیدا قسەی بۆ من نەدەکرد، بەڵکو هەموو وتەکەی بۆ فەیلەسوفە یۆنانیە دێرینەکان پێشکەشدەکرد. ئەو قسەکانی ڕووبەڕوی ڕابووردوویەکی کۆن دەکردەوە.

ڕاستە من هێشتام خۆمم بە تەواوەتی وەک فەیلەسوفێک نەدەبینی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەخۆمدا ڕاپەڕمووم و گوتم؛

«پێت وانیە شتێک هەبێت کە لەم لمە گەورەیەدا بۆ هەتاهەتایە بمێنێتەوە؟»

تەماشایەکی کردم و تەنها لەوێدا هەستمکرد کە قسە لەگەڵ مندا دەکات. وابزانم پرسیارەکەم ڕایچڵەکاند و لە خەڵوەتە قوڵەکەیدا هێنایە دەرەوە. پاشان ئاماژەی بۆ سەری خۆی کرد و گوتی؛

«ئەمە... لێرەدا شتێک هەیە کە ناسڕدرێتەوە»

بۆ ساتێک لەوە ترسام باوکم بەتەواوەتی تێکچووبێت، چونکە لەوە دەچوو مەبەستی لەشتێکی تربێت نەک سەری خۆی.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

«هانس تۆماس، وەک سەرەتایەک دەمەوێت بڵێم "بیرکردنەوە نافەوتێت". فەیلەسوفەکانی کاتی خۆی ئەسیناش لەو بڕوایەدابوون شتێک هەبێت کە شیاوی فەوتاندن نەبێت. "پلاتۆن" ناوی ئەو شتەی نابوو "جیهانی ئەندێشە یان جیهانی بیر". کە منداڵێک قەڵایەک لە لم دروستدەکات، قەڵاکە خۆی لە خۆیدا هێندە گرنگ نیە، بەڵکو وێنەی ئەو قەڵایە گرنگە کە لە خەیاڵی منداڵەکەدا هەبووە، بەرلەوەی قەڵاکە دروستبکات. بەڕاست... بەبڕوای تۆ بۆچی منداڵەکە هەر پاش ئەوەی قەڵاکە دروستدەکات، خێرا دەیڕوخێنێتەوە؟»

من لەسەرەتای قسەکانی باشتر تێگەیشتم و بەڕاستی نەمدەزانی بۆ دەیڕوخێنێتەوە، پاشان گوتی؛

«قەت وێنەیەکت نەکێشاوە کە بەدڵت نەبووبێت؟ یان شتێکت دروستنەکردوە کە پراوپڕ بەو شێوەیە نەبووبێت کە ویستبێتت؟ دواتریش دووبارە و سێبارە دروستی دەکەیتەوە و هەر وازناهێنیت، چونکە ئەو وێنەیەی کە لە خەیاڵتدایە هەمیشە جوانتر و بێکەموکوڕیترە لەو کۆپیانەی کە بە دەستەکانت بەرهەمیان دەهێنیت. هەمان شتیش بەسەر هەموو ئەو شتانەی چواردەورماندا دەچەسپێت. ئێمە بەردەوام دەخولێینەوە و پێمان وایە هەموو شتەکانی چواردەورمان شیاوی ئەوەبن کە باشترین. دەزانیت بۆ هانس تۆماس؟

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند، ئەویش توڕەبوو و بەچرپەچرپێک گوتی؛

«لەبەرئەوەی ئێمە هەموو وێنەکانی ناوەوەمان لە "جیهانی ئەندێشەوە" هێناوە. ئێمە بەڕاستی سەر بە ئەوێین و ئەم ناو لمە گەورەیە شوێنی ڕاستەقینەی ئێمە نیە، لێرەدا "کات" هەموو ئەو شتانە دەفەوتێنێت کە ئێمە خۆشمان دەوێت»







«کەواتە جیهانێکی تریش بوونی هەیە؟»

باوکم بەدەموچاوێکی پڕلەنهێنیەوە سەرێکی بۆ لەقاندم و گوتی؛

«بەڵێ، ڕۆحمان بەرلەوەی بێتە ناو لەشمانەوە لەوێدابووە. کاتێکیش کە "کات" لەشمان لەناودەبات، دیسانەوە ڕۆحمان هەر بەرەو ئەوێ دەچێتەوە»

بەسەرسامیەوە تەماشایەکم کرد و گوتم؛

«بەڕاست؟»

«بەڵێ "پلاتۆن" لەو بڕوایەدابووە. بمانەوێت و نەمانەوێت لەشمان هەروەک قەڵا لمیەکان، چاوەڕوانی هەمان چارەنووسە. بەڵام شتێکیش لەناوەوەماندایە کە "کات" ناتوانێت لەتلەتی بکات. هۆی نەفەوتانی ئەو شتەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە بنەڕەتدا ئەو شتە سەربە ئێرە نیە. لێرەدا باس لەشتێک دەکەین کە لەسەرو هەموو ئەو شتانەی چواردەورمانەوەیە و ئەو کاتە هەستی پێدەکەین کە هەموو شتەکان وەک کۆپیەکی شتە ڕاستەقینەکان ببینین»

من بەتەواوەتی لە هەموو قسەکانی تێنەگەیشتم، بەڵام هێندە تێگەیشتم کە فەلسەفە بابەتێکی سەختە و باوکیشم فەیلەسوفێکی ئاڵۆزە. لەو کاتەدا منیش هەستمدەکرد لە یۆنانیە کۆنەکان نزیکبوومەتەوە. من ئەوەندەم دەزانی کە هەموو ئەو شتە مادیانەی لەپاش خۆیان بەجێیانهێشتووە وا بوونەتە پاشماوە و هێندەی نەماوەتەوە، بەڵام بیرکردنەوەکانیان تا ئەمڕۆکەش هەر بەردەوامە. دواجار باوکم ئاماژەی بۆ ئەو شوێنەکرد کە کاتی خۆی "سوکرات"یان تێدا زیندانکردووە و گوتی دواتر لەوێدا ژەهرەکەی خواردەوە و گیانی لەدەستدا. هەروەها گوتی بەو تاوانە گوناهباریانکرد کە گوایە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

گەنجەکان لەسەر ڕێگای ڕاست لادەدا، بەڵام لەڕاستیدا ئەو لەو کاتەدا تەنها جۆکەری "ئەسینا" بووە.



www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

**نۆی دینار**

**...هەمووومان لە یەک خێزانەوە هاتووین...**

پاش ئەوەی "ئەکرۆپۆلیس" و گۆڕەپانە کۆنەکەمان بەجێهێشت، بەناو کۆمەڵێک کۆڵانی باریک باریکی ناو بازاڕەکاندا ڕۆیشتین و گەیشتینە گۆڕەپانی بەردەم بینا گەورەکەی پەرلەمان، ناوی گۆڕەپانی "سیونتاگما" بوو. لەو ڕێگایەدا باوکم دەستەیەک یاری کاغەزی کڕی، یەکسەر جۆکەرەکەی دەرهێنا و هەموو ئەوانی تری پێبەخشیم.

ئەو ناوە پڕبوو لە چێشتخانە و شوێنی نانخواردن، ئێمەش خۆمان کرد بە یەکێکی نزیک گۆڕەپانەکەدا. پاش قاوە خواردنەوە باوکم گوتی "دەمەوێت لە چەند ڕێگایەکەوە هەوڵبدەم دایکت بدۆزمەوە". منیش پاش ئەو هەموو گەڕانە لەناو پاشمەوە یۆنانیە کۆنەکاندا بەتەواوەتی هیلاکببووبووم، لەبەرئەوە وا ڕێککەوتین کە من لە قاوەخانەکەدا پشوویەک بدەم و باوکیشم بڕواتە دەرەوە و چەند تەلەفونێک بەملاولادا بکات و گەر بۆشی بکرێت سەردانی خانەیەکی مۆدێلی ئەو نزیکانەش بکات.

باوکم بەدوی کارەکانی کەوت و منیش بەتەنها لەو گۆڕەپانە گەورەیەدا مامەوە، لەوێدا یۆنانیە کورتەباڵاکان پۆل پۆل دەهاتن و دەچوون. هەروا بۆ خۆشی دەستەی کاغەزەکەم دەرهێنا و دانەدانە لەسەر مێزەکە ڕیزمکردن. هەر کاغەزەو ڕستەیەکی بچکۆلەم پێبەخشی و دواتر ویستم ڕستەکان کۆبکەمەوە و چیرۆکێکی گەورەی پێ بهۆنمەوە. بەڵام لەبەر نەبوونی قەڵەم و کاغەز، هەرزوو سەرم لێشێوا و ڕستەکانم لێتێکچوو. لەبەرەئەوە پاش یەک دوو جار دەستم لە یاریەکەم هەڵگرت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

لەبری ئەوە زەرەبینەکە و کتێبە چکۆلەکەم دەرهێنا و کەوتمەوە خوێندنەوەی چیرۆکی دوورگە خەیاڵیەکە. دڵنیابووم کە گەیشتبوومە خاڵی وەرچەرخانی چیرۆکەکە، چونکە هەریەکێک لە کورتەبنەکان ڕستەی خۆی گوت و لەوێدا دەبوایە جۆکەر ڕستە جیاوازەکانی ڕێکبخستایە. بەو شێوەیەش ئومێدەواربووم زانیاریەکی زیاترم دەربارەی پەیوەندی نێوان خۆم و باسە سەیرەکەی "هانس"ی نانەوام بۆ دەرکەوێت، کە ماوەیەکی زۆر  زۆر لەوەوبەر بۆ "ئەلبێرت"ی دەگێڕایەوە.

خواردنەوەی ناو شوشە بچکۆلەکە کاریگەری لەسەر هەموو لەشمکرد و هەستێکی یەکجار خۆشی پێبەخشیم، هەستمدەکرد زەوی لەژێر قاچمدا جۆلانێدەکات. هەردەتگوت دیسانەوە لەناو دەریادام.

گوێم لێبوو "فرۆد" دەیگوت؛

«چۆن بەخەیاڵتا هات خواردنەوەی ناو شوشەکەی بدەیتێ؟»

گوێشم لێبوو جۆکەر لە وەڵامدا گوتی؛

«ئاخر زۆر بەرێزەوە داوای لێکردم کە تامێکی بکات»

زۆر دڵنیانیم کە جۆکەر ڕێک ئەو قسانەی گوت یان نا، چونکە چرکەیەک دوای ئەوە خەوم لێکەوت. کە خەبەرم بووەوە، فرۆد لەسەر سەرم وەستابوو. ئاگاملێبوو بە هێواشی قاچی تێوەژەنم و گوتی؛

«هەستە لەخەو! وا جۆکەر خەریکە مەتەڵە گەورەکە هەڵبێنێت»

داچڵەکیم و گوتم؛

«کام مەتەڵ؟»

«"یاری جۆکەرەکەمان"، خۆ هەر هیچ نەبێت هێندەت لەیادە. ئێستاکە جۆکەر ڕستەکان ڕێکدەخات و دەیکاتە یەک چیرۆک»



هەستامە سەرپێ و چاوم لێبوو جۆکەر کورتەبنەکانی بەشێوەیەکی دیاریکراو یەک لەدوای یەک دادەنا. هێشتام هەر بەشێوەی بازنە وەستابوون، بەڵام هەموو ڕەنگە جیاوازەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کردبوو. هەر زوو بۆمدەرکەوت کە هەموو ژمارە جوتەکان لەتەنیشت یەکەوە وەستابوون.

جۆکەر دیسانەوە لەسەر کورسیە بەرزەکەی دانیشتەوە و من و فرۆدیش هەمان شتمان کرد. ئەوجا جۆکەر هاواریکرد و گوتی؛

«کورەکان! ئێوە بڕۆنە نێوان "پاشا"کان و "دە"کانەوە. "کچ"ەکانیش دەبێت لەنێوان "پاشا"کان  "بللی"ەکاندا بوەستن»

یەک دوو جار سەری بۆ خوراند و پاشان دیسانەوە کەوتەوە قسەکردن؛

«"نۆ"ی سینەک و "نۆ"ی دینار، جێگاکانتان بگۆڕنەوە!»

نۆی سینەک بەلارولەنجە لەشوێنی خۆیەوە هاتە دەرەوە و چووە شوێنی نۆی دینار، نۆی دیناریش بە هێواشی هەنگاوینا و شوێنە بەتاڵەکەی نۆی سینەکی گرت.

بەرلەوەی جۆکەر بەتەواوەتی ڕازیبێت، چەند گۆڕانکاریەکی تری ئەنجامدا. لەوێدا فرۆد بەچرپەچرپ گوتی؛

«ئەوە پێی دەگوترێت "دابەشکردن". لەپێشدا هەموو کارتەکان بڵاودەکرێنەوە و هەریەکەیان ڕۆڵێک دەبینێت، دواتریش سەرلەنوێ تێکەڵدەکرێنەوە و دیسانەوە بەشێوەی بازنە دادەنرێنەوە»

نەمدەتوانی بەئاسانی لە قسەکانی تێبگەم، چونکە لەپڕێکدا لەقاچێکمەوە تامێکی زۆر بەهێزی لیمۆم دەکرد. لەهەمان کاتیشدا بۆنێکی خۆش و فێنکی ترشیەک لە گوێچکەی چەپمدا یاریدەکرد.

لەپڕێکدا جۆکەر گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«با ئێستاکە هەریەکەو رستەکەی خۆی بڵێت. بەڵام تەنها ئەو کاتەی هەموو پارچەکان پێکەوە تێکەڵکێش دەکرێن، ئەوسا مانای تەواوەتی یاری کاغەزەکەمان بۆ دەردەکەوێت، چونکە هەموومان لە یەک خێزانەوە هاتووین»

بۆ ساتێک هەمووان بەتەواوەتی بێدەنگبووبوون، بەڵام دواتر پاشای قەرە بێدەنگیەکەی شکاند و گوتی؛

«بەڵام ئەی کام یەکەمان دەست پێبکات؟»

فرۆد چرپاندی بە گوێچکەمدا و گوتی؛

«هەموو جارێک پاشای قەرە ئاوها بێئارامە»

جۆکەر دەستێکی راوەشاند و گوتی؛

«بێگومان سەرەتای چیرۆکەکە، کۆتایی چیرۆکەکەمان دەستنیشان دەکات. چیرۆکەکەی ئێمەش لە "کوڕی"ی دینارەوە دەست پێدەکات. فەرموو کوڕی دینار دەستپێبکە»

دوای قسەکانی جۆکەر، کوڕی دینار گوتی؛

«کەشتیە چارۆکەدارەکە بە بارە زیوەکەیەوە لەناو دەریای توڕەدا نقووم دەبێت»

پاشای قەرە لەلای راستی کوڕی دینارەوە وەستابوو و گوتی؛

«ئەو کەسەی کە بەباشی لە چارەنووس تێدەگات، دەمێنێتەوە»

لەوێدا جۆکەر بەبێزاریەوە هاوارێکی لێبەرزبووەوە و گوتی؛

«نا، نا... ئەم یاریە دەبێت وەک خۆر بڕوات، لەبەرئەوە پاشای قەرە لەدوای هەر هەمووانەوە دێت»

لەو کاتەدا تەماشایەکی "فرۆد"م کرد و بینیم دەموچاوی تێکچووبوو، پاشان لەبەرخۆیەوە گوتی؛

«من رێک لەوە دەترسام»



«لەچی؟»

«لەوەی کە پاشای قەرە دواهەمین کەس بێت»

فریا نەکەوتم وەڵامی بدەمەوە، چونکە لەناکاودا تامی زەردێنەی هێلکە لە کەللەی سەرمەوە دەهات. ئێمە کاتی خۆی لە "لیوبیک"دا هەموو رۆژێک زەردێنەی هێلکەمان نەبوو کە بیخۆین.

ئەوجا جۆکەر گوتی؛

«لەسەرەتاوە دەست پێدەکەینەوە... لەپێشدا با هەموو "کوڕ"ەکان رستەکانیان بڵێن، ئینجا "دە"کان و دواتریش ئەوانی تر بەئاراستەی خۆردا بەدوایاندا بێن. فەرموون کوڕەکان!»

پاشان هەر یەکێک لە کوڕەکان رستەکەی خۆی گوت؛

«کەشتیە چارۆکەدارەکە بە بارە زیوەکەیەوە لەناو دەریای توڕەدا نقووم دەبێت. دەریاوانەکە دەگاتە دوورگەیەک کە گەورەتر و گەورەتر دەبێت. لە گیرفانی کراسەکەیدا دەستەیەک کاغەزی تێدایە و دواتر بۆ ئەوەی وشک ببنەوە لەبەر خۆردا دایاندەنێت. **53** وێنە بۆ ماوەی چەندین ساڵ دەبنە هاوەڵی کوڕی شوشەچیەکە»

هەر پاش تەواوبوونی قسەکانیان جۆکەر گوتی؛

«ئەمەیان باشتربوو. چیرۆکەکەمان بەو شێوەیە دەستپێدەکات. لەوانەیە تا ئێستاکە چیرۆکەکەمان شایانی ئەوە نەبێت کە شانازی پێوە بکەین، بەڵام هێشتام هەر لە سەرەتاکەیداین. ئێستاکەش نۆبەی "دە"کانە... فەرموون!»

«بەرلەوەی ڕەنگەکان کاڵ ببنەوە، **53** کورتەبنە لە فەنتاسی دەریاوانە تەنیاکەدا دادەڕژێن. کەسایەتیە سەیرەکان لە ئاگایی "مێستەر"دا هەڵدەپەڕن. ئەو کاتەی کە "مێستەر" دەخەوێت،



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

کورتەبنەکان ژیانی تایبەتی خۆیان بەسەردەبەن. لەبەیانیەکی خۆشدا، پاشا و کوڕ لە زیندانی ئاگایدا دێنە دەرەوە»

«ئافەرم! پێم وانیە لەوە پوختتر و وردتر بگوترێت. ئادەی "نۆ"کان فەرموون!»

«فەنتاسیەکان لەشوێنی دروستکردنیانەوە دێنە دەرەوە و دەڕۆنە شوێنە دروستکراوەکە. کەسایەتیەکان لەقۆڵی چاکەتی جادووبازەکەوە دێنە دەرەوە و لەپڕێکدا بەئاسمانەوە هەست بەوە دەکەن کە پڕلەژیانن. فەنتاسیەکان یەک لەیەک جوانترن، بەڵام جگە لە یەکێکیان هەر هەموویان مێشکیان لەدەستداوە. لە هەموو کۆمەڵەکەدا تەنها یەک جۆکەری تەنیا دەتوانێت لە وەهمەکە تێبگات»

«قسەکانیان ڕاستە! چونکە هەقیقەت هەمیشە شتێکی تەنهایە... هەشتەکان!»

«خواردنەوە پرشنگدارەکە هەستەکانی جۆکەر دەوەستێنێت. جۆکەر ئەو خواردنەوەیە تفدەکاتەوە. ئەو بەبێ ئەو شلە پڕلەدرۆیە باشترێک بیردەکاتەوە. پاش 52 ساڵ کوڕەزای خاوەنی کەشتیە تێکشکاوەکە دێتە ئاواییەکەوە»

جۆکەر تەماشایەکی کردم، هەر وەک ئەوەی پێم بڵێت قسەکانیان ڕاستە. ئەوجا وەک فەرمانێک گوتی "حەوتەکان!".

«هەقیقەت لە کاغەزەکاندایە. لە ڕاستیدا کوڕی شوشەچیەکە فێڵی لە فەنتاسیەکانی خۆی کردووە. فەنتاسیەکان بەشێوەیەکی نایاب لە "مێستەر" هەڵدەگەڕێنەوە. پاش ماوەیەکی کەم "مێستەر" دەمرێت، لەڕاستیدا کورتەبنەکان دەیکوژن»

«هووها! شەشەکان!»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«شازادەی خۆر ئەو ڕێگایە دەدۆزێتەوە کە بەرەو دەریاکە دەڕوات. دوورگە خەیاڵیەکە لەناووەڕا دەڕمێت. کورتەبنەکان دیسانەوە کۆڵدەدەن. بەرلەوەی حەکایەتەکە کۆتایی پێبێت، کوڕی نانەواکە بۆی دەردەچێت»

«ئەمەیان باشترێکبوو! ئینجا نۆبەی ئێوەیە "پێنج"ەکان. بەدەنگێکی ڕوون و ڕەوان و بەرز ڕستەکانتان بڵێن، چونکە لێرەدا بچوکترین هەڵەی زمانەوانی کارەساتێکی مەزن دەخوڵقێنێت»

دوو وشەی "کارەساتێکی مەزن" هێندە سەری لێشێوانم، ئاگام لە ڕستەی یەکەم نەبوو.

«کوڕی نانەواکە بەرەو شاخەکان ڕادەکات و بەنهێنی لەلادێیەکدا دەمێنێتەوە. نانەواکە گەنجینەی دوورگە خەیاڵیەکە دەشارێتەوە. ئەو شتەی کە ڕوودەدات لە کاغەزەکاندایە»

لەوێدا جۆکەر چەپڵەیەکی قایمی لێدا و گوتی؛

«هەموو کەسێک دەبێت باجی هەڵەکانی خۆی بدات. لایەنی باشی ئەم یاریە لەوەدایە کە تەنها ئەو شتانە ناخاتە ڕوو کە ڕوویانداوە، بەڵکو ئەو شتانەش نیشاندەدات کە لە داهاتوودا ڕوودەدەن. هەتا ئێستاکەش تەنها نیوەی یاری کاغەزەکەمان داناوە»

سەیرێکی "فرۆد"م کرد، ئەویش دەستێکی خستە سەرشانم و زۆر بەهێواشی چرپاندی بە گوێمدا و گوتی؛

«ڕاستدەکات کوڕەکەم»

«مەبەستت چیە؟»

«مەبەستم لەوەیە من هێندەم نەماوە ژیان بەجێبهێڵم»

«قسەی قۆڕ... یاریەکی شێتانەی ئاوها بەڕاستی وەرمەگرە»

«ئەمە تەنها هەر یاری نیە، برادەر»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



بەدەنگێکی بەرز هاوارمکرد و گوتم؛

«نابێت بمریت!»

لەو کاتەدا لەبەر بەرزی هاوارەکەم چەند کورتەبنەیەک ئاوڕیان لێدایەوە.

«برادەر، هەموو کەسێکی پیر دەبێت بمرێت. بەڵام هەر خۆشیشە کە بزانیت کەسێک بەدواتا دێت و لەو شوێنەوە بەردەوامدەبێت کە تۆ جێیدێڵیت»

منیش گوتم؛

«وابزانم منیش لەم دوورگەیەدا دەمرم»

پیاوە پیرەکە بەدەنگێکی نەرم و نیانەوە گوتی؛

«ئەی گوێت لێنەبوو ئەوان چیان گوت؟ "کوڕی نانەواکە بەرەو شاخەکان ڕادەکات و بەنهێنی لەلادێیەکدا دەمێنێتەوە". مەگەر تۆ ئەو کوڕی نانەوایە نەبیت؟»

دیسانەوە جۆکەر چەپڵەیەکی تری لێدایەوە. زرنگەی زەنگۆڵەکانی لە هەموو شوێنێکی هۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. پاشان فەرمانی کرد و گوتی؛

«بێدەنگی! بەردەوامبن... نۆبەی "چوار"ەکانە!»

خەیاڵێکم هەر لای فرۆد بوو و دەترسام بمرێت، لەبەرئەوە گوێم لە ڕستەکانی چواری سینەک و دینار نەبوو؛

«لادێکە جێگای ئەو کوڕە بێدەرەتانە دەکاتەوە کە دایکی بەنەخۆشی مردووە. نانەواکە خواردنەوەیەکی پرشنگداری دەداتێ و ماسیە جوانەکانی پیشان دەدات»

«ئینجا سەرەی "سێ"کانە... فەرموون!»

لەوێشدا دیسان تەنها دوو ڕستەم بەر گوێکەوت؛



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«دەریاوانەکە ژنێکی جوان دەهێنێت و کوڕێکیان دەبێت، دواتر ژنەکەی بەمەبەستی "خۆدۆزینەوە" بەرەو وڵاتەکانی خواروو سەفەردەکات. باوک و کوڕ بەدوای ئەو ژنە جوانەدا دەگەڕێن کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە»

هەرلەدوای تەواوبوونی قسەکانی "سێ"کان، دیسانەوە جۆکەر خۆی لەبابەتەکە هەڵقورتاندەوە و گوتی؛

«ئەوە "پێر"ێکی جوانبوو. ئێستاکە ئیدی بەپاپۆڕ ڕێک بەرەو "وڵاتی بەیانی" دەڕۆین»

ڕووم بەرەولای فرۆدا وەرچەرخاند و بینیم فرمێسک بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە. سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و گوتم؛

«هیچ تێناگەم»

بەهێواشی چرپاندی بە گوێمدا و گوتی؛

«شش! گوێ بۆ ئەو چیرۆکە شلبکە کوڕ'ەکەم»

«چیرۆک؟»

«چیرۆک یان باسی داهاتوو، بەڵام داهاتووش بەشێکە لە چیرۆکەکە. ئەم یاریە بەرەو چەندەها نەوەی داهاتوومان دەبات. جۆکەر مەبەستی لەوەبوو کە گوتی "وڵاتی بەیانی". ئێمە لە سەرتاپای ئەو شتانە تێناگەین کە لە کاغەزەکاندا نووسراون، بەڵام هێندە دەزانین کە خەڵکی تر بەدواماندا دێن»

«"دوو"کان!»... جۆکەر گوتی.

هەوڵمدەدا هەموو ئەو ڕستانە لەبەرکەم کە دەیانگوت، بەڵام تەنها سێ دانەیان لەیاد ماوە؛

«کورتەبنە دەست ساردەکە ئاماژە بۆ ڕێگای لادێ نهێنیەکە دەکات و زەڕەبینێک بەو کوڕە دەبەخشێت کە لە وڵاتی باکورەوە هاتووە، هەتا



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



لە سەفەرەکەیدا بەکاریبهێنێت. زەرەبینەکە ڕێک بە ئەندازەی پارچە شکاوەکەی شوشەی ماسیەکەیە. ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات»

جۆکەر هاوارێکی کرد و گوتی؛

«هەر زۆر جوانە! من هەر خۆم زانیم زەرەبین و شوشەی ماسیەکە کلیلی کردنەوەی هەموو چیرۆکەکەیە... ئینجا نۆبەی "بللی"یەکانە. شازادەکان فەرموون!»

«چارەنووس وەکو مارێکی برسی وایە و لەبرسێتیدا خۆی خۆی دەخوات. قتووەکەی ناوەوە قتووەکەی دەرەوە دەکاتەوە، وە لە هەمان کاتیشدا قتووەکەی دەرەوە قتووەکەی ناوەوە دەکاتەوە. چارەنووس وەک گوڵەکەلەرم وایە، لە هەموو لایەکەوە وەک یەک گەشەدەکات»

«کچەکان!»

لەبەر ماندووی و مەستیم تەنها دوو ڕستەیانم لەبیرماوە؛

«ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات و بەو شێوەیەش دەنگی لەدووری سەدان میلەوە دەبیسترێت. دەریاوانەکە مەشروبە قورسەکە تفدەکاتەوە»

ئینجا جۆکەر گوتی؛

«ئێستاکەش سەرەی ئەوە هاتووە پاشاکان یاری کاغەزەکەمان بەچەند هەقیقەتێکی ڕوون و پتەو کۆتایی پێبهێنن. پاشاکان فەرموون. ئێمە گوێمان بۆ ئێوە شلکردووە»

«یاری کاغەزەکە نەفرینی نەوەکانە. هەمیشە جۆکەرێک هەڵدەکەوێت کە لە فرتوفێڵەکە تێبگات. ئەو کەسەی کە بەباشی لە چارەنووس تێدەگات، دەمێنێتەوە»





ئەوە سێهەمین جاربوو کە پاشای قەرە هەمان ڕستەی گوتەوە و باسی زاڵبوونی دەکرد بەسەر چارەنووسدا. لەپاش قسەکانی پاشاکان، جۆکەر و هەموو کورتەبنەکانی تر چەپڵەیەکیان لێدا، دواتریش جۆکەر هاواریکرد و گوتی؛

«ئافەرم! هەمووومان دەبێت شانازی بەم یاری کاغەزەوە بکەین، چونکە هەر هەمووومان بەشداریمان تێداکرد.

دیسانەوە کورتەبنەکان چەپڵەیەکی تریان لێدایەوە. جۆکەر دەستێکی کێشا بەسنگی خۆیدا و گوتی؛

«با لەڕۆژی جۆکەردا ڕێزێکی زۆر لە جۆکەر بگرین، چونکە پاشەڕۆژ هی ئەوە!»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





**دەی دینار**

**...لەپشت یەکێک لەو دوکانەکانەوە کوڕێکی بچکۆلەم بینی سەرەتاتکێی دەکرد...**

سەرم لەسەر کتێبە بچکۆلەکە هەڵگرت و مێشکم هاژەی دەهات. چەندەها ئەندێشە بەخەیاڵمدا دەهاتن و دەچوون.

لەو گۆڕەپانە گەورەیەی "سیونتاگما"دا، یۆنانیە کورتەباڵاکان بە خۆیان و ڕۆژنامەکانی دەستیان و جانتا بچکۆلەکانی بندەستیانەوە دەهاتن و دەچوون. هەر لەوێشدا بۆم ڕوونبووەوە کە کتێبە بچکۆلەکە کتێبێکی فاڵگرتنەوەیە و سەفەرەکەم لەگەڵ ڕووداوێکدا گرێدەداتەوە کە سەد ساڵ لەوەوبەر لەسەر دوورگە خەیاڵیەکەدا ڕوویداوە.

هەروا دانیشتبووم و سەرلەنوێ ئەو لاپەڕانەم هەڵدایەوە کە ماوەیەک لەوەوبەر خوێندمنەوە و دیسانەوە تەماشایەکم کردنەوە.

ڕاستە "هانس"ی نانەوا هەموو پێشبینیە کۆنەکەی نەدەهاتەوە یاد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەئاشکرا پەیوەندی نێوان ڕستەکان دیاربوون؛

«کوڕی نانەواکە بەرەو شاخەکان ڕادەکات و بەنهێنی لەلادێیەکدا دەمێنێتەوە. نانەواکە گەنجینەی دوورگە خەیاڵیەکە دەشارێتەوە. لادێکە جێگای ئەو کوڕە بێدەرەتانە دەکاتەوە کە دایکی بەنەخۆشی مردووە. نانەواکە خواردنەوەیەکی پرشنگداری دەداتێ و ماسیە جوانەکانی پیشان دەدات...»

بەئاشکرا دیاربوو کە کوڕی نانەواکە "هانس"ی نانەوابوو، "فرۆد"یش خۆی ئەو ڕاستیەی دەزانی. لادێ دوورەکەش دەبێت "دۆرف" بێت. ئەو کوڕەش کە دایکی بە نەخۆشی مردووە، بێ سێ ودوو دەبێت "ئەلبێرت" بووبێت.





دواتر "هانس"ی نانەوا گوێی لە دوو ڕستەی "سێ"کان نەبوو. بەڵام کاتێک دوو ڕستەکەی تری "سێ"کان و ڕستەکانی تری "دوو"ەکانم لە یەکدەدا، بەڕوونی پەیوەندی نێوانیان دەکەوتە بەرچاوم؛

«دەریاوانەکە ژنێکی جوان دەهێنێت و کوڕێکیان دەبێت، دواتر ژنەکەی بەمەبەستی "خۆدۆزینەوە" بەرەو وڵاتەکانی خوارووی سەفەردەکات. باوک و کوڕ بەدوای ئەو ژنە جوانەدا دەگەڕێن کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە. کورتەبنە دەست ساردەکە ئاماژە بۆ ڕێگای لادێ نهێنیەکە دەکات و زەرەبینێک بەو کوڕە دەبەخشێت کە لە وڵاتی باکورەوە هاتووە، هەتا لە سەفەرەکەیدا بەکاریبهێنێت. زەرەبینەکە ڕێک بە ئەندازەی پارچە شکاوەکەی شوشەی ماسیەکەیە. ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات...»

هەموو ئەوانەم بەلاوە ڕوونبوو، بەڵام زۆر ڕستەش هەبوون کە لێیان تێنەدەگەیشتم؛

«قتووەکەی ناوەوە قتووەکەی دەرەوە دەکاتەوە، وە لە هەمان کاتیشدا قتووەکەی دەرەوە قتووەکەی ناوەوە دەکاتەوە...» «ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات و بەو شێوەیەش دەنگی لەدووری سەدان میلەوە دەبیسترێت...»

«دەریاوانەکە مەشروبە قورسەکە تفدەکاتەوە...»

بڵێیت ئەوە مانای ئەوەبێت کە باوکم واز لە خواردنەوە دەهێنێت. ئەگەر وابێت، ئەوا بەڕاستی سەرسامی باوکم و ئەو پێشبینیە کۆنەش دەبم.

گرفتەکە لەوەدابوو کە "هانس"ی نانەوا تەنها 42 ڕستەی دەستەی کاغەزەکەی لەبیربوو، زیاتریش ڕستەکانی کۆتایی بیرچووبووەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

لەوانەیە ئەوەش شتێکی زۆر سەیر نەبێت، چونکە هەتاوەکو زیاتر دەچوونە ناو یاری کاغەزەکەوە، زیاتر و زۆرتر لە کاتی خۆیان دووردەکەوتنەوە. لەوانەشە هەموو ڕستەکان بەلای "هانس"ی نانەوا و "فرۆد"ەوە قسەی قۆڕبووبێت، لەیادکردنی ئەو قسانەش سەختترە وەک لەیادکردنی قسەی پرمانا.

پێیدەچێت ئەو پێشبینیە کۆنە بەلای هەرە زۆرینەی خەڵکانی تریشەوە هەر قسەی قۆڕبێت، چونکە تەنها من دەمزانی کورتەبنە دەست ساردەکە کێیە. تەنها من (وە تەنها من) دەمزانی باسی چ زەرەبینێک دەکەن. ئەوان گوتیان "سەمونەکە نهێنی دوورگەکە ئاشکرادەکات"، پێم وانیە جگە لە من کەسی تر هەبێت کە لە مەبەستی ئەو ڕستەیە تێبگات.

پێم ناخۆشبوو کە "هانس"ی نانەوا هەموو ڕستەکانی لەیادنەبوو. تەنها لەبەرئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم ئاگای لەخۆی نەبوو، بەشێکی گەورەی ئەو پێشبینیە کۆنە بۆ هەتاهەتایە وەک گەنجینەیەکی شاراوە دەمێنێتەوە، ڕێک ئەو بەشەش بوو کە دەربارەی من و باوکم بوو. من دڵنیابووم لەوەی کە یەکێک لە کورتەبنەکان شتێکی دەربارەی دایکم باسکردووە و گوتویەتی چاومان پێدەکەوێت و لەگەڵماندا دەگەڕێتەوە بۆ نەرویج و...

هەروا دانیشتبووم و لاپەڕەکانم هەڵدەدایەوە. لەوناوەدا چەندەها دوکانی ڕۆژنامە فرۆشتنی لێبوو، لەپشت یەکێک لەو دوکانەکانەوە کوڕێکی بچکۆلەم بینی سەرەتاتکێی دەکرد. لەسەرەتادا وامزانی منداڵە و هەروا بۆ خۆشی چاوشارکێم لەگەڵدا دەکات، چونکە بەتەنها دانیشتبووم. بەڵام دواتر بۆمدەرکەوت کە منداڵ نیە و هەمان کورتەبنەکەی بەنزینخانەکە بوو.



بۆ ماوەیەکی کەم خۆی نیشاندام و دواتر لەبەرچاومدا ونبوو. لەترساندا بۆ چەند چرکەیەک لە شوێنی خۆمدا وشکبووبووم، بەڵام دواتر لەدڵی خۆمدا گوتم؛ "باشە من بۆچی هێندە لەو کورتەبنەیە دەترسم؟ بەئاشکرا دیاربوو کە دوام کەوتبوو، بەڵام خۆ مەرج نیە بیەوێت ئازارمبدات".

خۆم بە خۆمم وت لەوانەیە ئەو کورتەبنەیەش پەی بە نهێنی دوورگە خەیاڵیەکە بەرێت. کێ دەزانێت؟ لەوانەشە هەر ئەو کورتەبنەیە بێت کە کاتی خۆی زەرەبینەکەی دامێ و دواتریش ناردمی بۆ "دۆرف"، بۆ ئەوەی کتێبە بچکۆلەکەی پێبخوێنمەوە. بێگومان خوێندنەوە خۆی لە خۆیدا شتێکی خۆش و بێهاوتایە، ئەگەر واشبێت، کەواتە ئاساییە کە دوامکەوتووە و دەیەوێت بزانێت چیم بەسەردێت.

لەپڕێکدا یەکێک لە قسە بێماناکانی باوکمم بیرکەوتەوە؛ کەڕ'تێکیان گوتی کورتەبنەکە مرۆڤێکی دەستکردە و چەند سەدەیەک لەوەوبەر جادووگەرێکی جولەکە دروستیکردووە. بێگومان قسەیەکی قۆڕبوو، بەڵام ئەگەر بەڕاستی وابووبێت، کەواتە "ئەلبێرت" و "هانس"ی نانەوای بینیووە.

فریانەکەوتم لەوەندە زیاتر لەگەڵ ئەندێشەکانمدا بڕۆم، نەشمتوانی لەسەر خوێندنەوەی کتێبەکەم بەردەوامبم، چونکە لەدوورەوە باوکمم بینی بەپەلە بەرەوڕووی گۆڕەپانەکە دەهات. بالای لە هەموو خەڵکانی تری ئەو ناوە بەرزتربوو. لەوێدا ئیدی دەبوایە بەپەلە کتێبە بچکۆلەکە بخەمەوە گیرفانم.

بەدەم هەناسەبڕکێوە گوتی؛

«زۆرم پێچوو؟»

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



لەلای خۆمەوە بڕیارمدا کە باسی کورتەبنەکەی بۆ نەگێڕمەوە کە کەمێک لەوەوبەر دیسانەوە هاتەوە بەرچاوم. ڕاستە گەر کورتەبنەیەک هەروەک ئێمە بە ئەورووپادا سەفەربکات، خۆی لەخۆیدا شتێکی سەیرە، بەڵام بەبەراوردکردنی لەگەڵ ئەو هەموو باسە سەیروسەمەرانەی ناو کتێبە بچکۆلەکەدا هەر هیچ نەبوو.

باوکم دیسانەوە پرسیارێکی تری لێکردمەوە و گوتی؛

«ئەی تۆ چیت کرد؟»

کاغەزەکانم نیشاندا و گوتم بۆ خۆم یاری کاغەزم دەکرد.

ڕێک لەو کاتەدا بۆیەکە هات و دەبوایە پارەی دواهەمین کۆلام بدایەتێ. ڕوویتێکردم و بەئینگلیزی گوتی؛

«زۆر بچکۆلەیە بەڕێز!»

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و وامنیشاندا کە لە مەبەستی تێناگەم.

هەڵبەتە دەمزانی کە مەبەستی لە کتێبە بچکۆلەکەیە و لەوە دەترسام نهێنیەکەم ئاشکرابێت. بەپەلە زەڕەبینەکەم دەرهێنا، لەبەردەمی بۆیەکەدا بەرزمکردەوە و بە ئینگلیزی گوتم؛

«زۆر نایابە»

ئەویش گوتی؛

«بەڵێ، بەڵێ!»

بەو شێوەیەش خۆم ڕزگارکرد.

لەو کاتەدا کە قاوەخانەکەمان بەجێهێشت، ڕوومکردە باوکم و گوتم؛

«کە تۆ ڕۆیشتیت، بۆ خۆم دانیشتبووم و لە کاغەزەکانی دەستەی یاریەکە وردبوومەوە. دەمویست بزانم جگە لەو شتانەی کە بەچاو دەبینرێن، هیچ شتێکی تریان تێدا نیە»

باوکم گوتی؛



تایبەته به پێگەی پەرتووک

«ئەی چیت بۆ دەرکەوت؟»

تەماشایەکم کرد و بەشێوەیەکی پڕنهێنی گوتم؛

«نامەوێت پێتی بڵێم»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

**...سەرتاپای بوونی ئەو بەو خاڵەوە بەسترابووەوە کە جۆکەر بێت...**

کە گەیشتینەوە ژوری ئوتێلەکەمان، ئینجا دەربارەی دایکم پرسیارم لە باوکم کرد و ویستم بزانم لەو بارەیەوە هیچ شتێکی بۆ روونبۆتەوە یان نا. باوکیشم لە سەرەتادا گوتی؛

«دەلاڵێکی مۆدێلم دۆزیەوە و چوومە لای، بەڵام زۆر بەدڵنیاییەوە گوتی هیچ ئافرەتێکی مۆدێل لە ئەسینادا نیە کە ناوی "ئەنیتا" بێت. هیچ گومانێکی لەوە نەبوو، ئەو دەیگوت من هەموو ئافرەتە مۆدێلەکانی ئەسینا دەناسم، بەتایبەتیش بیانیەکان»

لەوێدا هەروەک خۆری ئێوارەیەکی مانگی نۆ ئاوابووم، وابزانم ئەو ئێوارەیە بارانیش دەباری، چونکە لەپڕێکدا هەستمکرد فرمێسکەکانم لەپێڵوی چاومەوە ڕێچکە دەبەستن. پێم وابێت هەر لەبەرئەوە بوو کە باوکم خێرا گوتی؛

«پاشان وێنەی گۆڤاری مۆدێلەکەم نیشاندا و یەکسەر دەموچاوی پیاوە یۆنانیەکە کرایەوە. گوتی ئەو ئافرەتە ناوی خۆی ناوە "خۆری قەراغ دەریا" و لەو بڕوایەشدابوو کە ئەوە ناوێکی "مۆدێل"ی بێت و خۆی بۆ خۆی هەڵبیژاردبێت. دواتریش گوتی ئەو ژنە یەکێکە لەو مۆدێلانەی ئەسینا کە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابووردودا داخوازیەکی زۆر لەسەربووە»

ڕێک تەماشای ناوچاوی باوکم کرد و گوتم؛

«ئێ... چیتر؟»

دەستێکی بۆ بادام و گوتی؛

«بەیانی دوای نانخواردنی نیوەڕۆ تەلەفونێکیان بۆ دەکەم»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک



«تەواو... هەرئەوەندە بوو؟»

«تەواو! با چاوەڕوان بین و بزانین چی ڕوودەدات هانس تۆماس. ئێوارە دەچینە سەر سەربانی ئوتێلەکە و بۆ بەیانیش سەردانێکی شاری "پیرالیفس" دەکەین. هەر لەوێشەوە دەتوانم تەلەفونێکیان بۆ بکەم»

هەر کە گوتی "دەچینە سەر سەربانەکە"، یەکسەر خەیاڵم چووە سەر شتێکی تایبەتی. کەمێک غیرەتم دایە بەرخۆم و دواتر گوتم؛

«بەڵام شتێکی تریش لە خەیاڵمدایە و دەمەوێت باسی بکەین»

زۆر بەسەرسامیەوە تەماشای کردم، بەڵام وابزانم یەکسەر لە مەبەستەکەم تێگەیشت.

«لەوەوپێش باسی شتێکمان کرد و لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین کە بیری لێبکەینەوە. وە گوتیشمان دەبێت بەپەلە بیری لێبکەینەوە»

ویستی خەندەیەکی سروشتیانە بخاتە سەر لێوەکانی، بەڵام بەتەواوەتی نەیتوانی. ئەوجا گوتی؛

«ئا...! هانس تۆماس، من پێم گوتیت بیرێکی لێدەکەمەوە. بەڵام ئەمڕۆ سەرم زۆر قاڵبوو و دەبوایە بیرم لە چەندەها شتی تر بکردایەتەوە»

لەوێدا بیرۆکەیەکم بۆ هات... خۆم گەیاندە لای جانتاکەی و نیو بتڵ ئارەقم لەنێو فانیلە و گۆرەویەکانیدا دۆزیەوە. یەک و دوو بە بتڵەکەی دەستمەوە خۆم گەیاندە تەوالێتەکە. هەموو خواردنەوە قۆرەکەیم ڕۆکردە ناو تەوالێتەکەوە.

باوکم خۆی گەیاندە لام و بینی کە چیم کردووە، بۆ ماوەیەک هەر وەستابوو و تەماشای ناو تەوالێتەکەی دەکرد. وابزانم لەدڵی خۆیدا دەیگوت "بەرلەوەی ئاوی پێدابکات، با سەربخەمە ناو تەوالێتەکەوە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



هەموو بخۆمەوە". بەڵام خۆشبەختانە هێندە زۆر ئالوودە نەبوو.
ئاورێکی لێدامەوە و دیاربوو هێشتام بەتەواوەتی نەیدەزانی چییبکات... نەیدەزانی وەک شێرێک تووڕەببێت یان وەک توتەڵە سەگێک بقڕوسکێنێ. پاشان گوتی؛

«باشە، هانس تۆماس. تۆ بردتەوە!»

دیسانەوە ڕۆیشتینەوە ژوورەکە و لەبەردەم پەنجەرەکەدا لەسەر دوو کورسی دانیشتین. من تەماشای باوکم دەکرد و ئەویش سەیری "ئەکرۆپۆلیس"ی دەکرد. لەوێدا گوتم؛

«خواردنەوەی پرشنگدار هەستەکانی جۆکەر دەوەستێنێت»

باوکم بەسەرسامییەکەوە ئاورێکی لێدامەوە؛

«ئەم قسە قۆڕانە چییە دەیکەیت، هانس تۆماس؟ چییە، هێشتام "مارتینی"ەکەی دوێنێت تێدا ماوەتەوە؟»

«نەخێر! مەبەستم لەوەیە کە جۆکەری ڕاستەقینە مەشروبی قورس ناخواتەوە. لەبەرئەوەی جۆکەر بەبێ ئەو خواردنەوەیە باشتر و ڕوونتر بیردەکاتەوە»

ئینجا گوتی؛

«تۆش کەمێک تەختەکانی سەرت شلە، بەڵام وابزانم ئەوەت بەمیراتی بۆ ماوەتەوە»

زانیم کە لە خاڵێ هەرە لاوازی باوکمم داوە، چونکە سەرتاپای بوونی ئەو بەو خاڵەوە بەسترابووەوە کە جۆکەر بێت.

ویستم بەدڵنیاییەوە بزانم هێشتام هەر بیر لە خواردنەوەی ناو تەوالێتەکە دەکاتەوە یان نا، لەبەرئەوە گوتم؛

«دە ئینجا با بڕۆینە سەرەوە. با بڕۆین و تامی هەموو جۆرە ساردییەکانیان بکەین. کۆلایەک یان سێفن ئاپێک بخۆرەوە، پەرداخێک





شەربەتی پرتەقاڵ یان سێو داوابکە، یان حەزت لە شەربەتی هەرمێیە؟ یان پێتخۆشە تامی هەر هەموویان بەیەکەوە بکەیت؟ دەتوانیت بەئارەزووی خۆت پەرداخێک پڕبکەیت و پارچە سەهۆڵی خۆش و فێنکی تێبکەیت، پاشان بە کەوچکێکی درێژ بیشێوێنیت و...»

قسەکانی پێبڕیم و گوتی؛

«سوپاس، هێندەم بەسە»

دیسانەوە لێم پرسیەوە؛

«بەڵام ئیتر بەتەواوەتی ڕێک کەوتووین، وانییە؟»

«بەڵێ گەورەم. دەریاوانێکی بەتەمەن هەرگیز پەیمانەکەی ناشکێنێت»

«پێم خۆشە! منیش لەبەرامبەردا حەکایەتێکی سەیروسەمەرەت بۆ دەگێڕمەوە»

هەر خێرا خۆمان گەیاندە سەر سەربانەکە و وەک ڕۆژی پێشوو لە هەمان شوێندا دانیشتینەوە. پاش کەمێک هەمان بۆیەکەی دوێنێش بەرەوڕوومان هاتەوە.

بە ئینگلیزی داوام لێکرد ناوی هەموو ساردی و شەربەتەکانیانم پێ بڵێت. دواتر داوای دوو پەرداخ و چوار جۆری جیاوازی ساردی و شەربەتمان کرد. کوڕ'ەکە سەرێکی ڕاوەشاند و گوێم لێبوو لەبەر خۆیەوە دەیگوت "هەر ڕۆژەی شتێک دەخۆنەوە، دوێنێ کوڕ و باوک پێکەوە شەرابیان دەخواردەوە و ئەمڕۆ دەیانەوێت خۆیان بەساردی مەست بکەن". لەدواجاردا باوکم گوتی "کەواتە بۆمان دەرکەوت کە جۆرە هەقانیەتێک لەناو هەموو شتێکی ئەم جیهانەدا هەیە".

ئەو کاتەی کە بۆیەکە ڕۆیشت، باوکم گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«شتێک بەلامەوە زۆر سەیرە هانس تۆماس. من و تۆ ئێستاکە لە شارێکداین کە چەند ملیۆن کەسێکی تێدا دەژی. هەر لە شارە مێروولە دەچێت، ئێمەش لەو شارە گەورەیەدا بەدوای مێروولەیەکی دیاریکراودا دەگەڕێن»

منیش یەکسەر گوتم؛

«بەڵام ئەو دانەیە شاژنەکەیانە»

وابزانم زۆر بەپەلە قسەکەم کرد. لەوەدەچوو باوکیشم لە هەمان برواداببێت، بۆیە خێرا بەدەممەوە پێکەنی و گوتی؛

«بەڵام ئەو شارە مێروولەیە زۆر بە باشی ڕێکخراوە و لەڕاستیدا دەتوانین مێروولەی ژمارە 3.238.905 بدۆزینەوە»

کەمێک فەلسەفەی بۆ هەڵڕشتم و دواتر گوتی؛

«لەبنەڕەتدا شاری ئەسینا لقێکی بچکۆلەی شارە مێروولەیەکی یەکجار گەورەترە و ژمارەی مێروولەکانی ئەو شارە مەزنەش لە پێنج ملیارد تێدەپەڕێت. تا ڕادەیەکیش دەکرێت مێروولەیەکی دیاریکراو لەنێو ئەو پێنج ملیاردەدا بدۆزینەوە. تەنها پێویستت بە تەلەفونێک و چەند ژمارەیەک دەبێت و هیچی تر. چونکە چەند ملیارد تەلەفونێکمان لەسەر گۆی ئەم زەویەیە هەیە هانس تۆماس. لەسەر لوتکەی شاخەکانی "ئەلپ" و خواری خوارەوەی دارستانەکانی ئەفریقادا هەن. لە "ئەلاسکا" و "تەبیت"یشدا تەلەفون هەیە، هەر لە ژورەکەی خۆتەوە و لە ڕێگای تەلەفونەکەتەوە دەتوانیت پەیوەندی بە هەموویانەوە بگریت»

لەپڕێکدا شتێکم بەخیاڵدا هات و لەسەر کورسیەکەم بەرزبوومەوە. بەهێواشی گوتم؛



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات و بەو شێوەیەش دەنگی لەدووری سەدان میلەوە دەبیسترێت»

لەناکاودا لەو ڕستەیەی یاری جۆکەرەکە تێگەیشتم.

باوکم بە بێزاریەکەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی؛

«ئینجا چیتە؟»

دەستوبرد نەمزانی بە چ شێوەیەک وەڵامی بدەمەوە، بەڵام خۆ دەبوایە شتێکم هەر بگوتایە؛

«کە باسی "ئەلپ"ەکانت کرد، یەکسەر خەیاڵم چووە سەر ئەو نانەوایەی کە لەلادێ بچکۆلەکەدا سەمونەکە و ساردیەکەی دامێ. بیرم دێت لەدوکانەکەیدا تەلەفونێکیشی هەبوو. هەر لەو تەلەفونەشەوە دەتوانێت پەیوەندی بە هەموو جیهانەوە بگرێت. بۆ نمونە دەتوانێت تەلەفون بۆ پرسگە بکات و سۆراغی ژمارەی تەلەفونی کەسێکی دیاریکراوی سەر ئەم زەویە بکات»

وابزانم بەتەواوەتی وەڵامەکەمی بەدڵنەبوو، چونکە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر تەماشای "ئەکرۆپۆلیس"ی دەکرد. دواتر گوتی؛

«کەواتە لەبەر ئەوە نەبوو کە حەزت لە فەلسەفە نیە؟»

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند. لەڕاستیدا باسەکانی ناو کتێبە بچکۆلەکە لەناوەوەمدا کەڵەکە بووبوو و خەریک بوو دەتەقیەوە. چیتر نەمدەتوانی بەئاسانی دەستیان بەسەردا بگرم و تەنها لەلای خۆم بیانهێڵمەوە.

لەو کاتەدا کە دونیا تاریک بوو و پرۆجکتۆرە گەورەکانی "ئەکرۆپۆلیس"یان داگیرساند، گوتم؛

«پەیمانم دایتی کە حەکایەتێکت بۆ بگێڕمەوە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



باوکیشم گوتی؛
«دە فەرموو بیڵێ»
ئینجا دەستم پێکرد. زۆرینەی ئەو شتانەم باسکرد کە لە کتێبە بچکۆلەکەدا خوێندبوومەوە. دەربارەی "ئەلبێرت" و "هانس"ی نانەوا و "فرۆد" و کاغەزی یاریەکانی دوورگە خەیاڵیەکەشم خنیە ناو چیرۆکەکەمەوە. لەهەمان کاتیشدا هەستم نەدەکرد ئەو پەیمانەم شکاندبێت کە کاتی خۆی بە نانەواکەی "دۆرف"م دا، چونکە هەموو باسەکەم بەشێوەیەک دەگێڕایەوە وەک ئەوەی خۆم لەو کاتەدا دامهێنابێت. ڕاستە جارجارێک ناچاربووم هەندێکی بخەمە سەر، بەڵام هەمیشە ئاگاداری ئەوەبووم کە باسی کتێبە بچکۆلەکە نەکەم.
دیاربوو باوکم چیرۆکەکەمی بەدڵبوو، هەر بۆیە گوتی؛
«چ فەنتاسیایەکی باشت هەیە، هانس تۆماس. پێم وابێت واباشترە تۆ نەبیت بە فەیلەسوف، بەڵکو هەوڵبدەیت ببیت بە نووسەر»
دیسانەوە کەرەتێکی تریش ئافەرینێکم وەرگرت کە لە بنەڕەتدا شایانی نەبووم.
ئەو شەوە کە چووینە جێگاوە، من لەپێش باوکمدا خەوم لێکەوت. بەرلەوەی خەوم لێبکەوێت، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەجێگاکەمدا تەپاوتلم کرد، بەڵام باوکم لەدوای من خەوی لێکەوت. بیرم دێت لە جێگاکەیدا هەستا و چووە لای پەنجەرەکەوە... ئیدی لەوە زیاترم لەیاد نیە.
بۆ بەیانیەکەی خەبەرم بووەوە و باوکم هێشتام هەر خەوتبوو. لەبەرچاومدا هەر لە ورچێک دەچوو کە تازە خەریکبوو بچێتە سوڕی سڕبوونی زستانەیەوە.





زەرەبینەکە و کتێبە پچکۆلەکەم دەرهێنایەوە و کەوتمەوە خوێندنەوە. دەمویست بزانم لەدوای یاریە گەورەکەی جۆکەر، چ شتێک لەسەر ئەو دوورگە خەیاڵیە ڕوودەدات.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



کچی دینار

...لەوێدا ئیدی ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە دایە پرمەی گریان...

هەر پاش ئەوەی جۆکەر کێشای بەسەر سنگی خۆیدا و ڕێزی لە خۆی گرت، یەکسەر کورتەبنەکان بازنە گەورەکەیان هەڵوەشاندەوە. ئینجا کەرنەفاڵەکە سەرلەنوێ دەستیپێکردەوە. هەندێک لە کورتەبنەکان کەوتنە خواردنی میوەی ناو قاپە گەورەکان، هەندێکی تریشیان خواردنەوە بریقەدارەکەیان دەخواردەوە. پاش کەمێکیش کەوتنە ناوهێنانی تامی ئەو شتانەی کە لەپاش خواردنەوە سەیرەکەوە هەستیان پێدەکرد؛

«هەنگوین!»

«گوڵە غەزێم!»

«تووی چاکبوونەوە!»

«گرامین!»

«ڕەگی خرا!»...

فرۆد هەر دانیشتبوو و تەماشای دەکردم. ڕاستە پیاوێکی پیربوو و قژی سپی بووبوو، دەموچاوی چرچ ولۆچی قوڵی تێکەوتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام چاوەکانی هەروەک دوو گەوهەر دەدرەوشاندەوە. لەدڵی خۆمدا گوتم "ڕاستە دەڵێن چاو ئاوێنەی ڕۆحە".

جۆکەر چەپڵەیەکی تری لێدایەوە، پرسیارێکی لە هەمووان کرد و گوتی؛

«مانای قوڵی یاری جۆکەرەکە دەبینن؟»

کەس وەڵامی نەدایەوە و ئەویش بەبێزاریەکەوە هەردوو دەستی بادا و گوتی؛



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«خۆ ئێستا ئەوەندەتان بۆ ڕوونبۆتەوە کە "فرۆد" ئەو دەریاوانەیە کە یاری کاغەزەکەی پێبووە و ئێمەش کاغەزەکانی ئەو دەستەیەین؟ یان دیسانەوە کوژاونەتەوە و هیچتان پێ نەماوە؟»

بەئاسانی دیاربوو کە کورتەبنەکانی هۆڵەکە لە مەبەستی قسەکانی ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە تێنەدەگەیشتن. لەڕاستیشدا وادەهاتنە بەرچاوم کە گرنگی بە قسەکانی نادەن و نایانەوێت لێی تێبگەن.

لەپڕێکدا کچی دینار هاوارێکی لێبەرزبووەوە و گوتی؛

«ئێی... چ گێرەشێوێنێکی سەیرە»

یەکێکی تریشان بە بۆڵەبۆڵ گوتی؛

«وایە، کەس نیە بتوانێت لەگەڵیدا هەڵبکات»

جۆکەرە بچکۆلەکە بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگ بوو و زۆر دڵتەنگ دەهاتە بەرچاوم، دواتر گوتی؛

«کەستان هەیە کە بتوانێت لە شتێک تێبگات؟»

زۆر پەشۆکاوبوو و هەرچەندە دەیویست بەئارامی لەسەر کورسیەکەی بمێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زرنگەی زەنگۆڵەکانی دەنگیان دەدایەوە.

هەمووان بەیەکەوە گوتیان؛

«نەء!»

«باشە لەوە تێناگەن کە فرۆد هەمووماني هەڵخڵەتاندووە و منیش کەسە زۆرزانەکەم؟»

لەوێدا زۆرینەیان دەستیان بە گوێیانەوە گرت. هەندێکیان دەستیان خستە سەر چاویشیان. هەندێکی تریان یەک لەسەر یەک خواردنەوە ئەرخەوانیەکەیان دەخواردەوە. وا دەهاتە بەرچاوم کە بەو پەڕی توانایانەوە هەوڵبدەن کە لە قسەکانی جۆکەر تێبگەن.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

پاشای قەرە چووە لای یەکێک لە مێزەکانەوە و دەستی دایە بتڵێک کە پڕبوو لە خواردنەوە بریقەدارەکە. بەرەورووی جۆکەر ڕۆیشت، لەبەردەمیدا بەرزیکردەوە و گوتی؛

«ئێمە بۆ ئەوە هاتووینەتە ئێرە کە مەتەڵ هەڵبهێنین یان بۆ ئەوە هاتووین کە مەشروبە ئەرخەوانیەکە بخۆینەوە؟»

فرۆد دەستێکی خستە سەر قۆڵم، چرپاندی بە گوێمدا و گوتی؛

«کەس نیە بەتەواوەتی بزانێت لەپاش ئەم یاری کاغەزە چ شتێک لەو شتانەی کە من لەسەر ئەم دوورگەیدا خوڵقاندوومن دەمێنێتەوە»

منیش پێم گوت؛

«حەز دەکەیت بیوەستێنم؟»

سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم و گوتی؛

«نا، نا... با یاری کاغەزەکە بەپێی یاساکانی خۆی بەڕێوە بچێت»

لەو کاتەدا پاشای قەرە خۆی هەڵدایە بەردەمی جۆکەر و لەسەر کورسیەکەی ڕایکێشایە خوارەوە. هەر چوار کوڕەکەش خێرا بەدەمیەوە هاتن. سێ دانەیان خۆیان بەسەر ئەو زۆرزانەدادا و کوڕی سینەکیش دەیویست بەزۆر دەمی بتڵەکە بنێت بەدەمی جۆکەرەوە.

جۆکەر تا لەتوانایدابوو بەرەنگاری کردن، لە هەمان کاتیشدا ئەو هێندەی تفکردەوە کە بەزۆر خستیانە ناو دەمیەوە. هەر هەمووی بە هۆڵەکەدا پرژاند. لەو کاتەدا کە دەمی پاکدەکردەوە گوتی؛

«جۆکەر ئەو خواردنەوە بریقەدارە تفدەکاتەوە. چونکە ئەو بەبێ ئەو ئاوگە پڕلەدرۆیە ڕوونتر بیردەکاتەوە»

لەدوای ئەوە هەستایەوە سەرپێ، بتڵەکەی لەدەستی کوڕی سینەک سەند و فڕێی دایە سەر زەویەکە. پاشان بەسەر هەر چوار مێزەکەدا خولایەوە و هەموو بتڵ و شوشەکانی وردوخاشکرد و هاڕەی شوشە



بەرزبووەوە، بەو شێوەیەش وردە شوشە لە هەموو شوێنێکی هۆڵە گەورەکەدا پەرش و بڵاوبووەوە. پارچە شوشەکان وەک باران بەسەر کورتەبنەکاندا دەباری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان بریندار نەبوون. بەڵام پارچەیەکی پچکۆلە بەر دەستی فرۆد کەوت و کەمێک برینداریکرد، دڵۆپێک خوێنیشم بینی کە لە شوێنی برینداریەکەیەوە هاتە دەرەوە.

خواردنەوە بریقەدارەکە هەروەک دەریاچەیەکی گەورە بەسەر زەویەکەوە مایەوە. هەندێک لە "دوو"ەکان و "سێ"کان لەنێو پارچە شوشەکاندا پاڵکەوتن و خواردنەوە ئەرخەوانیەکەیان هەڵدەلوشی. هەندێکیان پارچە شوشەش کەوتە دەمیانەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی دەمیان بریندابێت، تفیان دەکردەوە. هەندێک کورتەبنەی تریش بەماتیەکەوە وەستابوون و واقیان وڕمابوو.

پاشای قەرە یەکەمین کەسبوو کە کەوتە قسەکردن و گوتی؛

«کوڕەکان! فەرمانتان پێدەدەم کە یەکسەر کەللەی سەری ئەو زۆرزانە بپەڕێنن»

هەر ئەوەندەی گوت و هەر چوار کوڕەکە شمشێرەکانیان لە کیفەکەیاندا دەرهێنا، ئینجا بەرەو لای جۆکەر کەوتنە ڕێ.

نەمتوانی هەر وا بەئاسانی دابنیشم و تەماشای ئەو دیمەنە بکەم، بەڵام ڕێک لەو کاتەدا کە خەریکبوو هەستم، یەکێک بەتوندی گرتمی و گەڕاندمیەوە دواوە.

جۆکەر نیگایەکی پڕ لەماتەمینی و بێزاری لەسەر دەموچاوبوو و لەبەر خۆیەوە دەیگوت؛

«من جۆکەرم... کەسی تر... هیچ کەسێکی تر...»

لەوێدا ئیدی ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە دایە پرمەی گریان.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



کوڕەکان گەڕانەوە دواوە. هەمووان حەپەسابوون، تەنانەت ئەو کورتەبنانەش کە چاو و گوێچکەیان گرتبوو واقیانوڕمابوو. لەوەدەچوو لەماوەی ئەو هەموو سڵانەدا چەندەها شتی سەیروسەمەرەیان لەو کەسە زۆرزان و خۆشمەزەیە بینیبێت، بەڵام وابزانم ئەوە یەکەمین جاربوو کە بیبینن بگری.

تەماشایەکی فرۆدم کرد و بینیم چاوەکانی تەڕبووبوون، یەکسەر زانیم کە ئەو گێرەشێوێنە بچکۆلەیە، لەگەڵ هەموو ئەو شتە قۆڕانەشیدا، خۆشەویستترین کەسە لەلای. بەهێواشی باوەشێکی پێداکرد و بەدەنگێکی پڕ لە نەوازشەوە گوتی؛

«شش، بەسە، بەس»

جۆکەر خۆی ڕاپسکاند و لەژێر دەستیدا هاتە دەرەوە. دوای کەمێک پاشای کوپ لەبەردەمی جۆکەردا قوتبووە و گوتی؛

«دەمەوێت ئەوەتان بیربخەمەوە کە بۆتان نیە سەری کەسێک لێبکەنەوە کە بگری»

کوڕی قەرە بەدوایدا هاواری لێبەرزبووەوە و گوتی؛

«ناتیەش!»

ئینجا پاشای کوپ لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛

«جگە لەوەش یاسایەکی زۆر کۆنمان هەیە و بەپێی ئەو یاسایە هەتا کەسەکە هەموو قسەکانی تەواو نەکات، نابێت سەری لێبکرێتەوە. لێرەشدا هێشتام هەموو شتێکمان بۆ ڕوون نەبۆتەوە و هێشتام هەموو کاغەزەکان نەخراونەتە سەر مێزەکە. لەبەرئەوە فەرمان دەدەم بەرلەوەی سەری جۆکەر لێبکرێتەوە، بخرێتە سەر مێزەکە»

جۆکەر بەدەم هەنسکەوە گوتی؛





«سوپاست دەکەم پاشای هێژا. لەناو هەموو کاغەزەکاندا تەنها تۆ سیانزە دڵی "گەورە"ت پێوەیە»

چوار کوڕەکە جۆکەریان بەرزکردەوە و لەسەر یەکێک لە مێزەکان دایاننا. لەسەر گازی پشت لێی پاڵکەوت و هەردوو دەستی خستە ژێر سەری. قاچی لەسەر قاچ دانا و وتەیەکی دورودرێژی گوت، هەموو کورتەبنەکانی تریش لەچواردەوری خڕبووبوونەوە؛

«من دواهەمین کەس بووم کە هاتمە ناو لادێکەوە... هەمووشتان دەزانن کە من لە هەمووتان جیاوازتربووم، هەر لەبەرئەوەش بوو کە زیاتر بەتەنها بۆ خۆم دەژیام»

نازانم بۆ بەڵام لەپڕێکدا هەموو کورتەبنەکان گوێیان بۆ قسەکانی جۆکەر شلکرد. لەوەدەچوو حەزبکەن بزانن بۆچی ئەو لە هەموویان جیاوازتربوو.

ئینجا جۆکەر بەردەوامی بە قسەکانی دا و گوتی؛

«من سەر بە هیچ شوێنێک نیم. من نە "کوپ"م و نە "دینار"، نە "سینەک"م و نە "قەرە". نە پاشام و نە کوڕ، نە هەشتم و نە بللی. من لێرەدام و تەنها جۆکەرم و هیچی تر... بەڵام ئەی جۆکەر چیە؟ من ناچاربووم خۆم وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزمەوە. هەموو کەڕەتێک کە سەرم دەجوڵاندەوە، زرنگەی زەنگۆڵەکانی سەرم ئەو ڕاستیەیان بیردەخستمەوە کە من بێ خێزانم. من هیچ ژمارەیەکم نیە، هیچ ئیشێکیشم نیە. من نە بەشداری هونەری شوشە دروستکردنی "دینار"ەکان دەکەم و نە لەگەڵ "کوپ"ەکانیشدا خەریکی هونەری دروستکردنی نانم. من هەروەک سینەکەکان خاوەنی دوو دەستی نەرمونیان نیم، نە وەک قەرەکانیش بەهێزم. بەو شێوەیەش بەردەوام دەخولامەوە و لەدەرەوەڕا تەماشای چالاکیەکانتانم دەکرد. بەڵام هەر



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

لەبەر ئەو هۆیەش من دەمتوانی چەندەها شت ببینم کە ئێوە لە ئاستیاندا کوێربوون»

جۆکەر هەر لەسەر مێزەکە پاڵکەوتبوو و لە کاتی قسەکردنیدا قاچی بادەدا. زەنگۆڵەکانیشی بە هێواشی دەزرنگانەوە.

«ئێوە هەموو بەیانیەک دەچوون بەلای کاری ڕۆژانەتانەوە. بەڵام قەت بەتەواوەتی بەخەبەرنەبوون. ڕاستە مانگ و خۆرتان دەبینی، چاوتان لە ئەستێرەکانی ئاسمان و هەموو ڕووداوەکانی چواردەورتان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکتان بەڕاستی نەدەبینی... جۆکەر کەسێکی جیاوازە، چونکە لەگەڵ هاتنە ناو ئەم جیهانەوە پەرۆشیەکی سەیری هەبووە و دەتوانێت بە قوڵی بڕوانێت و چەندەها شتیش ببینێت.

لەوێدا کچی دینار قسەکانی پێبڕی و گوتی؛

«کەواتە تۆ پێمان بڵێ هەی زۆرزان! تۆ چیت بینیوە کە ئێمە نەمان بینیبێت؟ گەر شتێکی وا لەئارادایە، فەرموو یەکسەر بیخەرە ڕوو»

جۆکەر لەوەڵامدا گوتی؛

«من خۆم بینیوە. من خۆمم بینیوە کە بە چ شێوەیەک بەنێو دەوەنەکان و درەختەکانی ناو باخە گەورەکەدا دەڕۆم»

لەوێدا دووی کوپ گوتی؛

«لە ئاسمانەوە خۆت دەبینی؟ یان چاوەکانت باڵیان هەیە و دەتوانن وەک باڵندە بفڕن؟»

«بەڵێ، بەشێوەیەک لە شێوەکان وایە. لەبەرئەوەی هێندە بەس نیە کە لە گیرفانەکەتدا ئاوێنەیەکی بچکۆلە دەربهێنیت و تەماشای خۆت بکەیت، هەروەک چۆن کچەکانی لادێکەمان بەردەوام دەیکەن. ئەوان



هەر زۆر سەرقاڵی شێوەی ڕوخساریانن و هەست بەوە ناکەن کە دەژین»

کچی دینار بەدەنگێکی بەرز گوتی؛

«ئەمە یەکەمین جارە لە ژیانمدا شتێکی هێندە بێشەرمانە ببیستم. هەتا کەی ڕێگا بەم زۆرزانە بدەین کە قسەبکات؟»

جۆکەر گوتی؛

«بەڵام هەر ئەوەندە نیە کە شتێک بێت و من بیبینم، بەڵکو شتێکە کە لە ناوەوەمدا هەستی پێدەکەم. هەستدەکەم من دەژیم و پڕ لە... بوونەوەرێکم و پڕ لەژیانم... شتێکی سەیروسەمەرەم و هێدی هێدی گەورەدەبم... پێست و قژ و نینۆک و هەموو شتەکانی ترم هەیە... هەستدەکەم بووکەشوشەیەکی مرۆیی پڕلەژیانم... وەک لاستیک وام و دەتوانیت دەستم لێبدەیت... جۆکەر پرسیارێک دەوروژێنێت و دەڵێت؛ ئەم پیاوە لاستیکیە لە کوێوە هاتووە؟»

لەوێدا پاشای قەرە گوتی؛

«ڕێگەی پێبدەین بەردەوام بێت؟»

پاشای کوپ سەرێکی بۆ لەقاند و گوتی با قسەکانی بکات.

جۆکەر لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و گوتی؛

«ئێمە دەژین!»

هاوکات هەردوو دەستی ڕاوەشاند و زەنگۆڵەکانی زرنگانەوە؛

«ئێمە لەژێر ئاسمانێکی کراوەدا لەناو حەکایەتێکی ئەفسوناویدا دەژین. جۆکەر دەڵێت ئەمە مایەی سەرسامبوونە. ئەو بۆ ئەوەی لەو ڕاستیە دڵنیابێت، بەردەوام نوقورچ لە قۆڵی خۆی دەگرێت»

سێی کوپ هەڵیدایە و گوتی؛

«دێشێت؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«هەموو کەرەتێک کە دەجوڵێمەوە زەنگۆڵەکانم دەزرنگێنەوە، وە هەموو کەرەتێکیش کە گوێم لەو دەنگە دەبێت هەستدەکەم کە دەژیم»
هەر پاش قسەکانی یەکسەر دەستێکی بەرزکردەوە و زۆر بەهێزەوە ڕایوەشاند، هەندێک لە کورتەبنەکان لە ترساندا گەڕانەوە دواوە.
پاشای کوپ قورگی بۆ پاککردەوە و گوتی؛
«ئەی ئێستاکە دەزانیت ئەو پیاوە لاستیکیە لە کوێوە هاتووە؟»
جۆکەریش لە وەڵامدا گوتی؛
«هەموو کەسێک خۆی لەلای خۆیەوە ئەو مەتەڵەی هەڵهێناوە. بەڵام هەر کەسەو پەی بەبەشێکی کەمی بردووە. چونکە هەر کەسێک چەند پارچەیەکی کەمی وێنەکەی بەدەستەوەیە و ئەمسەرو ئەوسەر پێدەکات، هەر لەبەرئەوەش بۆ ئەوەی هەر کەسەو لەلای خۆیەوە ئاسانترین بیرۆکەگەلاڵەبکات دەبێت هەموو پارچەکان کۆبکاتەوە. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هێندێکی زۆرتان لەو خواردنەوە ئەرخەوانیە خواردۆتەوە. جۆکەر خۆی بە پیاوێکی بووکەشوشەیی ئەفسوناوی دادەنێت و دەڵێت ئێوەش هەروەک ئەو ئەفسووناوین. بەڵام تەنها ئەوەندەیە کە ئێوە خۆتان ئەوە نابینن. لە هەمان کاتدا هەستیشی پێناکەن، چونکە لەو کاتەدا کە خواردنەوە ئەرخەوانیەکە دەخۆنەوە، تەنها تامی هەنگوین و گوڵە غەزێم و تووی چاکبوونەوە و ڕەگی خڕ و گرامین دەکەن. بەو شێوەیەش بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە هەن، لەگەڵ ژیاندا دەڕۆن. ئەو کەسەی کە هەموو جیهان لە دەمیدا بێت، لەدواجاردا لەبیری دەچێتەوە کە دەمی هەیە. وە ئەو کەسەش کە هەموو تامەکانی جیهان لە دەست و قاچیدا بێت، ئەو ڕاستیە لەیاد دەکات کە خۆی کەسێکی بووکە شوشەییە. جۆکەر بەردەوام دەیویست هەقیقەتتان پێبڵێت، بەڵام هیچ کەسێکتان



نەیدەویست گوێی بۆ شلبکات. ڕاستە دوو گوێچکە بەدموچاوتانەوە بوو، بەڵام سێو و هەرمێ و شلیک و مۆز کونی گوێچکەتانی گرتبوو. هەریەکەو دوو چاویشتان هەبوو بەڵام سوودی چیە گەر هەمیشە چاوتان لەوەوە بێت کە زیاتر و زۆرتر بخۆنەوە؟ جۆکەر دەڵێت شتەکان ئاوهان، چونکە تەنها جۆکەر هەقیقەت دەزانێت»
کورتەبنەکان لە هۆڵەکەدا هەر تەماشای یەکتریان دەکرد.
دیسانەوە پاشای کوپ پرسیاری لێکردەوە و گوتی؛
«پیاوە لاستیکیەکە لە کوێوە هاتووە؟»
جۆکەر دەستەکانی بادا و گوتی؛
«ئێمە فەنتاسیای "فرۆد"ین. ڕۆژێک لە ڕۆژان فەنتاسیاکانی هێندە پڕژیانبوون، کە لە سەریەوە هاتنە دەرەوە. جۆکەر دەڵێت ئەوە مەحاڵە! هەروەها دەڵێت هەروەک مانگ و خۆر مەحاڵە، بەڵام مانگ و خۆر ڕاستین»
کورتەبنەکانی هۆڵەکە بەسەرسامیەوە تەماشای "فرۆد"یان دەکرد و ئەو پیاوە پیرەش توند توند مەچەکی گرتبووم.
دیسانەوە جۆکەر کەوتەوە قسەکردن؛
«بەڵام هێشتام شتی تریش زۆر ماوە. دەتوانین بۆ نمونە بڵێین "ئەی فرۆد کێیە؟" جۆکەر دەڵێت ئەویش پیاوێکی بووکەشوشەیی سەیروسەمەرەیە. پڕلەژیانە و لەژێر ئاسمانێکی شیندایە. ئەو لەسەرەتادا تەنها کەسبوو کە لەسەر ئەم دوورگەیەدا دەژیا، بەڵام لە ڕاستیدا خۆی سەربە دەستەیەک یاری کاغەزی ترە. کەسیش نازانێت چەند کاغەز لەو دەستەیەدا هەیە. وە کەسیش نازانێت ئەو کەسە کێیە کە کاغەزەکان لەو دەستەیەوە دابەشدەکات. جۆکەر تەنها یەک شت دەزانێت؛ "فرۆد"یش پیاوێکی بووکەشوشەییە و لەناکاودا



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





بەیانیەکیان بەئاگابووە لەوەی کە پڕلەژیانە. جۆکەر لێرەدا پرسیارێک دەورووژێنێت و دەڵێت؛ "ئەی ئەو لە کوێوە هاتۆتە دەرەوە؟" بەردەوام هەر ئەو پرسیارە دەکات، هەتا ئەو کاتەی ڕۆژێک لە ڕۆژان وەڵامەکەی دەستدەکەوێت.

لەوێدا لەوە دەچوو کورتەبنەکان لەپاش سورێکی دوورودرێژی سربوون خەبەریان ببێتەوە. دووی کوپ و سێی کوپ هەریەکەو گسکێیان دۆزیەوە و کەوتنە گسکدانی هۆڵەکە. هەر چوار پاشاکە بەشێوەی بازنەیەکی بچکۆلە وەستان و دەستیان خستە سەرشانی یەکتری. بۆ ماوەیەک هەروا وەستابوون و بەهێواشی قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، دواتر پاشای کوپ ڕووی کردە جۆکەر و گوتی؛

«بەداخەوە پاشاکانی ئەم لادێیە گەیشتنە ئەوەی کە ئەم زۆرزانە ڕاستدەکات»

یەکسەر جۆکەر گوتی؛

«ئەی بۆچی ڕاستیەکەی ئەو جێگەی داخە؟»

هەتا ئەوکاتە هەر پاڵکەوتبوو، بەڵام دواتر شانێکی دادا و تەماشایەکی پاشای کوپی کرد.

پاشای دینار خۆی لەباسەکە هەڵقورتاند و گوتی؛

«پێمان ناخۆشە کە جۆکەر ڕاستیەکەی پێ گوتین، چونکە ئەو ڕاستیە مانای ئەوە دەبەخشێت کە "مێستەر" دەبێت بمرێت»

جۆکەر ڕووی دەمی تێکرد و لێی پرسی؛

«ئەی بۆچی ئەبێت "مێستەر" بمرێت؟ خۆتان دەزانن کە هەمیشە دەبێت بەپێی یاسایەک کەسێک لولبکرێت»

ئەم جارەیان پاشای سینەک وەڵامی دایەوە و گوتی؛



«ئەگەر فرۆد لە لادێکەدا بمێنێتەوە، هەمیشە ئەو خاڵەمان بەبیردەهێنێتەوە کە ئێمە شتێکی دروستکراوین، لەبەرئەوە دەبێت بە شمشێری کوڕەکان بمرێت»

جۆکەر لەسەر مێزەکە هاتە خوارەوە و بە هۆڵەکەدا دەهات و دەچوو، لەپێشدا ئاماژەی بۆ فرۆد کرد، بەڵام پاش نەختێک ڕووی لە پاشاکان وەرچەرخاند و گوتی؛

«وابزانم قەت شتێکی باش نەبووە کە مێستەر و ئافەریدەکانی هێندە نزیکی یەکتری بژین، چونکە بەو شێوەیە ڕێیتێدەچێت زۆر بەئاسانی یەکتری وەرستبکەن. بەڵام لە هەمان کاتیشدا نابێت لۆمەی فرۆد بکەین و بڵێین فەنتاسیاکانی هێندە پڕلەژیانبوون کە لە دواجاردا لە سەریەوە هاتوونەتە دەرەوە»

پاشای سینەک تاجە بچکۆلەکەی سەری ڕێک کردەوە و گوتی؛

«هەموو کەسێک بۆی هەیە بە ئارەزووی دڵی خۆی فەنتاسیای هەبێت. بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەرکی سەر شانیەتی کە بە فەنتاسیاکانی بڵێت ئێوە تەنها فەنتاسیان و هیچی تر. ئەگەر نا، ئەوا گاڵتەیان پێدەکات و بەو شێوەیەش فەنتاسیاکان بۆیان هەیە بیکوژن»

لەناکاودا خۆر کەوتە پشت پەڵە هەورێکی گەورەوە و یەکسەر هەموو هۆڵەکە تاریک بوو.

پاشای قەرە گوتی؛

«کوڕەکان... گوێتان لێیە ئێمە دەڵێین چی؟ سەری مێستەر بپەڕێنن!»

خۆم لەسەر کورسیەکەم هەڵدایە خوارەوە و ڕێک لەو کاتەدا کوڕی قەرە گوتی؛

«پاشا بەڕێزەکان، پێویست ناکات سەری بپەڕێنین، چونکە فرۆد خۆی مردووە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



یەکسەر ئاورێکم دایەوە. فرۆدم بینی لەسەر کورسیەکەی خزابووە خوارەوە و بێ گیان لەسەر زەویەکە کەوتبوو. ئەوە یەکەمین جارم نەبوو کە کەسێکی مردوو ببینم. من دەمزانی ئیتر فرۆد هەرگیزا و هەرگیز ناتوانێت کەرەتێکی تر بەچاوە پرشنگدارەکانی تەماشام بکاتەوە.

تا ئەو پەڕی ڕادە هەستم بە تەنهایی و بەتاڵی دەکرد. لەناوکدا لەنێو ئەو دوورگە سەیرەدا خۆمم بە تەنیا بینیەوە. کۆمەڵێک کاغەزی زیندووش لە چواردەورمدابوون، بەڵام هیچیان... هیچ یەکێک لە کاغەزەکانی دەستەکە وەک من مرۆڤ نەبوو.

هەموو کورتەبنەکان بەشێوەی بازنەیەکی چڕ بەچواردەوری "فرۆد"دا وەستان. نیگایەکی پڕ لە بەتاڵی لەسەر دەموچاویان دەبینرا، بەتاڵتر لەو نیگایەی کە ڕۆژی پێشتر کە لە لادێکەیان نزیک بوومەوە و لەسەر ڕوویان بینیم.

سەرنجمدا بللی کوپ چەند وشەیەکی بە گوێی پاشای کوپدا چرپاند. دوای ئەوە ڕێک بەرەو دەرگاکەی دەرەوە ڕایکرد و ونبوو.

لەو کاتەدا جۆکەر گوتی؛

«ئێستاکە ئیدی پشت بە خۆمان دەبەستین، چونکە فرۆد مرد و هەر ئافەریدەکانی خۆیشی کوشتیان»

زۆر دڵم تەنگ بوو، زۆر تووڕەش بووم. هەر لەبەرئەوە خۆم گەیاندە لای جۆکەر و دەستم دایە، بەرزمکردەوە بۆ ئاسمان و ڕاموەشاند. زەنگۆڵەکانی دەزرنگانەوە. لەوێدا گوتم؛

«تۆ کوشتت. تۆ ساردیە ئەرخەوانیەکەت لە کوخەکەی "فرۆد"دا دزی و هەر تۆش ڕاستی کاغەزەکانی فرۆدت ئاشکراکرد»

خستەمەوە سەر زەوی و لەو کاتەدا پاشای قەرە گوتی؛





«میوانەکەمان ڕاست دەکات. لەبەرئەوە هەقی ڕەوای خۆمانە کە سەری ئەو زۆرزانە بپەڕێنین. هەتاوەکو ئەم زۆرزانە نەکوژین، قەت لەدەستی ئەو کەسە ڕزگارنابین کە هەموومانی هەڵخڵەتاندبوو. ئادەی کوڕەکان! یەکسەر سەری ئەو بێشەرمە بپەڕێنن!»

جۆکەر بەپەلە بۆی دەرچوو، پاڵی بە چەند حەوتێک و هەشتێکەوە نا و دواتر خۆی گەیاندە هەمان ئەو دەرگایەی کە بللی کوپی لێوە ڕۆیشت و ئەویش ونبوو. منیش هەستمکرد کاتی میوانداریەکەم تەواوبووە. ڕۆیشتمە دەرەوە و بەناو کۆڵانەکانی ئەو لادێ بچکۆلەیەدا ڕۆیشتم. لەسەر خانوەکانەوە هێشتام زەردەی خۆرم بەدی دەکرد، بەڵام لە هیچ کونێکەوە جۆکەر و بللی کوپ دیارنەبوون.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



## پاشای دینار

**...پاشان لەسەر ئەوە بڕیاریاندا کە یەکی زەنگۆڵەیەکمان بکرێتە مل...**

پێش ئەوەی فرۆد بمرێت، باوکم لەناو جێگاکەیدا جولایەوە، بەڵام زۆر پەرۆشی خوێندنەوەکەم بووم و نەمتوانی کتێبەکە بچکۆلەکە دابنێم. بەڵام هەر کە مرخەی لێبەرزبووەوە، خێرا کتێبەکەم خنیە ناو گیرفانمەوە.

لەو کاتەدا کە لەناو جێگاکەیدا هەستا گوتم؛

«باش خەوتیت؟»

زۆر سەرسام دەهاتە بەرچاوم و لەوەڵامدا گوتی؛

«هەر زۆر خۆش خەوتم و خەونێکی سەیروسەمەرەشم بینی»

«چیت بینی؟»

هێشتام هەر لەسەر جێگاکەی دانیشتبوو. پێم وابێت لەوە دەترسا گەر لە جێگاکەیدا بێتە دەرەوە، خەونەکەی بیر بچێتەوە.

«لە خەونمدا هەموو خەڵکی کورتەبنەی بچکۆلەبوون، ڕێک هەروەک ئەو چیرۆکەی کە تۆ لەسەر سەربانەکە بۆت گێڕامەوە. هەموومان وەکویەک دەژیاین، بەڵام تەنها من و تۆ سەرسامی ئەو ڕاستیەبووین کە دەژین. دکتۆرێکی پیریش لە پڕێکدا شتێکی دۆزیەوە و گوتی هەموو کورتەبنەکان لەژێر نینۆکی پەنجە گەورەی قاچیاندا نیشانەیەکی بچکۆلە هەیە. ئەو نیشانەیەش تەنها لەژێر مایکرۆسکۆب و زەرەبیندا دەبینرا. هەر نیشانەیەکیش لە یەکێک لە نیشانەکانی یاری کاغەز و ژمارەیەک پێکهاتبوو، ژمارەکان لە یەکەوە هەتا چەند ملیاردێک دەبوون. کورتەبنەیەک نیشانەیەکی "کوپ" و ژمارەی 728964ی پێوەبوو، یەکێکی تر نیشانەی "سینەک" و ژمارەی 60143 و یەکێکی تریش نیشانەی "دینار" و ژمارەی 2659ی پێوەبوو. پاشان سەرژمێرییەکی گشتی سازدرا و بۆیاندەرکەوت کە هیچ دوو کەسێک نیە کە هەمان ژمارەیان پێوە بێت. بەو شێوەیەش مرۆڤایەتی وەک یارییەکی کاغەزی گەورە دەبینرا. بەڵام دواتر (لێرەدا دێمە سەر خاڵە هەرە گرنگەکە) بۆیاندەرکەوت کە دوو کورتەبنە هیچ جۆرە نیشانەیەکی ئاوهایان پێوە نیە. ئەو دوو کەسەش... هانس تۆماس و باوکی بوو. لێرەشەوە کورتەبنەکانی تر لێمان دەترسان. پاشان لەسەر ئەوە بڕیاریاندا کە یەکی زەنگۆڵەیەکمان بکرێتە مل، بەو جۆرەش هەموو کەسێک دەیزانی کە لە چ شوێنێکداین»

بەڕاستی منیش پێم وابوو خەونێکی پڕلەژیانی بینیبێت، بەڵام لەبنەڕەتدا تەنها ئەوەندەی کردبوو کە شتێکی زیاتری لەسەر چیرۆکەکەی من هۆنیبووەوە و هیچی تر.

پاش ماوەیەک گوتی؛

«ئەو هەموو بیرکردنەوە و خەیاڵانەی ناوەوەمانم بەلاوە سەیرە، بەڵام بیرکردنەوە هەرە قوڵەکانمان تەنها لەو کاتەدا دێنە دەرەوە کە دەخەوین»

منیش گوتم؛

«بەلایەنی کەمەوە لەو کاتانەدا دەردەکەون کە زۆرمان نەخواردبێتەوە»

ئەوە یەکەمین جارییوو کە هەروا سەیرمبکات و پێبکەنێت، وە بەبێ ئەوەی بەپەلە شتێکی بەخەیاڵدا بێت و وەڵامێکم بداتەوە. لەوەش سەیر تر ئەوە بوو کە بۆ نانی بەیانی چووینە خوارەوە و جگەرەی لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرت.







PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





نانی بەیانی لە ئوتێلی "تیتانیا"دا تا بڵێیت ساکار و خۆشبوو. ئەو خواردنەی کە یەکسەر دەخرایە سەر مێزەکە و لەسەر پارەی ژورەکەبوو، چەند شتێکی ساکار و قۆڕبوو، بەڵام لەولاترەوە مێزێکی گەورەیان ڕازاندبۆوە و هەر کەسەو بەئارەزووی دڵی خۆی قاپی لێپڕدەکرد، هەڵبەتە ئەو یەکەیان بەپارەبوو.
باوکم کەسێکی زۆرخۆر نەبوو، بەڵام ئەو بەیانیە شەربەت و ماست و هێلکە و تەماتە و گۆشتی بەراز و گیامارانەی خستە سەر قاپەکەی، منیش قاپێکی خۆشم بۆ خۆم ڕازاندەوە.
باوکم لەو کاتەدا کە هێلکەکەی پاکدەکرد گوتی؛
«ڕاستت کرد کە گوتت خواردنەوە شتێکی قۆڕە. خەریکبوو سادەیی و ڕوونی دونیای لەبیردەبردمەوە»
منیش گوتم؛
«بەڵام خۆ واز لە فەلسەفە ناهێنیت؟»
من هەمیشە کەمێک لەوە دەترسام کە "بیر"ە تیژەکەی بەسترابێتەوە بە خواردنەوەوە و لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئەگەر واز لە خواردنەوە بهێنێت، ئەوا یەکسەر وەک خەڵکانی ئاسایی لێدێت.
بەسەرسامیەکەوە تەماشایەکی کردم و گوتی؛
«نا،نا... خەمت نەبێت. ئەتوانم بڵێم بە پێچەوانەوە دەبێت؛ لە ئێستاکە بەدواوە دەبمە فەیلەسوفێکی چاونەترس»
لە خۆشیاندا هەناسەیەکم بۆ هەڵکێشا، نەختێک دواتر کەوتەوە قسە و گوتی؛
«تۆ دەزانی بۆچی زۆرینەی خەڵکی لەم جیهانەدا دێن و دەڕۆن و سەرسامی شتەکانی چواردەوریان نابن؟»



سەرێکم بۆ ڕاوەشاند.
«هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جیهان بەلایانەوە وەک خوویەکی لێهاتووە»
کەمێک خوێی بە هێلکەکەیەوە کرد و گوتی؛
«هەموو کەسێک بەرلەوەی باوەڕ بەم جیهانە بکات، چەندین ساڵی بەوەوە کوشتووە کە خۆی لەسەری ڕابهێنێت. ئەو حاڵەتە زۆر بەئاسانی لە هەڵسوکەوتی منداڵی بچکۆلەدا دەبینرێت. بەسەرسامیەوە تەماشای شتەکانی چواردەوریان دەکەن و باوەڕ بەچاوی خۆیان ناکەن. هەرلەبەرئەوەشە کە پەنجە بۆ هەموو ئەو شتانە ڕادەکێشن کە دەیبینن و دەڵێن "ئەوە چیە؟". بەڵام ئێمەی گەورە بەو شێوەیە جیهان نابینین. ئێمە هەموو شتەکانمان چەندەها جار بینیوە، لەبەرئەوە جیهان بۆتە شتێکی ئاسایی لەلامان»
بۆ ماوەیەکی دورودرێژ دانیشتبووین و پەنیر و گۆشتی بەرازمان دەخوارد. کاتێکیش کە قاپەکانمان هیچی تێدا نەما، باوکم گوتی؛
«پەیمانێک بە یەکتری بدەین، هانس تۆماس؟»
«چ پەیمانێک؟»
ڕێک تەماشای ناو چاوی کردم و گوتی؛
«با پەیمان بەیەکتری بدەین و بڵێین ئەم جیهانە بەجێناهێڵین ئەگەر نەزانین ئێمە کێین و لە کوێوە هاتووین، بەلایەنی کەمەوە هەتا لەو بارەیەوە شتێکی زیاترمان بۆ ڕوون نەبێتەوە، واز لەم جیهانە ناهێنین»
«ڕازیم»
لەوێدا بۆ ئەوەی پەیمانەکەمان ببێتە شتێکی ڕاستەقینە، دەستی ڕاستم بۆ ڕاکێشا و تەوقەیەکم لەگەڵدا کرد. دواتریش گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

«بەڵام با لەپێشدا دایکم بدۆزینەوە، چونکە پێم وانیە بەبێ دایکم بتوانین درێژە بەو پەیمانە بدەین»







**بللی کوپ**

**...کاغەزەکەم هەڵگێڕایەوە و سەیرێکم کرد، بللی "کوپ" بوو...**

لە ماشێنەکەدا دانیشتین و نیازمانبوو بەرەو شاری "پیرالیفس" بڕۆین، لەو کاتەدا باوکمم وەک کەسێکی زۆر بەپەرۆش دەهاتە بەرچاو.
نازانم پەرۆشی ئەوەبوو کە سەردانی ئەو شارەمان دەکرد، یان پەرۆشی ئەوەبوو کە بۆ پاشنیوەڕۆ دەبوایە تەلەفونی بۆ دەلالەکە بکردایە و چاوەڕوانبوو کە شوێنی دایکمان بۆ بدۆزێتەوە.
ماشێنەکەمان لە ناوەڕاستی ئەو شارە بەندەریە گەورەیەدا ڕاگرت و دواتر ڕێگای بەندەرە نێونەتەوەیەکەمان دۆزیەوە.
پاشان پەنجەی بۆ پاپۆڕێکی شتومەکی ڕووسی ڕاکێشا و گوتی؛
«17 ساڵ لەمەوبەر ئالێرەدا پاپۆڕەکەمان بەستبووەوە»
ئینجا بەدوورودرێژی کەوتە باسکردنی بازنەکانی ژیان و گوتی ژیان لە چەند بازنەیەک پێکهاتووە و یەک لەدوای یەک کۆتاییان پێدێت.
دواتر پرسیارێکم لێکرد و گوتم؛
«بەڕاست... دەبێت کەی تەلەفونی بۆ بکەیت؟»
«لەپاش کاتژمێری "سێ"وە»
تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد، منیش بەدوایدا هەمان شتمکرد. کاتژمێر دوانزەونیو بوو.
لەوێدا گوتم؛
«چارەنووس وەک گوڵەکەلەرم وایە، لە هەموو لایەکەوە وەک یەک گەشەدەکات»
باوکم بەشێوەیەکی زۆر سەیر دەستێکی بادا و گوتی؛
«ئەم قسە قۆڕانە چیە تۆ دەیکەیت، هانس تۆماس؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





پێموابێت زۆر لەوە دەترسا کە دایکم ببینین و بەتەواوەتی نەیدەزانی ئەو کاتە چی ڕوودەدات.

یەکسەر بەدوای قسەکانیدا گوتم؛

«برسیمە»

قسەیەکی باشم نەگوت، بەڵام نەمدەتوانی دەمودەست شتێک بدۆزمەوە کە پەیوەندی بە گوڵەکەلەرمەوە هەبێت. بەهەرحاڵ دواتر بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بەرەو بەندەرە بەناوبانگەکەی "میکرۆلیمانۆ" ڕۆیشتین.

لەو ڕێگایەدا بەلای بەلەمێکدا ڕۆیشتین، باوکم گوتی ئەو بەلەمە بەرەو دوورگەیەک دەڕوات کە ناوی "سانتۆرینی"یە. هەروەها گوتی کاتی خۆی ئەو دوورگەیە زۆر زۆر گەورەتربووە، بەڵام بەهۆی بورکانی یەک لەسەریەکەوە زۆرینەی دوورگەکە لە دەریادا ونبووە و ئێستاکە کەمێکی ماوەتەوە.

خواردنێکی خۆشمان داواکرد. لەکاتی نانخواردندا هێندە قسەمان نەکرد، تەنها ئەوەندە نەبێت کە باوکم چەند وشەیەکی دەربارەی هەندێک ماسیگر وت کە لە خوار چێشتخانەکەوە خەریکی تۆڕەکانیان بوون. هەردووکمان یەکی دوو سێ جار تەماشای کاتژمێرەکانمان کرد. هەردووکیشمان دەمانویست بە شێوەیەک سەیربیکەین کە ئەوی تر پێی نەزانێت، بەڵام هیچمان بەتەواوەتی نەمانتوانی بەدزیەوە سەیری بکەین.

پاش ماوەیەک باوکم گوتی؛

«من دەڕۆم تەلەفونەکەم دەکەم»



لەو کاتەدا کاتژمێر چارەکی دەویست بۆ سێ. بەرلەوەی بڕوات قاپێکی گەورەی ئاسکریمی بۆ بانگکردم، بەڵام پێش ئەوەی بۆم بخەنە سەر مێزەکە، زەرەبین و کتێبە بچکۆلەکەم لە گیرفانمدا دەرهێنا.

ئەو جارەیان کتێبە بچکۆلەکەم لەژێر قەراغی مێزەکەدا شاردەوە و لەوێوە دەمخوێندەوە، بەو شێوەیەش کەس پێی نەدەزانیم.

**بەسەر گردەکەدا بەپەلە بەرەو ڕووی کوخەکەی فرۆد هەنگاومنا. لەو کاتەدا کە ڕامدەکرد، لەژێر پێمەوە گوێم لە خرمەخرمێکی هێواشبوو، هەردەتگوت زەویەکەی ژێر پێم لەپڕێکدا وردوخاش دەبێت.**

**کە گەیشتمە لای کوخەکە، دیسانەوە ئاوڕێکم لە لادێکە دایەوە. زۆربەی کورتەبنەکان هۆڵی ئاهەنگەکەیان بەجێهێشتبوو، بەڕاکردن بەنێو خانوەکاندا دەهاتن و دەچوون. گوێم لێبوو یەکێکیان هاواری کرد و گوتی؛**

**«بیکوژە!»**

**یەکێکی تریشیان گوتی؛**

**«هەردووکیان دەکوژین!»**

**دەرگای کوخەکەم کردەوە. ئای کە بەتاڵ دەهاتە بەرچاوم... من دەمزانی ئیتر هەرگیزاو هەرگیز فرۆد ناتوانێت کەڕەتێکی تر پێ بخاتەوە ناو ئەو کوخە. لەسەر یەکێک لە کورسیەکان دانیشتم و هەناسەیەکم بۆ هەڵکێشا.**

**هەستامەوە سەر پێ، لەسەر مێزەکەی بەردەمم شوشەیەکی ماسی گەورە دانرابوو، ماسیەکی پرتەقاڵی بچکۆلەی تێدابوو، من بۆ ماوەیەک هەر تەماشای ئەو ماسیە پرتەقاڵیەم دەکرد، لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر مەلەی دەکرد. هەر لەو کاتەدا چاوم کەوتە سەر جەواڵێکی**



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

سپی، لەسوچێکی ژوورەکەدا بوو. لەوە دەچوو لە پێستی یەکێک لە ئاژەڵە شەش قاچیەکان دروستکرابێت. شوشەیەکی بەتاڵم لەسەر مێزێکی بەردەم پەنجەرەکەدا دۆزیەوە، ماسیە پرتەقاڵیەکە و هەندێک ئاوم ڕۆکردە ناوی، دواتر زۆر بە هێواشی بتڵەکە و شوشەی ماسیەکەم خستە ناو جەواڵە سپیەکەوە. لەسەر ڕەفەیەکی سەر دەرگاکە، قتووە دارینەکەم دۆزیەوە، ئەو قتووەی کە کاتی خۆی کاغەزەکانی فرۆدی تێدا بووبوو. ئەویشم خستە ناو جەواڵەکەوە.

زۆر بەپەلە بە کوخەکەی "فرۆد"دا خولامەوە و چەند شتێکی جیاواز جیاوازم کۆکردەوە. پەیکەرێکی شوشەییم بینی کە شێوەی یەکێک لە "مۆلووک"ەکانی نیشاندەدا، بەڵام لەو کاتەدا کە دەستمدایە گوێم لە زرنگەیەک بوو کە ڕێک لەو دیوی کۆخەکەوە هات. کەمێک دواتر جۆکەر لە دەرگاکەوە خۆی هەڵدایە ژورەوە. بەدەم هەناسەبڕکێوە گوتی؛

«دەبێت هەر ئێستا بۆی دەبچین و خۆمان بگەیەنینە دەریا»

بەسەرسوڕمانێکەوە گوتم؛

«هەردووکمان؟»

«بەڵێ هەردووکمان! بەڵام بەڕاستی دەبێت پەلەبکەین، دەریاوان »

«بۆ؟»

«دوورگە خەیاڵیەکە لەناوەوەڕا دەڕمێت»

هێندەی گوت و یەکسەر یاری جۆکەرەکەم بیرکەوتەوە.

لەو کاتەدا کە خەریکبوو دەمی جەواڵەکەم دادەخست، جۆکەرم بینی و لەوەدەچوو لەناو دۆڵابەکەدا بەدوای شتێکدا بگەڕێت. پاش نەختێک بە خۆی و بتڵێک لە خواردنەوە بریقەدارەکەوە گەڕایەوە لام. نیو بتڵی لە خواردنەوە ئەرخەوانیەکە تێدابوو و گوتی؛







«ئەمەشی تێبخە»

ڕۆیشتینە بەرهەیوانەکە و لەوێدا ڕووبەڕوی دیمەنێکی ناخۆش بووینەوە. هەموو کورتەبنەکان بەسەر گردەکەدا هەڵدەزنان و بەرەو کوخەکە دەهاتن. هەندێکیان بەپێ دەڕۆیشتن، هەندێکی تریشیان بەسواری "مۆلووک"ەوە بوون. هەر چوار کوڕەکە لەپێش هەموویانەوە ڕایاندەکرد و هەر چواریشیان شمشێرەکانیان بەرزکردبووەوە.

لەوێدا جۆکەر گوتی؛

« لەم ڕێگایەوە، دەی خێراکە!»

ڕامانکردە پشتی کوخەکە و چووینە سەر توولە ڕێگایەک کە بەناو دارستانێکی سەرو لادێکەدا دەڕۆیشت. ڕێک لەو کاتەدا کە گەیشتینە ناو دارەکان، ئاوڕێکمان دایەوە و بینیمان هەندێک لە کورتەبنەکان گەیشتبوونە سەر تەپۆڵکەکە.

جۆکەر لەبەردەممەوە هەروەک بزن لەسەر ڕێگاکە خۆی هەڵدەدا و هەڵدەبەزیەوە. بیرم دێت لەو کاتەدا پێم ناخۆشبوو کە ڕێک زەنگۆڵەیان بەو بزنەوەکردبوو، چونکە زرنگەی زەنگۆڵەکانی وای لە بزنەکانی تر دەکرد کە بەئاسانی بیدۆزنەوە و دوای بکەون.

هەر لەو کاتەدا کە ڕاماندەکرد، جۆکەر گوتی؛

«دەبێت کوڕی نانەواکە ڕێگای دەریا بدۆزێتەوە»

هەموویم بۆ گێڕایەوە و گوتم لە دەشتێکی پان و بەرینەوە هاتمە ئێرە و لەوێدا بەرلەوەی دوو و سێی سینەک لە کێڵگەکەدا ببینم، چاوم بە هەنگە گەورەکان و "مۆلووک"ەکان کەوت.

پاش قسەکانم یەکسەر جۆکەر ئاماژەی بۆ ڕێگایەک کرد کە بەلای چەپدا پێچی دەکردەوە و گوتی؛

«کەواتە دەبێت ئەم ڕێگایەیان بێت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





پاش نەختێک لە دارستانەکەوە هاتینە دەرەوە. لەوێدا لەسەر بەرزاییەک وەستاین و تەماشای ئەو دەشتەمان دەکرد کە بۆ یەکەمین جار کورتەبنەکانم تێدا بینی.

جۆکەر بە بەرزاییەکەدا هاتە خوارەوە و لەو کاتەدا هەڵکەوت و بەسەر بەردە تیژەکاندا خلبووەوە. زرنگەی زەنگۆڵەکانی بەرزبوونەوە و لە هەموو چیاکەدا دەنگیدایەوە، منیش لەوە دەترسام کە زۆر بە خراپی بریندار بووبێت. کەچی ئەو لە خواری خوارەوە هەستایەوە سەرپێ، دەستێکی بادا و دایە قاقای پێکەنین. ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە تەنانەت هیچ شوێنێکیشی نەڕوشابوو.

بەڵام من کەمێک وریاتر ڕۆیشتمە خوارەوە. لەو کاتەدا کە گەیشتمە خوارەوە، دیسانەوە هەستم کرد عەردەکەی ژێر پێم هێدی هێدی وردوخاش دەبێت.

گەیشتینە ناو دەشتەکە و لەوێدا هەستم کرد پانتاییەکەی بچکۆلەترە لەو کاتەی کە پێدا تێپەڕیم. پاش نەختێکیش چاومان بە هەنگە گەورەکان کەوت. هێشتام لەبەرچاومدا لە هەنگەکانی ئەڵمانیا گەورەتربوون، بەڵام هێندەی ئەو کاتە گەورەنەبوون کە بۆ یەکەمجار بینیمن.

لەوێدا پەنجەم بۆ شاخێکی بەرز ڕاکێشا و گوتم:

«وابزانم دەبێت لەو ڕێگایەوە بڕۆین»

جۆکەر بە بێزاریەکەوە گوتی:

«بەسەر ئەو شاخەدا سەرکەوین؟»

سەرێکم بۆ ڕاوەشان و گوتم:

«لە کونە ئەشکەوتی شاخێکەوە هاتمە ئێرە»

«کەواتە دەبێت ئەو کونە بدۆزینەوە، دەریاوان»



ئاماژەی بۆ دەشتەکە کرد، لەوێوە کورتەبنەکان دوامان کەوتبوون. لەپێش هەموویانەوە هەشت بۆ دە "مۆلووک"ێک بە خۆیان و سوارەکانیانەوە غاریاندەدا، تەپوتۆزێکی زۆر لەژێر ئەو گیانەوەرە شەش قاچیانەوە بەرز دەبووەوە.

لەوێشدا دیسانەوە گوێم لە دەنگێکی سەیر بووەوە. هەر لە دەنگی هەورە گرمەیەکی هێواش دەچوو، بەڵام دڵنیابووم کە ئەو دەنگە دەنگی غاردانی "مۆلووک"ەکان نەبوو. لە هەمان کاتیشدا هەستم دەکرد ئەو دەشتەی کە ئێمە کەمێک لەوەبەر پێیدا تێپەڕین، کورتتربۆتەوە و کورتەبنەکان ماوەیەکی کەمتریان پێچوو بۆ ئەوەی بیبڕن.

"مۆلووک"ەکان چەند مەترێکیان مابوو بگەنە لامان و ڕێک لەو کاتەدا چاوم بە کونی ئەشکەوتەکە کەوت. لەوێدا گوتم:

«لێرەدایە!»

لەپێشدا من بە کونەکەدا چوومە خوارەوە. پاش ئەوەی کە خۆم گەیاندە ئەودیوەوە، جۆکەر ویستی بەدوامدا بێت. ڕاستە ئەو لە من بچکۆلەتربوو، بەڵام ناچاربووم لە کونەکەوە قۆڵی ڕابکێشم و بیهێنمە خوارەوە. من خۆم هەموو گیانم کەوتبووە سەر ئارەقە، بەڵام قۆڵەکانی ئەو هەروەک شاخەکە سارد و سڕبوو.

لەو کاتەدا گوێمان لەدەنگی پێی "مۆلووک"ەکان بوو و لەسەر کونەکە وەستابوون. کەمێک دواتر دەموچاوی کەسێکمان بینی لە کونەکەوە سەرەتاتکێی دەکرد، پاشای قەرە بوو. تەنها فریای ئەوەندە کەوت کە تەماشایەکمان بکات، چونکە کونەکە بەتەواوەتی هاتەوە یەک. بەڵام بەرلەوە دەستێکی هێنابووە خوارەوە و بەپەلە ڕاکێشایەوە دەرەوە.

ئینجا گوتم:



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«وابزانم دوورگەکە دەچێتەوە یەک»
جۆکەریش گوتی؛
«یان لە ناوەوەڕا دەرمێت. پێش ئەوەی دووگەکە بەتەواوەتی ونببێت، با خێرا بۆی دەربچین»

بەناو ئەشکەوتەکەدا ڕۆیشتین و پاش نەختێک لەو سەریەوە هاتینە دەرەوە. لەوێدا هێشتام مارمێلکەکان و بۆقەکان بەو ناوەدا دەخولانەوە، بەڵام چیتر هێندەی کەروێشکێک گەورە نەبوون.

بەناو دۆڵەکەدا ڕامانکرد. هەر دەتگوت لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا سەد مەتر دەبڕین، بەلایەنی کەمەوە هێندەی نەبرد و خۆمان لەناو دەوەنی گوڵباخە زەردەکاندا بینیەوە. هەر لەوێشدا دیسانەوە چاوم بەو پەپولانە کەوتەوە کە دەیانخوێند. هێشتام ژمارەیان هەر زۆر زۆر بوو، بەڵام هەندێکی کەمیان بەگەورەیی مابوونەوە و ئەوانی دی هەر هەموویان زۆر زۆر بچکۆلە بووبوونەوە. چیتریش نەیاندەخوێند، بەڵام وابزانم لەبەر زرنگەی زەنگۆڵەکانی جۆکەر گوێم لە دەنگی ئەوان نەبوو.

پاش ماوەیەک گەیشتینە سەر ئەو شاخەی کە ڕۆژێک لەدوای کەشتی تێکشکانەکەم لەسەری وەستابووم و لەوێوە تەماشای خۆر ئاوابوونم دەکرد. سەیربوو، هەموو کەرەتێک کە قاچم لەزەوی بەرزدەکردەوە، دەتگوت بەسەر ئەو شوێنەدا دەفرم. لەخواری خوارەوە چاومان بە دەریاچەیەک کەوت، هەر هەمان ئەو دەریاچەیەبوو کە من پێشتر مەلەم تێداکرد و ڕەوە ماسیە ڕەنگاوڕەنگەکانم تێدا بینی. بەڵام لەو کاتەدا دەریاچەکە زۆر بچکۆلەتر دەهاتە بەرچاوم. لەوێوە ئیدی دەریامان لێوە دیاربوو. لەدووریشەوە، زۆر زۆر لە دورەوە کەفێکی سپیمان بینی لە دوورگەکەوە بەرزدەبووەوە.



جۆکەر هەروەک منداڵێک خۆی بەئاسماندا هەڵدەدا و هەڵدەپەڕی. بەسەرسامیەکەوە سەیرێکی کردم و گوتی؛
«ئەوەیە دەریا؟ دەریاوان، ئەوەی کە دەیبینین دەریایە؟»
فریا نەکەوتم وەڵامی بدەمەوە، چونکە دیسانەوە زەویەکەی ژێر پێمان گرمەی لێبەرزبووەوە. خرمەو هاڕەیەکی گەورەی لێوە دەهات، هەر دەتگوت کەسێک لەوێدایە و بەرد دەجوێت. لەو کاتەدا جۆکەر گوتی؛
«ئەوە شاخەکەیە و خۆی خۆی دەخوات»

بەڕاکردن لە شاخەکەوە هاتینە خوارەوە و پاش نەختێک گەیشتینە لای ئەو دەریاچەیەی کە کاتی خۆی مەلەم تێدا کرد، بەڵام لەو کاتەدا هێندەی مەلەوانگەیەکی بچکۆلەی مابووەوە. هێشتام هەر ماسیە پرتەقاڵیەکانی تێدابوو، نزیک بەیەک مەلەیان دەکرد، نزیکتر لەو کاتەی کە بۆ یەکەمجار بینیمن. وادەهاتە بەرچاوم کە پەلکەزێڕینەیەک لە ئاسمانەوە کەوتۆتە خوارەوە و لەناو ئەو ئاوە کەمەدا تواوەتەوە.

جۆکەر بۆ خۆی لەوناوەدا دەگەڕا، منیش جەواڵەکەی پشتم داگرت و دەمەکەیم کردەوە. زۆر بە هێواشی شوشەی ماسیەکەم دەرهێنا و پڕمکرد لە ماسی پرتەقاڵی. ویستم شوشەکە بەرزبکەمەوە، بەڵام لەناکاودا هەڵگەڕایەوە. هێشتام بەتەواوەتی دەستمی بەرنەکەوتبوو کە هەڵگەڕایەوە، هەر خۆی لە خۆیەوە هەڵگەڕایەوە. نازانم، لەوانەشە بەهۆی ماسیەکانی ناویەوە بووبێت. بەهەرحاڵ لە یەکێک لە قەراغەکانیەوە پارچەیەکی بچکۆلەی لێبووەوە. جۆکەریش لەپڕێکدا ئاوڕی لێدامەوە و گوتی؛
«زووبە دەریاوان، دەبێت بڕۆین»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





یاریدەی دام و دیسانەوە شوشەکەمان پڕکردەوە لە ماسیە ڕەنگاوڕەنگەکان. بەپەلە کراسەکەی بەرمم داماڵی و بەتووندی ئالاندم لە چواردەوریەوە، جەواڵەکەم دایەوە بە پشتمدا، بە هێواشی شوشەکەم بەرزکردەوە و گرتم بەباوەشمەوە.

لەناکاودا گرمەیەکی گەورە دایچڵەکاندین، وەک ئەوە وابوو کە هەموو دوورگەکە دارڕمێت. بەناو دارخورما بەرزەکاندا ڕامانکرد و پاش کەمێک گەیشتینە ئەو قەراغ دەریایەی کە دوو ڕۆژ لەووبەر پێم تێخست. لەوێدا یەکەمین شت کە چاومی چووە سەر، بەلەمەکەبوو. هێشتام هەر لەنێوان دوو دار خورماکەدابوو، ڕێک وەک ئەو کاتەی کە بەجێمهێشت. ئاوڕێکم دایەوە و تەماشایەکی دوورگەکەم کردەوە، دیسانەوە وەک دوورگەیەکی زۆر بچکۆلەی ناو دەریا دەهاتەوە بەرچاوم. لەنێو کۆمەڵێک دارخورماوە بەسەختی دەریاکەم دەبینی. تەنها یەک شت وەک خۆی نەبوو، هەڵبەتە بە بەراوردکردنی لەگەڵ ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمین جار گەیشتمە ئەو تەنکاییە. دەریاکە ڕێک هەروەک جاری پێشوو ئارامبوو، بەڵام ئێستاکە کەفێکی سپی و جوانم لە قەراغ ئاوەکەدا بەدیدەکرد. هێندە تێگەیشتم کە دوورگەکە خەریکبوو لەناو دەریاکەدا نغرۆ ببێت.

لەژێر سێبەری دارخورمایەکدا چاوم بە شتێکی زەردباوکەوت، دەجوڵایەوە. هێندەی نەبرد و بۆمدەرکەوت کە بللی "کوپ"ە. جەواڵەکە و شوشەی ماسیەکەم خستە ناو بەلەمەکەوە و گەڕامەوە بۆ لای، لەو کاتەدا جۆکەر هەروەک منداڵێکی بچکۆلە بە چواردەوری بەلەمەکەدا هەڵدەپەڕی.

بەهێواشی گوتم؛

«بللی کوپ؟»



ئاوڕی لێدامەوە و بەدەموچاوێکی پڕلەتاسە و میهرەبانیەوە تەماشایکردم، لەوە دەترسام خۆی هەڵبدات و دەستبکاتە ملم. کەچی گوتی؛

«وا منیش توانیم لەناو ئەو شوێنە دژوارەدا ڕێگەیەک بدۆزمەوە و خۆم قورتاربکەم. ئێستاکە دەزانم کە من سەربە ڕۆخی دەریایەکی ترم... گوێت لەو شەپۆلانە نیە کە خۆیان دەکێشن بە قەراغی دەریاکەدا، ئەو دەریایەی کە چەندەها ساڵ و چەندەها میل لێرەوە دوورە؟»

منیش گوتم؛

«لەمەبەستت تێناگەم»

دواتر گوتی؛

«منداڵێکی بچکۆلە بیر لە من دەکاتەوە. من لێرەدا ئەوم بۆ نادۆزرێتەوە... بەڵام لەوانەیە ئەو من بدۆزێتەوە. دەزانی چی... من زۆر دوورکەوتومەتەوە لەو. من بەناو دەریا و هزردا تێپەڕیم، چیا بەرزەکان و ئەندێشە قوڵەکانم بڕی. بەڵام کەسێک کاغەزەکانی تێکەڵکرد...»

لەپڕێکدا جۆکەر هاواریکرد و گوتی؛

«وا گەیشتنە سەرمان!»

ئاوڕێکم دایەوە و بینیم لەناو دارخورماکانەوە هەموو کورتەبنەکان بەڕاکردن بەرەوڕوومان دەهاتن. چوار "مۆلووک" و سوارەکانیان پێش هەموویان کەوتبوون، هەرزوو بۆمدەرکەوت کە پاشاکان لێیاندەخورپین.

پاشای قەرە هاوارێکی کرد و گوتی؛

«بیانگرن! بیانگرن و دیسانەوە بیانخەنەوە ناو یاری کاغەزەکە!»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



ڕێک لەو کاتەدا گرمەیەکی گەورە لەناوەوەی دوورگەکەوە بەرزبووەوە، لەناکاودا شتێکی سەیر ڕوویدا و لە ترساندا بەپشتدا کەوتم. هەروەک چۆن کە خۆر هەڵدێت و تەم ومژ دەفەوتێنێت، بەهەمان ئەو شێوەیە هەروەک ئەوەی جادوویەک کرابێت، لە پڕێکدا "مۆلووک" و کورتەبنەکان ونبوون. ئاوڕێکم لە بللی "کوپ" دایەوە و ئەویش وەک ئەوانی دی دیارنەمابوو. بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە ژێر ئەو دار خورمایەی کە ئەو کەمێک لەوەوبەر لە ژێریدا دانیشتبوو. لەوێدا، ڕێک لەو شوێنەدا کە ئەوی لێبوو، کاغەزێکی یاریم بەرچاوکەوت، بەڕووی وێنەکەیدا کەوتبوو. کاغەزەکەم هەڵگێڕایەوە و سەیرێکم کرد، بللی "کوپ" بوو.

یەکسەر فرمێسک بەچاوانمدا هاتە خوارەوە و سەر کوڵمەکانمی تەڕکرد، لە هەمان کاتیشدا تووڕەیی و پەستیەکی زۆر دەموچاومی داگرت. ڕامکردە لای دارخورماکانەوە، ڕێک چوومە ئەو شوێنەی کە "مۆلووک" و کورتەبنەکانی لێوە هاتن. هاوکات کە گەیشتمە ئەوێ، ڕەشەبایەکی قایم هەڵیکرد و کۆمەڵێک کاغەزی بە ئاسماندا بەرزکردەوە. لەوێدا من تەنها بللی کوپم بەدەستەوە بوو، بەڵام خێرا کەوتمە کۆکردنەوەی **51** کاغەزەکەی تر. قەراغی هەر هەموویان بەتەواوەتی کۆنبووبوو و وێنەکانیان سواوبوون، بەهەزارحاڵ دەمتوانی وێنەکان لە یەکتر جودابکەمەوە. هەر **52** کاغەزەکەم خنیە گیرفانمەوە.

تەماشایەکی سەر زەویەکەم کردەوە و چوار قالۆنچەی سپیم بینی، یەکی شەش قاچیان هەبوو. ویستم بیانگرم، بەڵام خۆیان خزاندە ژێر بەردێکەوە و لەبەرچاومدا ونبوون.





دیسانەوە زرمەیەکی گەورەی تر لە دوورگەکەوە بەرزبووەوە، لە هەمان کاتیشدا چەند شەپۆلێک یەک لەدوای یەک بەر قاچەکانم کەوت. جۆکەر لە بەلەمەکەدا دانیشتبوو، سەوڵی لێدەدا و دەیویست لە دوورگەکە دووربکەوێتەوە. بەهەزار حاڵ خۆم گەیاندە بەلەمەکە پیایدا هەڵزنام. لەو کاتەدا جۆکەر گوتی؛

«ئممم... کوڕە نانەواکەش دەیەوێت بێت»

سەوڵێکی دامێ و هەردووکمان بەو پەڕی توانامانەوە کەوتینە سەوڵلێدان، ڕێک لەو کاتەدا دوورگەکە هێدی هێدی لەناو دەریادا وندەبوو. چاوم لێبوو شەپۆلی ئاو تەوژمی بۆ دارخورماکان دەبرد، لەو کاتەشدا کە دواهەمین دار خورما کەوتە ژێر ئاوەوە، باڵندەیەکی بچکۆلەم بینی لەسەر لقەکانیەوە هەڵفڕی.

هەر لەگەڵ نقوومبوونی دوورگەکەدا، چەند شەپۆلێکی توند بەچواردەوری دوورگەکەدا بڵاوبووەوە، ئێمەش ناچاربووین بەو پەڕی تواناوە خۆمان لەشەپۆلەکان دوور بخەینەوە. دواتر کە سەوڵەکانمان دانا، خوێن لە هەردوو لەپی دەستمەوە دەچۆڕا، بەڵام دەستی جۆکەر هەروەک خۆی سپی و جوانبوو، ڕێک وەک ئەو کاتەبوو کە لەبەردەم کوخەکەی "فرۆد"دا نیشانیدام.

پاش ماوەیەک خۆر لەئاسۆی دەریاوە ئاوابوو. بۆی پاڵکەوتین و بەدرێژایی ئەو شەوە و ڕۆژی دواتریش ڕەشەباو ئاوهەوا بەئارەزووی خۆی بەملاولادا دەیبردین. چەند جارێک هەوڵمدا لەگەڵ هاوەڵی ناو بەلەمەکەدا قسەبکەم، بەڵام لە چەند وشەیەکی کەم زیاتر، نەمتوانی هیچی وای لێدەربهێنم. بەبێدەنگی بۆی دانیشتبوو و خەندەیەکی مەکراوی و پڕفیتنە لەسەر لێوەکانی بوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



بۆ ئێوارە درەنگانێکی ڕۆژی دواتر تووشمان بوو بە تووشی بەلەمێکی سەربە شاری "ئارندال" و هەڵیان گرتینەوە. هێندەمان پێگوتن کە ئێمە لەسەر کەشتیەک بووین کە ناوی "ماریا" بووە و چەند ڕۆژێک لەوەوبەر نقوومبووە، دواتریش گوتمان پاش تێکشکانەکە تەنها ئێمە دەرچووین.

بەلەمەکەی ئەوان بەرەو شاری "مارسیلیا" دەڕۆیشت. جۆرکەریش بەدرێژایی هەموو ئەو ڕێگایە بەرەو ئەوروپا، بێدەنگ دانیشتبوو، ڕێک هەروەک ئەو کاتەی کە لەناو بەلەمەکەی خۆماندابوو. بەبڕوای دەریاوانەکانی تر ئەو کەسێکی سەیربوو، بەڵام هیچیان لەو بارەیەوە هیچ شتێکی نەگوت.

هەر کە گەیشتینە "مارسیلیا" ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە بەپەلە خۆی گەیاندە ناو چەند ئەمبارێکی سەر بەندەرەکە و بۆی دەرچوو. بەو شێوەیە ڕایکرد و تەنانەت خواحافیزبوونیشی نەکرد.

لە کۆتایی ئەو ساڵەدا گەیشتمە ئەو شارەی کە پێی دەڵێن "دۆرف". هەموو ئەو شتانەی کە بینیمن هێندە بەلامەوە سەیروسەمەرە بوو کە پێموابوو پێویستم بە هەموو ژیانم بێت تەنها بۆ ئەوەی کە بیریان لێبکەمەوە. دواتریش پێمخۆشبوو ژیانم لەناو شاری دۆرفدا بەسەربەرم. من هەروا بەرێکەوت 52 ساڵ لەمەوبەر هاتمە ناو ئەم شارەوە.

کە بینیشم هیچ نانەوخانەیەکیان لەو شارەدا نیە، یەکسەر خەیاڵم بۆ ئەوە چوو کە نانەواخانەیەکی بچکۆلەی تێدا بکەمەوە. من بەر لەوەی ببمە دەریاوان، لەشاری "لیوبیک"دا خەلفەی نانەوابووم. لەو کاتەشەوە ئیتر ئەو شوێنە بوو بە ماڵی من.





هەڵبەتە من خۆشم جار جارێک گومانم لە چیرۆکی دوورگە خەیاڵیەکە دەکرد، بەڵام ئەو کاتەی لە شاری "مارسیلیا" دابەزیم، جەواڵە سپیەکە هەر بەشانمەوەبوو. لەو کاتەشەوە هەتا ئێستا ئەو جەواڵە و هەموو شتەکانی ناویشم بەباشی پاراستووە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





**دووی کوپ**

**...لەوانەیە ئێستاکە لە قەراغ ئاوێکدا وەستابێت و تەماشای دەریا بکات...**

سەرم لەسەر کتێبە بچکۆلەکەم هەڵگرت. لەو کاتەدا کاتژمێر لەسێ و نیو لایدابوو، ئاسکریمەکەی بەردەمیشم تواببووەوە.

لەوێدا بۆ یەکەمین جار خەیاڵێکی زۆر سەیر بە مێشکمدا هات؛ کەرەتێکیان فرۆد گوتی کورتەبنەکانی سەر دوورگە خەیاڵییەکە هەروەک ئێمەی مرۆڤ پیر نابن. ئەگەر ئەوە راست بێت، کەواتە جۆکەر تا ئێستاکەش لە شوێنێکی ئەم جیهانەدایە.

هەموو ئەو شتانەم بیردێتەوە کە باوکم لە گۆڕەپانەکەی ئەسینادا دەربارەی دەسەڵاتی روخێنەری کات بۆی باسکردم. بەڵام کات هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر کورتەبنەکانی ئەو دوورگەیەدا نەبووە؛ هەرچەندە ئەوان هەروەک مرۆڤ و ئاژەڵ بەم جیهانەدا هاتوون و چوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک ئێمە لە گۆشت و خوێن پێک نەهاتوون.

لە چەند شوێنێکی کتێبەکەدا باسی کورتەبنەکان دەکات و دەڵێت ئەوان بریندار نابن. بۆ نمونە هیچ یەکێکیان لەو کاتەدا بریندارنەبوو کە جۆکەر لە ئاهەنگی جۆکەرەکەدا هەموو شوشە و بتڵەکانی وردوخاشکرد. جۆکەریش لەو کاتەدا کە لەسەر شاخەکە هەڵکەوت و هەتا خوارەوە تلبووەوە، هیچ شوێنێکی بریندار نەبوو. دواتریش کە لە دوورگەکە دوورکەوتنەوە، وە لەپاش ئەو هەموو سەوڵ لێدانە دەستەکانی ئەو نە بڵقی کرد و نە برینداریش بوو. بەڵام شتێکی تریش؛ "هانس"ی نانەوا گوتی کورتەبنەکان دەستیان ساردە...



یەکسەر لەوێدا ئارەقێکی سارد بە پشتمدا هاتە خوارەوە.

لەدڵی خۆمدا گوتم "کورتەبنەکە!" دەستی ئەویش ساردبوو!

خۆم بە خۆمم دەگوت "بڵێیت ئەو کورتەبنە سەیرەی لە بەنزینخانەکەدا بینیمان، هەمان ئەو کورتەبنەیە بێت کە بەر لە 150 ساڵ لەمەوبەر هاتە سەر وشکانی و خۆی لەناو ئەمبارەکانی سەر بەندەری "مارسیلیا"دا ونکرد؟ بڵێیت هەر ئەو جۆکەرە بێت کە کاتی خۆی زەرەبینەکەی پێبەخشیم و رێگای کتێبە بچکۆلەکەی نیشاندام و دواتریش بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبە بەکارم دەهێنا؟"

"بڵێیت هەر ئەو جۆکەرە بێت کە لەپرێکدا لە شاری یاریەکەی "کۆمۆ" و لەسەر پردەکەی ڤێنیسیادا دەرکەوت؟ ئاخۆ هەر هەمان ئەو جۆکەرەش بێت کە لە پاپۆرەکەدا بینیم و دواتریش لە ئەسینادا و لە گۆڕەپانەکەی "سیونتاگما"دا سەرەتاتکێی لێ دەکردم؟"

بیرکردنەوەکانم تووڕەیانکردم و تەنانەت بینینی ئاسکریمە تواوەکەی سەر مێزەکەش بێزاری کردم.

تەماشایەکی چواردەوری خۆمم کرد، نەمدەویست بینینی ئەو کورتەبنەیە بچکۆلەیە لەوێشدا سەرم بسوڕمێنێت. بەڵام باوکمم بینی بەپەلە لە خواروی چێشتخانەکەوە بەرەورووم دەهات و لە هەموو ئەندێشەیەکی پچڕاندم.

هەر لە دوورەوە هەستمدەکرد کە بەلایەنی کەمەوە هێشتام هیوای دۆزینەوەی دایکمی تێدا ماوە.

نازانم بۆ بەڵام لەناکاودا خەیاڵم چووەوە سەر بللی "کوپ"، ئەو پێش ئەوەی بێتەوە بە کاغەزی یاری، لە شوێنێکەوە تەماشای دەریای دەکرد و شتێکی دەربارەی قەراغ ئاوێک باسکرد کە چەندەها ساڵ و چەندەها میل لەو قەراغ دەریایەوە دووربوو کە خۆی لێبوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



باوکم گەیشتە لام و یەکسەر گوتی؛
«پێی گوتم ئەم پاش نیوەڕۆیە لە چ شوێنێک دەبێت»
بەمەبەستەوە سەرێکم بۆ لەقاند. دەمزانی خەریکە دەگەینە کۆتایی ڕێگاکە و گوتم؛
«لەوانەیە ئێستاکە لە قەراغ ئاوێکدا وەستابێت و تەماشای دەریا بکات»
باوکم ڕێک لەبەردەممدا دانیشت و گوتی؛
«وایە، لەڕاستیدا ئەوە ڕێیتێدەچێت، بەڵام تۆ لە کوێوە ئەوە دەزانیت؟»
هەروا شانێکم بۆ هەڵتەکاند.
ئینجا باوکم گوتی "دایکت خەریکی چەند وێنەیەکە کە لەسەر قەراغ دەریاکانی "ئیجە"دا دەیگرێت". هەروەها گوتی ئەو شوێنە ناوی "کاپ سۆنیۆن"ە و پەنجا کیلۆمەترێک لە خواروی ئەسیناوەیە. دواتریش گوتی؛
«لەخواری خوارەوەی ئەو قەراغ ئاوەدا چەند پاشماوەیەکی گەورەی پەرستگای "پۆسیدۆن"ی لێ ماوەتەوە. "پۆسیدۆن" لە کاتی خۆیدا خودای دەریای یۆنانیەکان بووە. ئەوانیش دەیانەوێت چەند وێنەیەکی "ئەنیتا" لەبەردەم ئەو پەرستگایەدا بگرن»
منیش گوتم؛
«کورە گەنجەکەی وڵاتی دوور لەنزیک پەرستگا کۆنەکەوە چاوی بە ژنە جوانەکە دەکەوێت»
باوکم بە بێزاریەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی؛
«ئەم قسە قۆڕانە چیە کە تۆ دەیکەیت؟»
منیش لەوەڵامدا گوتم؛





«فالگرەوەکەی "دێلفی". خۆ تۆ خۆت ڕۆڵی "پیسیا"ت دەبینی!»
«ئۆوو... بەڵام ئێستاکە خەیاڵێکم هەر لای "ئەکرۆپۆلیس" بوو»
«وایە، بەڵام "ئەپۆلۆ" بیری لە شتێکی تر دەکردەوە»
بەدەنگێکی بەرز پێکەنی و نەمزانی بەتەواوەتی بیر لە چی دەکاتەوە. بەڵام لەدواجاردا دانی بەڕاستیەکەدا نا و گوتی؛
«وابزانم "پیسیا" لەڕادەبەدەر گێژبووە و قسەکانی خۆی بیرنەماوە»

زۆربەی ئەو شتانەی لەو سەفەرە دووردرێژەدا بەسەرمدا هات، دواتر هەروا بەئاسانی بیرم نەهاتەوە، بەڵام هەتاهەتایە ئەو ڕێگایەی "کاپ سۆنیۆن"م لە بیرناچێتەوە.
زۆر بەخێرایی بە ماشێنەکەمان بە تەنیشت شارە قەراغ دەریاییەکانی خواروی ئەسینادا تێپەڕین، بەردەوامیش دیمەنی ڕەنگە شینە ترسناکەکەی دەریای ناوەڕاستمان لەلای ڕاستەوەبوو.
هەرچەندە من و باوکم خەیاڵمان هەر لەلای بینینەوەی دایکم بوو و بیرمان لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوکم دەیویست باسی شتی جۆراوجۆری ترم بۆ بکات. وابزانم نەیدەویست هەروا بەهیچە ئومێدەوارم بکات. دواتر دەربارەی سەفەرەکەمان پرسیاری لێکردم و دەیویست بزانێت کە کاتێکی خۆشم بردۆتە سەر یان نا. پاشانیش گوتی؛
«لەڕاستیدا زۆرم حەزدەکرد بتبەم بۆ "کاپ هۆرن" و ئەو ناوە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەتوانیت "کاپ سۆنیۆن" ببینیت»
ڕێگاکەمان درێژەی کێشا و باوکم ویستی بۆ جگەرە کێشان بوەستێت. لە شوێنێکی پانتایی چیایەکی سەختدا لایدا و لەوێوە دیمەنی ناوچەیەکی بەتاڵ و دەریایەکی تورەمان لێوە دیاربوو. لەسەر



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

تاشەبەردێکی خواروی شاخەکەوە یەک دوو ئافرەتی شێوە حۆری وەک سەگی ئاوی تەمبەڵ پاڵکەوتبوون.
شینی و ڕوونی ئاوی دەریاکە خەریکبوو ئاو بەچاومدا بێنێتە خوارەوە.
من لەو بڕوایەدابووم هەتا بیست مەترێکی ژێر ئاوەکە دیاربێت، بەڵام باوکم پێیوابوو تەنها هەشت بۆ دە مەترێکی دیاربێت.
لەوەندە زیاتر هیچ شتێکی تری وامان باسنەکرد. وابزانم ئەوە بێدەنگترین وەستانی هەموو سەفەرەکەمان بوو.
هێشتام هەرزۆر زۆرمان مابوو کە بگەینە جێ و لەدوورەوە پەرستگا گەورەکەی "پۆسیدۆن" دەرکەوت، بەلای ڕاستمانەوە لەسەر بەرزاییەکی قەراغ دەریا قوتبووبووەوە.
لەوێدا باوکم گوتی؛
«تۆ لە چ بڕوایەکدایت؟»
«مەبەستت لەدایکمە و دەتەوێت بزانیت پێم وایە لەوێدا بێت یان نا؟»
«بەڵێ ئەوەش و دوای ئەوەش چۆنی دەبینیت؟»
منیش گوتم؛
«دەزانم کە دایکم لەوێدایە، وە دەشزانم کە لەگەڵماندا دەگەڕێتەوە نەرویج»
باوکم پێکەنی.
«هەروا ئاسان نیە هانس تۆماس. خۆ هەر هیچ نەبێت ئەوەندە تێدەگەیت. هەشت ساڵە دایکت ئێمەی بەجێهێشتووە، من پێم وانیە هەروا بەئاسانی لەگەڵماندا بگەڕێتەوە»
پاش قسەکانی ئەو گوتم؛
«هیچ چارەیەکی تری لەبەردەستدا نیە»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

پاش چارەکێک گەیشتینە لای پەرستگا گەورەکە و ماشێنەکەمان لە خوارووییەوە ڕاگرت، بە درێژایی ئەو ماوەیە هیچمان تەنانەت وشەیەکیشمان لەدەم نەهاتە دەرەوە.
بەناو دوو پاسی گەشتوگوزاریدا و چل بۆ پەنجا ئیتاڵیەکدا ڕێگەی خۆمان کردەوە. دواتریش ناچاربووین دوو سەد دراخمایەک بدەین بۆ ئەوەی ناوچەی پەرستگاکەمان نیشانبدەن. لەوکاتەدا کە بەپەلە خۆمان گەیاندە ناو پانتاییەکەوە، باوکم شانەیەکی دەرهێنا و کڵاوە هاوینیە ناشیرینەکەی داکەند کە لە "دێڵفی" کڕیبووی.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



**سێی کوپ**

**...ئافرەتێکی ڕازاوەمان بینی کڵاوێکی گەورەی جوانی لەسەردابوو...**

دوای ئەوە هەموو شتێک زۆر بە خێرایی ڕوویدا، تا ئێستاکەش بەتەواوەتی نازانم لەو کاتانەدا هەستم بە چی دەکرد.
لەوسەری پانتاییەکەوە باوکم چاوی چووە سەر یەک دوو فۆتۆگراف و چەند کەسێک. بەئاشکرا دیاربوو کە کەسانێکی وانەبوون کە بۆ گەشتوگوزاری هاتبن. کە گەیشتینە لایان ئافرەتێکی ڕازاوەمان بینی کڵاوێکی گەورەی جوانی لەسەردابوو، چاویلکەیەکی تاریکی خۆری لەچاودابوو و ماکسیەکی زەردباوی وەک ڕەنگی گوڵەباخی زەردی لەبەردابوو. هەمووان تەماشای ئەویان دەکرد.
باوکم گوتی؛
«ئەوە خۆیەتی»
باوکم هەروەک پەیکەرێک لە شوێنی خۆیدا چەقی، بەڵام من یەکسەر بەرەو ڕووی ڕۆیشتم، پاش کەمێک باوکیشم دوامکەوت.
لەوێدا بەدەنگێکی بەرز گوتم؛
«ئیدی ناچارن پشوویەک بدەن و واز لە وێنەگرتن بهێنن»
ڕێک بەدوای قسەکانمدا هەردوو وێنەگرەکە ئاوڕیان دایەوە، هەرچەندە لە هیچ وشەیەکی قسەکانیشم تێنەگەیشتن.
بیرمدێت لەو کاتەدا کەمێک تووڕەبووم، چونکە پێمناخۆشبوو کۆمەڵێک وێنەگر بەئارەزووی خۆیان لە هەموو گۆشەیەکەوە وێنەی دایکم دەگرن و ئێمەش بۆ ماوەی هەشت ساڵێک دەبوو کە نەمانبینیبوو.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

ئەوجا لەو کاتەدا دایکم وەک پەیکەرێک لە شوێنی خۆیدا چەقی. چاویلکە خۆرییەکەی داکەند، دە بۆ پانزە مەترێک لێمانەوە دووربوو. لەپێشدا تەماشایەکی باوکمی کرد و دواتر تەماشایەکی منی کردەوە. واقیوڕمابوو، منیش لەو کاتەدا بوارێکی باشم کەوتە بەردەست و بەئارەزووی خۆم بیرمکردەوە.
بەر لەهەموو شتێک ئەو ڕاستیەم بەخەیاڵدا هات کە من نایناسم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی کە دایکی منە و ئەوەش شتێکە کە هەموو منداڵێک یەکسەر دەیبینێت. لە هەمان کاتیشدا شێوەیم زۆر زۆر بەلاوە جوانبوو.
هەموو ئەو شتانەی کە دواتر ڕوویاندا دەتگوت فلیمێکە و بەخاوی لێدەدرێت. ڕاستە باوکم لە پێش مندا دایکمی ناسیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو یەکەمجار بەرەوڕووی من ڕایکرد. بۆ چەند ساتێکی کەم بەزەییم بە باوکمدا دەهاتەوە، چونکە لەوە دەچوو کە دایکم تەنها منی بەلاوە مەبەست بێت.
لەو کاتەدا کە گەیشتە لام، کڵاوە جوانەکەی فڕێدا و ویستی بەرزمبکاتەوە، بەڵام نەیتوانی... ئێ خۆ لەماوەی ئەو هەشت ساڵەدا تەنها لە یۆناندا شت ڕوویندابوو، منیش لەو ماوەیەدا گەورەتربووبوم.
هەردوو دەستی لەملمەوە ئاڵاند و باوەشکێ توندی پێداکردم.
لەیادمە لەو کاتەدا یەکسەر بۆنی لەشیم بیرکەوتەوە و زۆر دڵخۆشی کردم، من چەند ساڵێکبوو ئەو هەستە خۆشەم نەبوو. وەک ئەوە نەبوو کە شتێکی خۆش بخۆیت یان شتێکی خۆش بخۆیتەوە، چونکە ئەو خۆشیانە تەنها لەدەمدا هەستیپێدەکەیت، بەڵام من لە هەموو لەشمدا هەستم بە جۆش و خرۆشێکی ئاسوودەیی دەکرد.
یەک دوو هەناسەی قوڵی هەڵکێشا و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«هانس تۆماس»
هەر ئەو دوو وشەیەی گوت و ئیدی دایە پرمەی گریان، هیچی تری بەدەمدا نەهاتە دەرەوە.
ئەو کاتەی کە سەری بەرزکردەوە، ئینجا باوکم هاتە پێشەوە. یەک دوو هەنگاوێک بەرەو رووماں هات و گوتی؛
«بەو مەبەستە بە هەموو ئەوروپادا سەفەرمان کردووە کە تۆ بدۆزینەوە»
رێک لەدوای قسەکانی، دایکم دەستی کردە ملی و دیسانەوە کەوتەوە گریان.
تەنها وێنەگرەکان تەماشای ئەو دیمەنە کاریگەرەیان نەدەکرد، بەڵکو چەندەها خەڵکی تری ئەو ناوەش سەیریان دەکردین، بەڵام هیچیان نەیاندەزانی کە سازکردنی ئەو چاوپێکەوتنە دوو سەد ساڵێکی پێچووە.
پاشئەوەی ژیربووەوە، دیسانەوە وەک ئافرەتێکی مۆدێل رۆڵی بینیەوە. ئاورێکی لە وێنەگرەکان دایەوە و بەدەنگی بەرز بە زمانی یۆنانی چەند شتێکی پێگوتن. ئەوانیش شانێکیان بۆ هەڵتەکاند و وەڵامیان دایەوە، دایکم بە قسەکانیان زۆر تورەبوو. بەهەرحاڵ بەرلەوەی برۆن شەڕەقسەیەکی تووندوتیژیان لەگەڵ دایکمدا کرد. هەموو شتەکانیان کۆکردەوە و لەناوچەی پەرستگاکەدا ونبوون. بەرلەوەی برۆن یەکێکیان کڵاوە جوانەکەی دایکمی لەسەر عەردەکە هەڵگرتەوە و لەگەڵ خۆیدا بردی. لەو کاتەشدا کە گەیشتنە بەردەمی پەرستگاکە، یەکێکیان ئاماژەی بۆ کاتژمێرەکەی کرد و بەدەنگی بەرز چەند وشەیەکی رەق و تەقی بە یۆنانی گوت.



دواتر هەر سێکمان بەتەنها ماینەوە، بەڵام شەرممان لەیەکتریدەکرد و لەڕاستیدا نەماندەزانی چی بکەین و باسی چ شتێک بۆ یەکتری بکەین. تاڕادەیەک ئاسانە لەپاش چەند ساڵێک کەسێک ببینیتەوە، بەڵام پاش ئەوەی ترس و سامی ئەو پێکگەیشتنە دەرەوێتەوە، ئیدی پێکەوەبوون سەختتریک دەبێت.
خۆر هێدی هێدی ئاوادەبوو، هەر لەو کاتەدا گەیشتبووە ئەو دیوی دیواری پەرستگا دێرینەکەی "پۆسیدیۆن"ەوە. سێبەری پایەکانی دیوارە تەنها و بچکۆلەکەی پەرستگاکە بە درێژی لەسەر پانتایی ئەو ناوەدا دەبینرا. هەر لەوێدا شێوەی "کوپ"ێکی سوورم لە خواری خوارەوەی لای چەپی کراسەکەی دایکمدا بینی، بەڵام بە هیچ شێوەیەک سەری نەسوڕماندم.
نازانم چەند جار بەچواردەوری ئەو پەرستگایەدا خولاینەوە، بەڵام هێندە تێگەیشتم کە تەنها من و دایکم پێویستمان بە کات نەبوو بۆ ئەوەی دیسانەوە یەکتر بناسینەوە. لەڕاستیدا باوکیشم وەک دەریاوانێکی کۆنی شاری "ئارەندال" نەیدەتوانی زمانێکی گونجاو بدۆزێتەوە و بەشێوەیەکی رێکوپێک لەگەڵ ئافرەتێکی مۆدێلدا قسەبکات کە ئەو هەموو ساڵە لە یۆناندا بووە و بە زمانێکی یۆنانی رەوان قسەی دەکرد. بێگومان ئەو کارە بەلای ئافرەتە مۆدێلەکەشەوە هەروا ئاسان نەبوو. بەهەرحاڵ دایکم باسی خواکانی دەریای پەرستگاکەی دەکرد و باوکیشم باسی دەریای دەکرد. باسی ئەو کاتەی بۆ دەگێڕایەوە کە چەند ساڵێک لەوەوبەر بەلای "کاپ سۆنیۆن"دا بەپاپۆڕ بەرەو شاری ئەستەمبوڵ تێپەڕیوە.
خۆر گەیشتە ئاسۆ و بەشە جیاکانی پەرستگا دێرینەکە جوانتر دەرکەوت، لەو کاتەدا ئیدی هێواش هێواش بەرەو شوێنی چوونەدەرەوە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

کەوتینە ڕێ. بەرلەوەی بگەینە دەرەوە، بۆ چەند خولەکێک من کەمێک لەدوایانەوە دەڕۆیشتم. نەمدەزانی ئەو چاوپێکەوتنە تەنها ماوەیەکی کەم دەخایەنێت و تەواودەبێت، یاخود کۆتایی بە جیابوونەوەیەکی دوورودرێژ دەهێنێت، لەدڵی خۆمدا دەمگوت خۆ هەموو بڕیارێک لەدەستی ئەو دوو کەسە گەورەیەدایە و ئەوان لەیەکدی جودابوونەتەوە.

لە هەموو بارێکدا دەبوایە دایکم هەتا ئەسینا لەگەڵماندا سەرکەوتایە، چونکە وێنەگرەکانی بەجێیان هێشتبوو و چاوەڕوانیان نەکردبوو. باوکم بەشێوەیەک دەرگای "فیات"ەکەی کردەوە، هەر دەتگوت "ڕۆڵس ڕۆیس"ە و دایکیشم بەشێوەی ژنە سەرۆکێک یان کەسێکی گرنگی لەو بابەتە سەرکەوت.

بەرلەوەی باوکم گێڕی ماشێنەکەی بگۆڕێت، هەر سێکمان بەیەکەوە قسەماندەکرد. دواتریش بەرەو ئەسینا کەوتینە ڕێ. هەر لەدوای یەکەمین شارەوە، منیان وەک بەڕێوەبەری کۆبوونەوەکە هەڵبژارد، ئیدی من بڕیارمەدەدا چ کەسێک قسەبکات.

لە ئەسینادا ماشێنەکەمان لەگەراجی ئوتێلەکەدا دانا و ڕۆیشتینە ناو گۆڕەپانی بەردەم ئوتێلەکە. لەوێدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە بێدەنگی ماینەوە و هیچمان قسەمان نەدەکرد.

لەڕاستیدا لەو کاتەوەی کە پەرستگا کۆنەکەمان بەجێهێشت، هەر سێکمان بەردەوام قسەمان دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکمان دەربارەی هەقیقەتی خۆمان باسنەکرد.

لەدواجاردا من ئەو بێدەنگیە ناخۆشەم شکاند و گوتم؛



«پێم وابێت ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە کە کەمێک بیر لە پاشەڕۆژ بکەینەوە و چەند پلانێکی بۆ دابڕێژین»

دایکم دەستێکی خستە سەر شانم و باوکیشم چەند قسەیەکی قۆڕی باسکرد و گوتی با واز لە شتەکان بهێنین خۆیان بۆ خۆیان یەک بەدوای یەکدا ڕووبدەن.

پاش دونیایەک ئەم سەرو ئەوسەر لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین کە هەموومان بچینە سەرەوە و شتێکی سارد و خۆش بە بۆنەی یەکتر بینینمانەوە بخۆینەوە. باوکم داوای لە بۆیەکە کرد کە دوو ساردی بۆ من و خۆی بهێنێت و لە هەمان کاتیشدا داوای گرانترین شەمپانیای بۆ دایکم کرد.

بۆیەکە بە بێزاریەکەوە سەرێکی بۆ خوراند و گوتی؛

«لەپێشدا ئەم دوو پیاوە بە ئارەزووی خۆیان دەخۆنەوە و ڕادەبوێرن، دواتریش هێواش دەبنەوە. ئەم ئێوارەیەش لەوە دەچێت ئێوارەی ئافرەتان بێت، وایە؟»

کەس وەڵامی نەدایەوە و بۆیەکە داواکاریەکانی نووسی، پاش ئەوەش دەستێکی بۆ بارەکە ڕاوەشاند. دایکم بەتەواوەتی لە بابەتەکە تێنەدەگەیشت، لەبەرئەوە بە سەرسوڕمانێکەوە تەماشای باوکمی دەکرد. دواتریش هەستمکرد لەو کاتەدا بەتەواوەتی سەریسوڕما کە باوکم وەک "جۆکەرێک" ڕێک تەماشای کردم.

بۆ ماوەی کاتژمێرێک باسی شتی جۆراوجۆرمانکرد، بەڵام کەسمان نەمانوێرا باسی ئەو بابەتە سەرەکیە بکەین کە بیرمان لێدەکردەوە. دواتر دایکم داوای لێکردم کە بەجێیان بهێڵم و بڕۆمەوە ژووری ئوتێلەکە و بخەوم. هەشت ساڵبوو بەجێیهێشتبووم، کەچی بەو شێوەیە دەیویست بەشداری پەروەدەکردنی منداڵەکەی بکات.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

باوکم تەماشایەکی کردم و یەکسەر بەچاویا زانیم کە دەیەوێت بڵێت "بەقسەی دایکت بکە"، لەوێدا یەکسەر بۆمدەرکەوت کە بەهۆی منەوە ناتوانن قسەبکەن. هەستمکرد پێویستیان بەوەیە کە کەمێک بەتەنها بۆ خۆیان پێکەوە قسەبکەن. ئەوان لەیەکتر جودابووبوونەوە، بەڵام من لەو ناوەدا هەموو شتێکم لێ ئاڵۆزکردبوون.

باوەشێکی توندم بەدایکماکرد و ڕێک لەوێدا چرپاندی بە گوێمدا و گوتی "بەیانی دەتبەم بۆ نایابترین دوکانی شیرینی هەموو شارەکە". لەدڵی خۆمدا گوتم "کەواتە هەر ئێستاوە هەندێ نهێنیمان پێکەوە هەیە".

خۆم ئامادەکرد بۆ ناو جێگا و چاوەڕوانی باوکمم دەکرد، بەڵام دیسانەوە کتێبە بچکۆلەکەم دەرهێنایەوە و کەوتمەوە خوێندنەوە. هێندەم نەمابوو تەواوی بکەم.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

چواری کوپ

...نازانین کێ کاغەزەکان دابەشدەکات...

"هانس"ی نانەوا هەروا دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە بنمیچی ژورەکە. لەو کاتەدا کە باسی دوورگە خەیاڵیەکەی بۆ دەکردم، چاوە شینەکانی وەک پشکۆیەکی جوان بریسکەیەکی تایبەتی تێدابوو، بەڵام دواتر وەک پشکۆیەکی کوژاوە دەهاتنە بەرچاوم.

نیوەشەوبوو و ژوورەکە بەتەواوەتی تاریکبوو بوو. ئەو ئاگردانەش کە سەرلە ئێوارە ئەو هەموو پشکۆیەی تێدا دەدرەوشایەوە، تەنها کەمێک ڕووناکی لە پشکۆکانیەوە دیاربوون. "هانس"ی نانەوا هەستایە سەرپێ و بە مقاشێک پشکۆکانی ئەمدیودیو کرد. بۆ ماوەیەکی کەم ئاگرەکە گەشایەوە و ڕووناکی خستە سەر شوشەی ماسی و شتە سەیروسەمەرەکانی تری ژورە بچکۆلەکە.

من بەدرێژایی ئەو شەوە هەر دانیشتبووم و بە سەرنجەوە گوێم بۆ هەموو تاکە وشەیەکی ئەو نانەوا پیرە شلکردبوو. هەر لەو کاتەوە کە کەوتە باسکردنی یاری کاغەزەکانی "فرۆد"، واقم وڕمابوو و ئاگام لە هەناسەی سنگی خۆم نەبوو. چەند جارێکیش هەستمکرد دەمم داپچڕیبوو، بەڵام نەموێرا قسەکانی پێبڕم. ڕاستە تەنها یەک کەڕەت باسی فرۆد و دوورگە خەیاڵیەکەی بۆ گێڕامەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیام هەموو ئەو وشانەم لەیادە کە لە دەمیەوە هاتنە دەرەوە.

پاش ماوەیەک کۆتایی بە قسەکانی هێنا و گوتی؛

«بەو جۆرەش "فرۆد" بە شێوەیەک لە شێوەکان گەڕایەوە بۆ ئەوروپا»

نەمدەزانی ڕووی قسەکەی لە من کرد یان لە خۆی، بەڵام بەدڵنیاییەوە لە مەبەستی تێنەگەیشتم، لەبەرئەوە گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«مەبەستت لە کاغەی یاریەکانەکە؟»
«بەڵێ، ئەوانیش هەروەها»
«ئەو کاغەزانە بوون کە لەناو بۆشایی سەقفەکەدا بوون؟»
پیاوە پیرەکە سەرێکی بۆ لەقاندم و خۆی کرد بە ژوری نووستنەکەدا.
پاش ماوەیەک گەڕایەوە و قوتیلکە بچکۆلەکەی بەدەستەوەبوو؛
«ئەلبێرت... ئا ئەمە کاغەزەکانی "فرۆد"ە»
کاغەزەکانی خستە سەر مێزەکەی بەردەمم، منیش دەستم دایە قوتیلکەکە و کاغەزەکانم دەرهێنا. دواتریش لەسەر مێزەکە دامنایەوە، لەو کاتەدا هەستمکرد دڵم خێراتر لێدەدات. "چواری کوپ" لەسەری سەرەوەی دەستەکەدابوو. بەهێواشی کاغەزەکانم هەڵدایەوە و یەکە یەکە لێیان وردبوومەوە. وێنەکانی سەر کاغەزەکان بەتەواوەتی سوابوون، نەمدەزانی لە بنەڕەتدا چ وێنەیەکیان لەسەر بووە. بەڵام هەندێکیان بەڕوونی دیاربوون، بەئاسانی توانیم "کوڕی دینار" و "پاشای قەرە" و "دووی سینەک" و "بللی کوپ" جیابکەمەوە.
پاش نەختێک گوتم؛
«ئەم کاغەزانە بوون... کە بەسەر دوورگەکەدا دەهاتن و دەچوون؟»
پیاوە پیرەکە دیسانەوە سەری بۆ لەقاندمەوە.
هەستێکی سەیرم هەبوو... هەر کاغەزێکم دەگرت بەدەستەوە، بەلامەوە هەروەک کەسێکی زیندوو وابوو. پاشای "کوپ"م خستە بەر ڕووناکی ئاگردانەکە و یەکسەر ئەو قسەیەم بیرکەوتەوە کە ئەو کاتی خۆی لەسەر دوورگە سەیرەکەدا گوتی. لەدڵی خۆمدا گوتم کاتی خۆی ئا ئەمە کورتەبنەیەکی پڕژیان بووە و لەژێر ئاسمانێکی شیندا ژیاوە. کاتی خۆی لەنێو گوڵ و درەختەکانی باخچە گەورەکەدا هات و چۆی





کردووە. "بللی کوپ"م خستە لەپی دەستمەوە و بۆ ماوەیەک هەر سەیرم دەکرد. لەیادمە کە گوتی "من سەر بەم کاغەزانە نیم".
هەموو کاغەزەکانم بژارد، 52 دانە بوون. پاشان گوتم؛
«تەنها جۆکەری تێدا نیە»
"هانس"ی ی نانەوە سەرێکی بۆ لەقاندمەوە و گوتی؛
«ئەو لەگەڵ مندا هاتە ناو یاری کاغەزە گەورەکەوە. لە مەبەستم تێدەگەیت کوڕەکەم؟ ئێمەش هەروەک ئەوان کۆمەڵێک کورتەبنەی پڕ لە ژیانین و لەژێر ئاسمانێکی شیندا دەژین، بەڵام نازانین کێ کاغەزەکان دابەشدەکات»
«تۆ لەو بڕوایەدایت هێشتام هەر لەم جیهانەدا بێت؟»
«بەدڵنیاییەوە کوڕکەم، هیچ شتێک ناتوانێت زیان بە جۆکەر بگەیەنێت»
"هانس"ی نانەوا پشتی کردە ئاگردانەکە و لە پرێکدا سێبەرێکی گەورەم بەسەردا کشا. بۆ ساتێک ترسم لێ نیشت. من ئەو کاتە تەنها دوانزە سڵان بووم. ئەو شەوە تا درەنگانێک لەلای "هانس"ی نانەوا مامەوە، لەدڵی خۆمدا دەمگوت لەوانەیە ئێستاکە باوکم لە ماڵەوە بێت و زۆر تورەبێت لێم. بەڵام لەڕاستیدا ئەو تەنها لەو کاتانەدا چاوەڕوانم دەبوو کە ئاگای لە خۆی دەبوو. خۆم بە خۆمم گوت "خوا دەزانێ ئێستاکە لە چ شوێنێکی لادێکەدا بە مەستی خەوتووە". بەو شێوەیەش لەم ژیانە گەورەیەدا تەنها "هانس"ی نانەوام شکدەبرد کە پشتی پێببەستم.
لەوەڵامدا گوتم؛
«کەواتە دەبێت ئێستاکە پیاوێکی یەکجار پیر بێت»
"هانس"ی نانەوا زۆر بە توندی سەری بەملاولادا ڕاوەشاند و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



«لەبیرت چووەوە؟ جۆکەر وەک ئێمە پیر نابێت»
لەوێدا لێم پرسی؛
«تۆ خۆت بینیوتە، مەبەستم لەوەیە پاش ئەوەی کە گەڕانەوە بۆ ئەوروپا؟»
"هانس" ی نانەوا یەک کەڕەت سەری بۆ لەقاندم و گوتی؛
«یەک جار... لەڕاستیدا شەش مانگێک لەمەوبەر بینیم. بۆ ماوەیەکی کەم لەشولارە بچکۆلەکەیم بینی لەبەردەم نانەواخانەکەدا دەهات و دەچوو. بەپەلە ڕامکردە دەرەوە بەڵام نەمبینی، دەتگوت زەوی قووتی داوە. ئەلبێرت، هەر لەوێدابوو کە تۆ هاتیتە ناو ئەم چیرۆکەوە. ڕێک ئەو پاشنیوەڕۆیەبوو کە لە کوڕەکانم دا، بیرت دێت؟... ئەو کوڕانەی کە ئازاریان دەدایت. ئەو ڕۆژە... ئەو ڕۆژە **52** ساڵی ڕەبەق بەسەر ونبوونی دوورگەکەی "فرۆد"دا تێپەڕیبوو. چەندەها جار ژماردومەتەوە... بەتەواوەتی دڵنیام لەوەی کە لە ڕۆژی جۆکەردابوو...»
چاوم تێبڕیبوو و بەسەرسامیەوە تەماشام دەکرد، پاش ماوەیەک گوتم؛
«هێشتام ساڵنامە کۆنەکە هەر بەردەوامە؟»
«لەوە دەچێت هێشتام هەر بەردەوامبێت، کوڕەکەم. هەر لەو ڕۆژەشدا زانیم کە تۆ ئەو کوڕە بێدەرەتانەیت کە دایکی بەنەخۆشی مردووە. هەر لەبەرئەوەش ڕێگەم بەخۆمدا خواردنەوە بریقەدارەکەت بدەمێ و ماسیە جوانەکانیشت نیشانبدەم...»
لەشوێنی خۆمدا وشکبووبووم. تەنها لەو کاتەدا بۆمدەرکەوت کە هەندێک لە قسەکانی کورتەبنەکان کە لە ئاهەنگی جۆکەرەکەدا وتیان، دەربارەی منیش بوو.
کەمێک سەرم دانەواند و گوتم؛





«بە چ شێوەیەک... ئەو حەکایەتە بە چ شێوەیەک بەردەوامبوو؟»
«خۆ من هەموو شتێکی ئەو دوورگە خەیاڵیەم لەیاد نیە. ئێمەی مرۆڤ بەو شێوەیەین؛ هەموو ئەو شتانەی کە گوێمان لێدەبێت لە ئاگایماندا دەمێننەوە، بەڵام مەرج نیە هەموویمان بیربێتەوە. دواتریش ڕوودەدات لە پڕێکدا سەرهەڵبدەنەوە و دیسانەوە بێنە دەرەوە. هەر ئا ئێستاکەش، لەپاش ئەوەی هەموو ئەو شتانەی دوورگە خەیاڵیەکەم بۆ گێڕایتەوە کە لەیادمبوون، قسەکەی "چواری کوپ"م بیرکەوتەوە. پاش ئەوەی کە چواری دینار گوتی "نانەواکە خواردنەوەیەکی پرشنگداری دەداتێ و ماسیە جوانەکانی پیشان دەدات"...»
«ئێ، ئەی ئەو گوتی چی؟»
لەوێدا "هانس"ی نانەوا گوتی؛
«کوڕەکە پیردەبێت و سەری سپی دەبێت، بەڵام بەرلەوەی بمرێت سەربازێکی بەدبەخت لەوڵاتی باکورەوە ڕووی تێدەکات»
هەروا دانیشتبووم و زۆر بە قووڵی تەماشای ئاگردانەکەم دەکرد. زۆر بە ڕێزەوە لە ژیانم دەڕوانی، تا ئێستاکەش ئەو هەستەم هەر لەگەڵدایە. تەنها یەک ڕستە سەرتاپای هەموو ژیانمی پێکا. زانیم کە "هانس"ی نانەوا هێندەی نەماوە کە بمرێت و منیش دەبمە نانەوای داهاتووی شاری دۆرف. هێندەش تێگەیشتم کە دەبێت من نهێنی خواردنەوە ئەرخەوانیەکە و دوورگە خەیاڵیەکە بپارێزم. دەشبوایە لەو کوخەدا کە تێیدا دانیشتبووم هەموو ژیانم بەسەر ببردایە. لەوێدا دەبوایە ئاگام لە ماسیە پرتەقاڵیەکانی دوورگە خەیاڵیەکە ببوایە و فێری بەخێوکردنیان بومایە. ڕۆژێکیش ـڕۆژێک لە ڕۆژانیش سەربازێکی بەدبەخت لە وڵاتی باکورەوە ڕووم تێدەکات. ئەوەندەشم بۆ ڕوون بووەوە کە ئەوە هێشتام زۆر زۆری ماوە ڕووبدات. زانیم کە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



52 ساڵی تر تێدەپەڕێت و ئەوجا نانەوای نوێی دۆرف لە ئاواییەکەدا دەردەکەوێت.

لەپڕێکدا "هانس"ی نانەوا گوتی؛

«ماسیە پرتەقاڵیەکانیش زنجیرە خزمایەتیەکی دوورودرێژیان دروستکردووە و دەگەڕێنەوە سەر ئەو ماسیانەی کە کاتی خۆی لە دوورگەکەوە هێنامن. هەندێکیان تەنها چەند مانگێک دەژین، بەڵام زۆربەیان چەندین ساڵ دەمێننەوە. زۆرم پێناخۆشە کە لەپڕێکدا یەکێکیان چیتر لە شوشەکەدا مەلەناکات و دەمرێت، چونکە هیچ یەکێکیان بەتەواوەتی لەوانی تر ناچێت. ئەوەش نهێنی ماسیە پرتەقاڵیەکانە ئەلبێرت، تەنانەت ماسیەکی بچکۆلەش کەسایەتیەک و بوونێکی تایبەتی خۆی هەیە کە جێگەی پڕناکرێتەوە. هەر لەبەرئەوەشە کە لەژێر چەند دارێکی ناو دارستانەکەی سەرەوەدا دەیاننێژم. لەسەر قەبرە ئارامەکانیشیان بەردێکی بچکۆڵەی سپی دادنێم، چونکە بەبڕوای من هەر ماسیەکی پرتەقاڵی ئەوەندە دەهێنێت کە بۆ یادگاری شتێکی وای لەسەر دابنرێت کە زیاتر لە ژیانە کورتەکەی خۆیان بمێنێتەوە»

تەنها ساڵێک لەدوای ئەوەی "هانس"ی نانەوا باسی دوورگە خەیاڵیەکەی بۆ گێڕامەوە، مرد. ساڵی پێش ئەوەش باوکم مرد. بەڵام "هانس"ی نانەوە فریای ئەوە کەوت کە هەڵمبگرێتەوە، بەو شێوەیەش هەموو موڵک و سامانێکی بەناوی منەوە مایەوە. من ئەو پیاوە پیرەم لەڕادە بەدەر خۆشدەویست، ئێستاکەش دواهەمین ڕستەیم لەیادە کە گوتی؛

«سەربازەکە ئاگای لەوە نیە کە ئەو کچەی بۆ ئەتک سەری دەتاشن، کوڕێکی جوانی دەبێت»





یەکسەر زانیم کە ئەوەش یەکێک بووە لەو ڕستانەی کە لە یاری جۆکەرەکەدا گوتراوە و لە پڕێکدا لەکاتی سەرەمەرگیدا بیری کەوتۆتەوە.

لەو کاتەدا کە باوکم نیوە شەو خۆی کردەوە بە ژوری ئوتێلەکەدا، من ڕاکشابووم و چاوم بڕیبووە کتێبە بچکۆلەکە. بەرلەوەی بەتەواوەتی بێتە ژورەوە گوتم؛

«لەگەڵماندا دەگەڕێتەوە بۆ ئارەنداڵ؟»

ئەویش گوتی؛

«بابزانین چۆن دەبێت»

زەردەخەنەیەکی پڕ لە نهێنیم لەسەر دەموچاوی بینی. منیش هەر بۆ دڵنیایی خۆم گوتم؛

«بەڵام سبەینێ من و دایکم سەردانی دووکانێکی شیرینی دەکەین»

باوکم سەرێکی بۆ لەقاندم و گوتی؛

«کاتژمێری یانزەی بەیانی لە هۆڵی پێشوازی خوارەوەدا دەبێت و لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین کە هەموو چاوپێکەوتنەکانی تری وەلاوە بنێت»

ئەو شەوە بەرلەوەی خەومان لێبکەوێت، منیش و باوکیشم بۆ ماوەیەک هەر ڕاکشابووین و تەماشای سەقفەکەمان دەکرد. دواتریش نازانم باوکم لەگەڵ مندا قسەی دەکرد یان خۆی، بەڵام گوتی؛

«ناتوانین هەروا بەئاسانی ئاراستەی بەلەمێک لەناو دەریادا هەڵبگێرینەوە»

منیش لەوەڵامیدا گوتم؛

«ڕێیتێدەچێت... چونکە چارەنووس لەگەڵماندایە»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



## پێنجی کوپ

**...لەوێدا دەبوایە خۆمم هێمن ڕابگرتایە و هەروا پێش وەخت پاداشتم نەبەخشیبایە...**

بۆ ڕۆژی دواتر کە خەبەرمبووەوە، یەکسەر ویستم تەواوی قسەکانی "هانس"ی نانەوام بیربکەوێتەوە کە بەرلەمردنی گوتی و باسی ئەو کچەی دەکرد کە بۆ ئەتک سەریان تاشیبوو. بەڵام پاش نەختێک باوکم لە جێگاکەیدا کەوتە جوڵەجوڵ و ئیدی ڕۆژێکی نوێ دەستیپێکرد.
پاش ئەوەی نانی بەیانیمان خوارد، لە هۆڵی پێشوازیەکەدا چاومان بەدایکم کەوت. ئیدی ئەو جارەیان دەبوایە باوکم بڕۆشتایەتەوە سەرەوە، چونکە دایکم سوربوو لەسەرئەوەی بەتەنها بمباتە دوکانی شیرینیەکەوە. لەسەرئەوەش ڕێک کەوتین کە باوکم پاش یەک دوو سەعاتێک لەوێدا بمانبینێت.
لەو کاتەدا کە باوکمان بەجێهێشت، بەمەبەستەوە چاوێکم لێداگرت. ویستم بەچاوم پێی بڵێم کە تا ئەو پەڕی توانا هەوڵدەدەم دایکم بهێنمەوە سەر بار.
گەیشتینە دوکانەکە و داوای چەند شیرنیەکمان کرد، دایکم زۆر بە قووڵی تەماشای ناو چاوی دەکردم و گوتی؛
«هانس تۆماس، بێگومان تۆ لەوە تێناگەیت کە بۆچی من کاتی خۆی بەجێمهێشتن؟»
نەمویست لەو باسەدا بەبێ لایەن بمێنمەوە، لەبەرئەوە گوتم؛
«مەبەستت لەوەیە کە خۆت لەوە تێدەگەیت؟»
دانی بەڕاستیەکەدا نا و گوتی؛
«لەوانەیە منیش بەتەواوەتی لەوە تێنەگەم...»





بەڵام نیوە دانپیانانێک بەلای منەوە بەس نەبوو، هەربۆیە گوتم؛
«هیچ کەسێک نیە لەوە تێبگات؛ بۆچی ئافرەتێک هەروا بەئاسانی جانتاکەی کۆدەکاتەوە و مێرد و منداڵی خۆی بەجێدەهێڵێت، وە بەبێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێک بەدوای خۆیدا جێبهێڵێت، هەڵبەتە جگە لە چەند وێنەیەکی ناو گۆڤارێکی مۆدە»
لەوێدا قاوە و ساردی و قاپێکی گەورەی پڕ لە شیرینی و کێکی خۆش خرایە سەر مێزەکەمان، بەڵام من زۆر بەڕاشکاوی لەسەر قسەکانم بەردەوامبووم؛
«تۆ ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەقە کورەکەتت جێهێشتوە و تەنانەت پۆستکارتێکیشت بۆ نەناردووە، ئەگەر خۆت لەو بڕوایەدایت کە لەو حاڵەتە تێدەگەیت، ئەوا هەر ئێستاکە بەتەنها بەدیار قاوەکەتەوە بەجێت دەهێڵم»
چاویلکە خۆریەکەی داکەند و بەدەستی چاوەکانی سڕی. من هیچ فرمێسکێکم نەبینی بە چاوەکانیدا بێنە خوارەوە، وابزانم هەروا لەبەر دڵی من دەیویست بەزۆر یەک دوو فرمێسکێک هەڵڕێژێت. پاش نەختێک گوتی؛
«هەروا ئاسان نیە، هانس تۆماس»
لەوێدا خەریکبوو دەنگی گڕ دەبوو. منیش گوتم؛
«دەزانی چی... ساڵێک 365 ڕۆژە. هەشت ساڵیش 2920 ڕۆژی تێدایە، هێشتام ڕۆژی 29ی مانگی دووەکانیشم نەخستۆتە سەریان. بەڵام تەنانەت لەو دوو ڕۆژەشدا بە هیچ شێوەیەک گوێم لە دەنگی دایکم نەبوو. بەبڕوای من شتەکان هەروا ئاسانە. حەز دەکەم ئەوەندەش بڵێم کە من لە ماتماتیکدا زۆر زیرەکم»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



وابزانم ناوهێنای "ساڵە پڕە"کان بەتەواوەتی کاریتێکرد و روخاندی.
ئەو شێوەیەش کە رۆژی لەدایکبوونی خۆمم لە باسەکەمدا هۆنیەوە، هەر زۆر کاری تێکرد. یەکسەر دەستی خستە ناو دەستمەوە و فرمێسکەکانی رێچکەیان بەست، زۆر بەکوڵ گریا و چاوەکانیشی نەسری. دواتر گوتی؛

« هانس تۆماس... دەتوانیت بم بەخشیت؟»

«ئەوە پرسیارە گرنگەکەیە... قەت بیرت لەوە کردۆتەوە کە کورێک لەماوەی هەشت ساڵدا چەند جار دەتوانێت یاری کاغەز بکات؟ من خۆم بەتەواوەتی نازانم، بەڵام زۆر زۆر دەکات. لەدواجاریشدا کاغەزەکان بەشێوەیەک لە شێوەکان جێگەی خێزانێکی راستەقینەی بۆ دەگرنەوە. بەڵام ئەگەر هەموو کەرەتێک کە "بللی کوپ" ببینیت و بیر لە دایکت بکەیتەوە، ئەوا یەکسەر تێدەگەیت کە شتێکی هەڵە لە ئارادایە»

من بە ئانقەست ناوی "بللی کوپ"م برد، هەر ویستم بزانم ئەو ناوە بەلای دایکمەوە هیچ مانایەکی هەیە یان نا. بەڵام ئەو هەروا دانیشتبوو و واقی ورمابوو، پاش نەختێک بە بڵمەبڵمێکەوە گوتی؛

«بللی کوپ؟»

«بەڵێ، بللی کوپ. دوێنێ وێنەی "بللییەکی کوپ" بەسەر ماکسیەکەتەوە نەبوو؟ بەڵام گرنگە بزانین ئەو دڵە بۆ کێ لێدەدات»

«هانس تۆماس... تۆ باسی چی دەکەیت!»

لەوێدا وەک کەسێکی سەرلێشێواو دەهاتە بەرچاوم. پێم وابێت لەو بروایەدابوو کە کوڕ'ەکەی کەمێک شێتبووبێت، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو لێی دوورکەوتبووەوە. بەڵام دواتر گوتم؛



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

«مەبەستم لەوەیە کە من و باوکم نەماندەتوانی بەتەواوەتی یاریەکی کاغەز دابنێین، چونکە "بللی کوپ"مان لێدوور کەوتبووەوە... ئەو هەروا بە بێ هیچ ئومێدێک دەیویست خۆی بدۆزێتەوە»

دایکم لە شوێنی خۆیدا وشکبووبوو. بەڵام من درێژەم بەقسەکانمدا؛

«لە ماڵەوەدا جانتایەکی گەورەی پڕ لە جۆکەرمان هەیە. بەڵام هیچ سوودێکی وایان نەبوو، چونکە ناچاربووین بە ئەوروپادا بگەڕێین و هەوڵی دۆزینەوەی "بللی کوپ" بدەین»

ناوی جۆکەر زەردەخەنەیەکی گەورەی خستە سەر لێوەکانی و گوتی؛

«هێشتام هەر جۆکەر کۆدەکاتەوە؟»

«ئەو خۆی جۆکەرە. من پێم وانیە تۆ ئەو پیاوەت ناسی بێت. حەز دەکەم پێت بڵێم کە ئەو کەسێکی تایبەتیە. بەڵام لەم دوادواییەدا بەڕاستی خەریکی ئەوەبوو کە "بللی کوپ" لە جیهانی مۆدەدا رزگاربکات»

بەسەر مێزەکەدا خۆی چەماندەوە و ویستی دەستێک بە رومەتما بهێنێت، بەڵام من خۆمم لێ دوورخستەوە. لەوێدا دەبوایە خۆمم هێمن رابگرتایە و هەروا پێش وەخت پاداشتم نەبەخشیبایە.

ئەوجا گوتی؛

«وابزانم تێدەگەم مەبەستت لە "بللی کوپ" چیە»

«ئەوە شتێکی باشە... بەڵام چیتر پێم مەڵێ کە دەزانی بۆچی ئێمەت بەجێهێشت. لە راستیدا هۆی ئەو شتە ئەفسوناویە لە شتێکدایە کە دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر لەناو دەستەیەک یاری کاغەزی ئەفسوناویدا روویداوە»

«مەبەستت لە چیە؟»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

«مەبەستم لەوەیە کە هەر لە پێشەوە لە کاغەزەکاندا هاتووە کە تۆ دەبێت بەرەو "ئەسینا" بەمەبەستی خۆ دۆزینەوە کۆچ بکەیت. لێرەدا باس لە جۆرە نەفرینێکی بەدەگمەن دەکەم، هەروەک نەفرینی نەوەکان وایە. جێشوێنی ئەو شتانەش لە هونەری فاڵگرتنەوەی ژنە قەرەجەکە و کتێبە بچکۆلەکەی شاخەکانی "ئەلپ"دا دەبینرێت»

«هانس تۆماس... وابزانم لێرەوە ئیتر پێم رادەبوێریت»

زۆر بە ماناوە سەرم بۆ راوەشاند. دواتر سەیرێکی هۆڵە گەورەکەم کرد، ئەوجا بەسەر مێزەکەدا خۆم چەماندەوە و بەچرپە پێم گوت؛

«لە راستیدا تۆ خۆت فرێداوەتە شتێکی ئاڵۆزەوە و زۆر زۆر پێش ئەوەی نەنکم و باپیرەم لە "فرۆلاند"دا یەکتری ببینن، ئەو شتە لەسەر دوورگەیەکی تایبەتی ئۆقیانووسی "ئەتلانتیک"دا ڕوویداوە. هەروا بەرێکەوتیش بەمەبەستی خۆ دۆزینەوەت ڕووت لە ئەسینا نەکردووە، لە بنەڕەتدا دوای وێنە ئاوێنەییەکەی خۆت کەوتوویت»

«وێنەی ئاوێنەیی خۆم؟»

لەوێدا قەڵەمێکم دەرهێنا و لەسەر دەستەسرێک نووسیم "ANIHTA".

من وا چاوەڕوانبووم کە یۆنانیەکی باش بزانێت، لەبەرئەوە گوتم؛

«دەتوانیت ئەو وشەیە بە پێچەوانەوە بخوێنیتەوە؟»

وشەکەی خوێندەوە و گوتی؛

«"ATHINA"... هووها، تارادەیەک دەمترسێنیت. تۆ ئەوە دەزانیت کە من هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە؟»

زۆر بە ئارامیەوە وەڵامم دایەوە و گوتم؛

«بێگومان دەزانم... زۆر شتی تریش هەیە کە خەیاڵت بۆی نەچووە. بەڵام تەنانەت ئەوانەش هێندە گرنگ نین کە لە کاتی ئێستاکەدا باس بکرێن»



«ئەی گرنگترین شت چیە هانس تۆماس؟»

«ئێستاکە گرنگترین شت ئەوەیە کە بەپەلە شتەکانت کۆبکەیتەوە و بیانخەیتە ناو جانتاکانەوە. من و باوکم بە شێوەیەک لە شێوەکان سەد ساڵێک زیاترە چاوەڕوانت دەکەین، بەڵام وا خەریکە ئیتر ئاراممان لەبەر دەبڕێت»

ڕێک لەو کاتەدا کە قسەکانم کرد، باوکم بەپەلە لە شەقامەکەوە بەرەو ڕوومان دەهات.

دایکم تەماشایەکی کرد و لەناچاریدا دەستەکانی بادا و گوتی؛

«چیت لێکردووە... کوڕەکەم بەشێوەیەکی سەیر و پڕنهێنی قسەدەکات»

باوکیشم لەتەنیشتمانەوە دانیشت و لە وەڵامدا گوتی؛

«ئەو هەمیشە خاوەنی فەنتاسیایەکی گەورە بووە، بەڵام تا بڵێیت کوڕێکی باشە»

وەڵامەکەی باوکم بەدڵبوو، چونکە ئەو نەیدەزانی چ جۆرە تاکتیکێکم بەدەستەوە بوو بۆ ئەوەی دایکم لەگەڵ خۆماندا بگەڕێنینەوە بۆ "ئارەنداڵ". دواتر گوتم؛

«من تازە دەست بەقسە دەکەم، تا ئێستاکەش بۆ نمونە باسی ئەو کورتەبنە ئەفسوناویەم نەکردووە کە لەو کاتەوەی سنووری سویسرامان بەجێهێشتووە دوامان کەوتووە»

دایکم و باوکم بەشێوەیەکی سەیر تەماشایەکی یەکتریان کرد و دواتر باوکم گوتی؛

«هانس تۆماس، من وای بەباش دەزانم ئەو باسە بۆ دواتر هەڵبگریت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

هەر لەو پاشنیوەڕۆیەوە وا دەردەکەوت کە خێزانێک بین و چیتر نەمانەوێت لەیەکتر دوور بین. وابزانم توانیم هەستی دایکایەتی لە دایکمدا زیندووبکەمەوە.
هەر لەو کاتەوەی کە لە دوکانی شیرینیەکەدا بوون (وە بەتایبەتیش دواتر) دایکم و باوکم دەستیان لەملی یەکتر دەکرد، هەروەک دوو کەس دەهاتنە بەرچاوم کە تازە کەوتبنە خۆشەویستیەوە. بەر لەوەی شەو دابێت سەرم سوڕمابوو و نەمدەزانی کاتی خۆی بۆچی ناتەبابوون. بەڵام دواتر خۆم بە خۆمم گوت بەلایەنی کەمەوە هەشت ساڵە لەیەک دوورن و یەک دوو جارێکیش هەر بۆ ڕێز لێنانیان ناچاربووم ڕووی خۆم وەرچەرخێنم.
بەپێویستی نازانم باسی ئەو کاتانە بکەم کە دواتر بە چ شێوەیەک دایکمان خستە ناو فیاتەکەوە و بەرەو باشوور بەڕێکەوتین.
وا بزانم باوکم سەری لەوە دەسوڕما کە دایکم هەروا بەئاسانی لەگەڵماندا هاتەوە، بەڵام من دڵنیابووم لەوەی کە بەبینینی دایکم لە ئەسینادا کۆتایی بەو هەشت ساڵەی دووربوونمان لە یەکتری دەهێنین. جگە لەوانەش هەستمکرد دایکم خێراترین کەسی دونیایە لە کۆکردنەوەی شتەکانیدا. بەدەر لەوانەش ناچاربوو کۆمەڵێک لە ئیشوکاری مۆدێلی داهاتووی واز لێبهێنێت. ئەوەش خراپترین شتە کە کەسێکی وەک ئەو لە خواروی ئەلپەکانەوە بیکات. بەڵام باوکم دڵنیابوو کە لە نەرویجدا کارێکی نوێ دەدۆزێتەوە.
بۆ یەک دوو ڕۆژ بەتەواوەتی سەرقاڵ بووین و دواتر لە ماشێنەکەدا نزیکترین ڕێگامان گرت و بەناو یۆگسلافیادا بەرەو باکوری ئیتاڵیا کەوتینە ڕێ. من هەروەکو جاران لە دواوە دانیشتبووم، بەڵام ئیدی لەو کاتەدا دوو کەسی گەورە لە پێشەوە دانیشتبوون. لەوێشەوە ئیتر



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

خوێندنەوەی کتێبە بچکۆلەکە بەلامەوە سەختتربوو، چونکە دایکم تاوناتاوێک ئاوڕی لێدەدامەوە و نەمدەوێرا ئەو کتێبە بچکۆلەیە دەربهێنم کە نانەواکەی دۆرف کاتی خۆی پێ بەخشیم... لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئاخۆ دایکم چی بڵێت گەر ئەو کتێبە بچکۆلەیەم بەدەستەوە ببینێت.
بۆ نیوە شەو گەیشتینە باکوری ئیتاڵیا و ژورێکی تەنهایان بۆ من گرت، لەوێدا بە ئارەزووی خۆم دەمتوانی کتێبە بچکۆلەکە بخوێنمەوە. دواتر دەمەوبەیانی خەوم لێکەوت و کتێبە بچکۆلەکە هەر لە باوەشمدا بوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





شەشی کوپ

...وەک مانگ و خۆر ڕاستەقینەبوون...

بەدرێژایی ئەو شەوە ئەلبێرت دانیشتبوو و قسەی دەکرد. زۆر جار لە کاتی باسەکەیدا وەک کوڕێکی گەنجی دوانزە سیانزە سڵان دەهاتە بەرچاوم.
لەبەردەم ئاگردانەکەدا دانیشتبوو و تەماشای دەکرد، زۆر زۆر لەوەوبەر ئاگرێکی گەشاوەی تێدابوو. من بە هیچ جۆرێک قسەکانیم پێنەبڕی و بەبێدەنگی دانیشتبووم، هەروەک چۆن کاتی خۆی **52** ساڵ لەمەوبەر خۆشی بەبێدەنگی دانیشتبوو و گوێی بۆ قسەکانی "هانس"ی نانەوا شلدەکرد کە باسی "فرۆد" و دوورگە سەیرەکەی بۆ دەکرد. پاش نەختێک خۆم گەیاندە لای ئەو پەنجەرەیەی کە بەسەر "دۆرف"دا دەیڕوانی.
بەرەبەیان بوو. تەمی ئەو بەیانیە باڵی بەسەر ئاواییەکەدا داکێشابوو، کۆمەڵێک هەوری چڕیش بەسەر دەریاچەکەی "ڤاڵدەمارسە"وە بوو. لەدیوی ئەو بەری "دۆرف"یشەوە خۆرم بینی و خەریکبوو تیشکی خۆی بەسەر چیاکاندا هێدی هێدی بهێنێتە خوارەوە.
چەندەها پرسیار بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون. لەڕاستیدا نەمدەزانی لە کوێوە دەستپێبکەم، هەر لەبەرئەوەشبوو کە بەبێدەنگ مامەوە و هیچم نەگوت. گەڕامەوە لای ئاگردانەکە و لە تەنیشت "ئەلبێرت"ەوە دانیشتمەوە، لەلای ئەو پیاوەوە دانیشتم کە کاتی خۆی بەشەکەتی خۆم گەیاندە بەردەم کوخەکەی و ئەویش بە دڵێکی فراوانەوە باوەشی بۆ کردمەوە و دالدەی دام.





هێشتام دوکەڵێکی کەم لە خۆڵەمێشەکەوە بەرزدەبووەوە. لەوەدەچوو تەمی ئەو بەیانیە خۆی گەیاندبێتە ناو ئاگردانەکەش.
پاش کەمێک نانەوا پیرەکە گوتی؛
«"لودفی"... تۆ لەم لادێیەدا دەمێنیتەوە»
شێوەی گوتنی ئەو ڕستەیەم بەلاوە سەیربوو، چونکە هەم وەک پرسیارێک دەهاتە بەر گوێم و هەم وەک فەرمانێکیش. لەوانەشە هاوکات مەبەستی لە هەردووکیان بووبێت.
منیش لە وەڵامدا گوتم؛
«بێگومان»
من لەو کاتەدا هێندە تێگەیشتبووم کە دەبوایە ببومایەتە نانەوای نوێی "دۆرف". لەوێشدا هێندەم بۆ ڕوونبووەوە کە دەبوایە نهێنی دوورگە خەیاڵیەکەم بپاراستایە و بەردەوامیم پێبدایە.
ئەوجا گوتم؛
«بەڵام من بیر لەوە ناکەمەوە»
«ئەی بیر لە چی دەکەیتەوە کوڕەکەم؟»
«بیر لە یاری جۆکەرەکە دەکەمەوە... ئەگەر من ئەو سەربازە بەدبەختە بم کە لە وڵاتی باکورەوە ڕوو لێرە دەکات...»
«ئێ؟»
«کەواتە دەبێت... دەبێت ئێستاکە کوڕێکم لەو وڵاتەی باکوردا هەبێت»
هێندەم گوت و چیتر خۆم بۆنەگیرا. سەرم خستە ناو لەپی دەستەکەنمەوە و دامە پرمەی گریان.
پیاوە پیرەکەش دەستی خستە سەر شانم و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«وایە، ڕاست دەکەیت... "سەربازەکە ئاگای لەوە نیە کە ئەو کچەی بۆ ئەتک سەری دەتاشن، کوڕێکی جوانی دەبێت"»
بەئارەزوی دڵی خۆم گریام. دواتر تەماشایەکم کرد و گوتی؛
«بەڵام هێشتام شتێک ماوەتەوە و من تێیناگەم... لەوانەیە تۆ بتوانیت بۆم ڕوونبکەیتەوە»
«چی؟»
«بۆچی سەری ئەو کچە نەگبەتەیان بۆ ئەتک تاشیوە؟»
وەڵامم دایەوە و گوتم؛
«منیش خۆم ئەوەم نەبیستبوو. بەڕاستی نەمدەزانی کە هێندە زۆر ئازاریان داوە. بەڵام هێندەم بیستبوو کە لە دوای ئازادبوونیان لەدەست ئەڵمانیەکان ئەو شتانە ڕوویاندابوو. ئەو کچانەی کە لەگەڵ سەربازێکی دوژمندابوون، سەریان تاشراوە و بێ شەرەفیش تەماشاکراون. هەر لەبەرئەوەش... وابزانم هەرلەبەرئەوەش بوو کە دواتر نەمویست بگەڕێمەوە لای و بەدوایدا بگەڕێم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت "لەوانەیە لەیادم بکات"، خۆم بە خۆمم دەگوت "ئەگەر بگەڕێمەوە لای، لەوانەیە زیاتر ئازار بچێژێت". من لەو بڕوایەدا بووم کە هیچ کەسێک پەی بە نهێنیمان نەبات. وابزانم کەسیش ئەو ڕاستیەی نەدەزانی، بەڵام دواتر کە سکی بەرزبۆتەوە... بێگومان ئیتر هەقیقەتەکەی ئاشکرابووە»
هەروا بە شێوەیەکی ئاسایی گوتی؛
«تێدەگەم»
دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە ئاگردانە خامۆش و بەتاڵەکە.
منیش ئارامم لێبڕا و هەستامە سەرپێ، بۆ ماوەیەکی کەم بەژورەکەدا هەر دەهاتم و دەچووم.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بڵێیت هەموو ئەمانە ڕاست بن؟ خۆ خەڵکی ئاواییەکە لە "خانەی ڤاڵدەمار"دا بە دزیەوە دەیانگوت ئەلبێرت کەمێک شێتۆلکەیە... کێ دەڵێت ڕاست ناکەن؟"
لە ناکاودا بۆم دەرکەوت کە من لەڕاستیدا هیچ بەڵگەیەکم بەدەستەوە نیە کە بتوانم پشتی پێ ببەستم و قسەکانی "ئەلبێرت"ی پێ بسەلمێنم. دەکرێت هەموو ئەو قسانەی کە دەربارەی "هانس"ی نانەوا و "فرۆد" بۆی هەڵڕشتم، قسە و باسی کەسێکی سەرلێشێواو بێت. من خۆم نە ساردیە ئەرخەوانیەکەم بینیوە و نە چاویشم بە دەستەی یاری کاغەزە کۆنەکەش کەوتووە.
هەموو ئەو شتانەی کە لەبەردەستمدا بوون، ئەو چەند وشەیە بوو کە باسی ئەو سەربازەی دەکرد کە لە وڵاتی باکورەوە دێت. بەڵام خۆ ڕێی تێدەچێت "ئەلبێرت" ئەوەشی هەڵبەستبێت... کێ دەزانێت؟ جگە لەوەش تەنها شتێک کە دەمتوانی پشتی پێببەستم باسی ئەو کچەبوو کە بۆ ئەتک سەریان تاشیووە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت "زۆر ڕێی تێدەچێت کە بەدەم خەوەوە قسەم کردبێت"، چونکە بەڕاستی دەترسام و نەمدەزانی چی بەسەر "لینا"دا هاتووە. بێگومان کەمێکیش بێئارام بووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە سکی هەبێت. بەو شێوەیەش... ئا، بەو شێوەیەش لەوانەیە بەدەم خەوەوە چەند وشەیەکم دەرپەڕاندبێت و "ئەلبێرت"یش گوێی لێبووبێت و لەگەڵ چیرۆکەکەیدا هۆنیبێتیەوە. ڕێی تێدەچێت... ئەی بۆ هەروا زوو دەربارەی ئەو کچە ئەتک کراوە پرسیاری لێکردم؟...
بەڵام بەلایەنی کەمەوە من بەتەواوەتی لە شتێک دڵنیابووم؛ دەمزانی کە ئەلبێرت بەدرێژایی ئەو شەوە هەروا بەمەبەستی هەڵخڵەتاندنی من دانەنیشتبوو و قسەم بۆ بکات. هەستم دەکرد ئەو خۆی باوەڕی بە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

هەموو تاکە وشەیەک بوو کە بۆی دەگێڕامەوە. بەڵام ڕێک ئەو خاڵە مایەی سەرنجی من بوو. چونکە ڕێی تێدەچوو هەموو ئەو قسەو قسەڵۆکەی ناو ئاواییەکە ڕاست بێت کە دەیانگوت "ئەلبێرت" کەسێکی شێتولکەیە و بە شێوەیەک لە شێوەکان لە جیهانی تایبەتی خۆیدا دەژی.

هەر لەو کاتەوەی کە من گەیشتمە ئاواییەکە، وەک کوڕێکی خۆی تەماشای دەکردم. لەوانەیە ئەوەش خاڵی هەرە گەورەترینی هەموو باسە سەیروسەمەرەکەی بووبێت. ئەلبێرت خەونی بەوەوە دەبینی کە کوڕێکی هەبێت، خەونی بە پیاوێکی گەنجەوە دەبینی کە لە دوای خۆی لە ئاواییەکەدا دەربکەوێت. هەر لەبەرئەوەش (بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت) ئەو هەموو چیرۆکە سەیرەی هۆنیبووەوە. بەلای منەوە ئەوە شتێکی نوێ نەبوو و من لەوەوپێش دەربارەی ئەو شتانەم بیستبوو. من شتێکم دەبارەی ئەو کەسە نەخۆشانە دەزانی کە لە بوارێکی تایبەتیدا بلیمەت بوون. بەو شێوەیەش چیرۆکەکەی ئەلبێرتم بەلاوە وەک دۆزینەوەیەکی مەزن وابوو.

بەردەوام لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری ژورەکە دەهاتم و دەچووم. خۆریش هێدی هێدی لەسەر شاخەکەوە دەهاتە خوارەوە.

پاش نەختێک لە پڕێکدا پیاوە پیرەکە ڕووی تێکردم و گوتی؛

«زۆر نائارام دێیتە بەرچاوم کوڕەکەم»

ڕۆیشتمە لایەوە و لە تەنیشتیەوە دانیشتم، ڕێک لەوێدا بیرم لەسەرەتای ئەو دانیشتنەمان دەکردەوە. ئێوارەی پێش ئەوە لە خانەی "ڤالدەمار"دا دانیشتبووم. لەوێدا "فریتز ئاندرێ" دیسانەوە باسی ماسیە پرتەقاڵیەکانی ئەلبێرتی کردەوە. من خۆم تا ئەو کاتە تەنها یەک ماسی پرتەقاڵیم لەلای بینیبوو و بەلاشمەوە ئاسایی بوو کە



نانەوایەکی پیری وەک ئەو حەزی لە ماسی بەخێوکردن هەبێت و تەنهایی خۆی پێی پڕبکاتەوە. بەڵام پاش ئەوەی بۆ ئێوارە درەنگانێک هاتمە لای و گوێم لێبوو لەناو بۆشایی سەرەوەی سەقفەکەدا دەهات و دەچوو... ئمم... ڕێک پاش ئەوە دانیشتین و بەو شێوەیەش ئەو ئێوارەیە دوورودرێژەمان دەستی پێکرد.

پاش کەمێک گوتم؛

«ئەی ماسیە پرتەقاڵیەکان کوان؟... تۆ خۆت گوتت "هانس"ی نانەوا لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک ماسی پرتەقاڵی لە دوورگە سەیرەکەوە هێنایەوە... هێشتام هەر لە "دۆرف"دان؟ یان... یان تەنها یەک دانەیانت لا ماوەتەوە؟»

ئەلبێرت ئاوڕی لێدامەوە و ڕێک تەماشای ناو چاوانمی کرد و گوتی؛

«چەند بە گومانیت کوڕەکەم»

هێندەی گوت و سێبەرێکی بچکۆلە دەموچاوی داپۆشی.

لەوێدا ئیدی ئارامم لێبڕا. وابزانم زۆر بیرم لە "لینا" دەکردەوە، بۆیە بەشێوەیەکی ڕەق وەڵامم دایەوە و گوتم؛

«کەواتە وەڵامم بدەرەوە؛ کوا ماسیە پرتەقاڵیەکانت؟»

بەنەرمیەکەوە گوتی؛

«وەرە»

هەستایە سەرپێ و خۆی کرد بەو ژورە بچکۆلەیەدا کە کاتی خۆی ژوری نووستنی ئەلبێرت بووە. منیش دوای کەوتم. لەوێدا پەیژەیەکی لە سەقفەکەوە ڕاکێشایە خوارەوە (ڕێک هەروەک ئەو چیرۆکەی کە خۆی بۆی گێڕامەوە و گوتی کە منداڵ بووم "هانس"ی نانەوا پەیژەیەکی لە سەقفەکەوە ڕاکێشایە خوارەوە).

بە هێواشی پێی گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

«لودفی... با بڕۆینە سەرەوە»
ئەو لە پێشمەوە سەرکەوت و منیش بەدوایدا چوومە سەرەوە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت "ئەگەر "ئەلبێرت" هەموو چیرۆکی دوورگە سەیرەکە و "فرۆد"ی هەڵبەستبێت، ئەوا بەڕاستی پیاوێکی نەخۆشە".
بەڵام هەر کە سەرم گەیشتە قەراغی سەقفەکە، یەکسەر زانیم کە هەموو ئەو قسانەی "ئەلبێرت" بەدرێژایی ئەو شەوە بۆی گێڕامەوە وەک مانگ و خۆر ڕاستەقینەبوون. لەسەرەوە چەندەها شوشەی ماسی لێدانرابوو، ماسیە پرتەقاڵیەکانیش، لە هەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێرینە، تێیاندا مەلەیان دەکرد. جگە لەوانەش چەندەها شتی سەیر و سەرنجڕاکێشەری ترم بەرچاوکەوت. پەیکەرێکی بچکۆلەی "بودا"م بینی... ئەو پەیکەرە شوشەیەشم بەرچاوکەوت کە وێنەی "مۆلووک"ێکی شەش قاچی نیشاندەدا، شمشێرەکان و هەموو ئەو شتانەی تریشم بینی کە کاتی خۆی ئەلبێرت بە منداڵی لە ژورەکەی خوارەوەدا بینیبووی.
هەنگاوێکم هەڵهێنا و بەپرتەپرتێک گوتم؛
«زۆر... زۆر... زۆر سەرنجڕاکێشە»
ئیدی تەنها بیرم لە ماسیە پرتەقاڵیەکان نەدەکردەوە، چونکە لەوێدا هەموو گومانەکانم ڕەوینەوە و دڵنیابووم کە سەرتاپای چیرۆکی دوورگە خەیاڵیەکە شتێکی ڕاستەقینەیە.
لە خواروی پەنجەرەکەوە سەرنجم چووە سەر ڕووناکیەکی شینباوی بریقەدار. ڕاستە خۆر هەتا پاشنیوەڕۆ نەدەگەیشتە ئەو شوێنە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕووناکیەکی ئاڵتونی بەسەقفەکەوە بوو، بەئاشکرا دیاربوو کە ئەو ڕووناکیە لە پەنجەرەکەوە نەدەهاتە ژورەوە.







ئەلبێرت ئاماژەی بۆ کۆڵەکەیەکی دارینی سوچێکی ژورەکە کرد و بە هێواشی گوتی؛
«لەوێدایە!»
ئینجا بتڵە کۆنەکەم بینی، هەر لەو بتڵەشەوە ڕووناکیەکی پرشنگدار پەرشدەبووەوە و دەیدا لە هەموو شوشەی ماسیەکان و شتەکانی تری سەر زەویەکە و ڕەفەکان و دۆڵابەکان.
«ئەوە خواردنەوە ئەرخەوانیەکەیە کوڕەکەم. **52** ساڵە کەس دەستی بەرنەکەوتووە، بەڵام ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە من و تۆ لەگەڵ خۆماندا بیبەینە خوارەوە»
دانەویەوە و بتڵەکەی لەسەر زەویەکە بەرزکردەوە. ئاوڕی لێدامەوە و ئینجا شلەکەی ناویم بینی، جوانیەکەی فرمێسکی بە چاومدا هێنایە خوارەوە.
لەو کاتەشدا کە خەریکبوو بچینەوە خوارەوە، چاوم چووە سەر کاغەزە کۆنەکان، لەناو قوتیلکەیەکی داریندا بوون.
ئاماژەم بۆ کردن و گوتم؛
«بەیارمەتیت... ڕێگەم پێدەدەیت تەماشایەکیان بکەم؟»
پیاوە پیرەکە زۆر بەرێزەوە سەرێکی بۆ لەقاندم. منیش کاغەزە سواوەکانم خستە ناو لەپی دەستمەوە. شەشی کوپ و دووی سینەک و کچی قەرە و هەشتی دینارم بۆ جیاکرایەوە. دواتر کەوتمە ژماردنی کاغەزەکان و پاشان گوتم؛
«تەنها **51** دانەیە»
هەر لەدوای قسەکەمەوە یەکسەر پیاوە پیرەکە بەناو بۆشاییەکەدا کەوتە گەڕان و لەوەدەچوو بەدوای شتێکدا بگەڕێت، پاش نەختێک



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



تایبەتە بە پێگەی پەرتووک

چووە لای کورسیەکی بچکۆلەوە، لەژێر کورسیەکەدا پەنجەی بۆ کاغەزێک ڕاکێشا و گوتی؛

«ئەوەتا!»

دانەویمەوە و کاغەزەکەم خستە سەر کاغەزەکانی تر. "بللی کوپ" بوو. لەوێدا ئەلبێرت گوتی؛

«تا ئێستاکەش "بللی کوپ" هەر خۆی جیادەکاتەوە و دەیەوێت بڕوات، بەڵام هەمیشە لە شوێنێکی ژورەکەدا دەیبینمەوە»

ئیدی هەموو کاغەزەکانم خستەوە ناو قوتیلکە دارینەکە و چووینەوە خوارەوە.

ئەلبێرت پەرداخێکی بچکۆلەی هێنا و لەسەر مێزەکە داینا. ئینجا گوتی؛

«خۆت دەزانیت ئێستاکە چی ڕوودەدات»

هەر لەدوای قسەکانیەوە زانیم کە سەرەی منە کە تامی خواردنەوە ئەرخەوانیەکە بکەم. پێش من (ڕێک **52** ساڵ لەمەوبەر) "ئەلبێرت" لەو ژورەدا دانیشتبوو و تامی ئەو خواردنەوە پڕنهێنیەی کردبوو، وە پێش ئەویش (**52** ساڵ لەوەوپێشتر) "هانس"ی نانەوا لەسەر دوورگە خەیاڵیەکە ئەو خواردنەوەیەی خواردبووەوە.

پاش ماوەیەکی کەم ئەلبێرت گوتی؛

«بەڵام هێندەت لەیادبێت کە تەنها ئەم کەرەتە قومێکی بچکۆلەی لێدەخۆیتەوە. وە دەبێت ئەو کاتە ئەم بتڵە دەربهێنیتەوە کە یاریەکی کاغەزی نوێ دەستپێکردبێتەوە. بەو شێوەیەش ئەم شلەیە بەشی چەندەها نەوە دەکات»

چەند دڵۆپێکی کەمی ڕۆکردە ناو پەرداخە بچکۆلەکەوە. پەرداخەکەی بۆ ڕاکێشام و گوتی؛



«فەرمووو!»

منیش گوتم؛

«نازانم بوێرم بیخۆمەوە یان نا»

بەدوامدا ئەلبێرت گوتی؛

«بەڵام هێندە دەزانیت کە ناچاریت بیخۆیتەوە. چونکە ئەگەر ئەم چەند دڵۆپە تاقینەکەیتەوە و بەو شێوەیە نەبێت کە باسمان کرد، ئەوا ئەوسا ڕێی تێدەچێت کە منی "ئەلبێرت کلاگس"ی پیر، پیاوێکی شێتۆلکەبم و بەدرێژایی ئەم شەوەش باسی درۆودەلەسەم بۆ کردبیت. بەڵام نانەوایەکی پیری وەک من پێیخۆش نیە خەڵکی بەو شێوەیە بیبینن... تێدەگەیت؟ ڕاستە لەوانەیە ئا ئێستاکە هیچ گومانێکت لە ڕاستی و دروستی چیرۆکەکەم نەبێت، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان گومان هەر دێتە دڵتەوە. هەر لەبەرئەوەش زۆرم بەلاوە گرنگە هەست بەو تامە بکەیت، کە هەروەک لەوەوپێش بۆم باسکردیت لە هەموو جەستەتدا دێت و دەچێت. تەنها بەو شێوەش دەتوانیت ببیتە نانەوای "دۆرف"»

پەرداخە بچکۆلەکەم بەرزکردەوە و دڵۆپە کەمەکانی ناویم فڕکرد. هەرلەپاش یەک دوو چرکە لە هەموو لەشمدا هەستم بەتامی جیاواز جیاواز دەکرد.

هەستمدەکرد لە هەمان کاتدا لە هەموو بازاڕەکانی جیهاندام. هەر دەتگوت لە بازاڕێکی "هامبۆرگ"دا تەماتەیەک دەخەمە دەممەوە، لە بازاڕێکی "لیوبیک"یشدا گازێک لە هەرمێیەک دەگرم، لەیەکێک لە بازاڕەکانی "زوریخ"دا دڵم چووە سەر جۆرە ترێیەکی تایبەتی، لەبازاڕێکی "ڕۆما"شدا تامی هەنجیرێکم دەکرد، لەبازاڕەکەی "ئەسینا"شدا گوێز و بایەمم دەخوارد، لەیەکێک لە بازاڕەکانی



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





"قاهیره"شدا تامی دەنکە خورمایەکم دەکرد. بەردەوام تامی تریش بە لەشمدا دەهاتن و دەچوون. هەندێک لە تامەکان هێندە بەلامەوە نامۆبوون، هەستم دەکرد لە دوورگە خەیاڵیەکەدا دەخولێمەوە و تامی میوە جۆراوجۆرەکانی دەرەختەکانی دەکەم. لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئەوە تامی میوەی "توفا"یە، ئەوەشیان لە تامی "ڕەگی داری خڕ" دەچێت و ئەوەش تامی "تووی چاکبوونەوە"یە. هێشتام لەوانەش زیاتر... لەناکاودا لەوەدەچوو گەڕابێتمەوە بۆ "ئارەندال"... زۆر بەڕوونی هەستم بەتامی تووتڕکەکەی ئەوێ دەکرد و بۆنی قژی "لینا"م دەکرد.

نازانم بۆ ماوەی چەندێک لەبەردەم ئاگردانەکەدا دانیشتبووم و تامە جیاوازەکانم بۆ دەهات. پێشم وانیە هیچ قسەیەکم بە ئەلبێرت گوتبێت، بەڵام دواتر ئەو پیاوە پیرە هەستایە سەرپێ و گوتی؛

«وابزانم ئیدی نانەواوەیەکی پیری وەک من پێویستی بە خەو هەیە. بەڵام لە پێشدا بتڵەکە دەخەمەوە شوێنی خۆی، حەزدەکەم ئەوەشت پێ بڵێم کە من هەمیشە دەرگاکەی بەدوای خۆمدا دادەخەمەوە... بەڕاست، خۆ تۆش ئیتر گەورەبوویت، کۆنە سەرباز... سەوزە و میوە بۆ لەش باشە، بەڵام پێم وانیە پێت خۆش بێت کە ببیت بە میوەیەک.

ئەمڕۆکە من زۆر لەوە دڵنیانیم کە ئەو ئەو قسانەی کردبێت. بەڵام هێندەم لەیادە کە بەرلەوەی بچێتە ناو جێگاوە، بەچەند وشەیەک ئاگاداری کردمەوە... ئەو وشانەش دەربارەی خواردنەوە ئەرخەوانیەکە و کاغەزەکانی "فرۆد" بوون.





## حەوتی کوپ

**...ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات...**

ئەو ڕۆژە درەنگانێک خەبەرم بووەوە، ئەوجا بەتەواوەتی لەوە تێگەیشتم کە ئەو نانەوا پیرەی کە کاتی خۆی لە شاری "دۆرف"دا بینیم، لەڕاستیدا باپیرەی خۆم بووە. چونکە هەر چۆنێک بیرم لێدەکردەوە ڕێپێتێنەدەچوو ئەو کچەی کە کاتی خۆی لە نەرویجدا بۆ ئەتک سەریان تاشیوە، لە نەنکی خۆم زیاتر بێت.

بێگومان نەمدەتوانی بەتەواوەتی لەوە دڵنیابم... خۆ لەیاری جۆکەرەکەدا بە ڕوونی نەیانگوت کە کچە سەر تاشراوەکە نەنکی منە و نانەواکەی "دۆرف"یش باپیرەمە. بەڵام ڕێی تێناچێت چەندەها کچ بەناوی "لینا"وە لە نەرویجدا دەستگیرانی سەربازێکی ئەڵمانی بووبن.

بەو شێوەیەش هێشتام سەرتاپای هەموو هەقیقەتەکەم لەبەردەستدا نەبوو. لەلایەکی تریشەوە "هانس"ی نانەوا چەندەها ڕستەی یاری جۆکەرەکەی لەیادکردبوو و لەبەرئەوەش نە ئەلبێرت و نە کەسی تریش ئەو ڕستانەی دەزانی. لەدڵی خۆمدا دەمگوت "بڵێیت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو ڕستانە دەرکەون و تەواوی 52 ڕستەکەی یاری کاغەزەکەم بۆ ئاشکرا ببێت؟"

هەموو شوێنەوارێکی دوورگە خەیاڵیەکە لەگەڵ نقومبوونیدا لە دەریادا سڕایەوە، کاتێکیش "هانس"ی نانەوا مرد، ئیتر مەحاڵبوو هیچ شتێک لە دەمیەوە بێتە دەرەوە. بە هەمان شێوەش ڕێی تێناچێت دیسانەوە ژیان بکرێتەوە بە بەری کاغەزەکانی "فرۆد"دا و



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



کورتەبنەکان ئەو ڕستانەیان بیربکەوێتەوە کە 150 ساڵ لەمەوبەر گوتویانە.

تەنها یەک بوار مابووەوە؛ ئەگەر هێشتام جۆکەر هەر لە ژیاندا بێت، ئەوا ڕێیتێدەچێت یاری جۆکەرەکەی لەیادمابێت.

دەمزانی کە ناچارم و دەبوایە دایک و باوکم ڕازیبکردایە کە لە ڕێگەی گەڕانەوەماندا بە "دۆرف"دا بڕۆشتینایەتەوە بۆ نەرویج. هەرچەندە پشووەکەی باوکم خەریکبوو کۆتایی پێدەهات و لەو ڕێگایەشەوە بەتەواوەتی دووردەکەوتینەوە. دەشبوایە بەبێ ئەوەی کتێبە بچکۆلەکەم نیشانبدانایە، ڕازیمبکردنایە.

زۆرم پێخۆش دەبوو گەر بەلای نانەواخانە بچکۆلەکەدا تێپەڕیمایەتەوە و بەو نانەوا پیرەم بگوتایە؛ ئەوا هاتمەوە... وا دیسانەوە لەوڵاتی باکورەوە هاتمەوە. باوکیشم لەگەڵدایە... ئەوە کوڕی تۆیە.

لەکاتی نانخواردنی بەیانیدا باسی سەرەکیمان دەربارەی باپیرەم بوو. لەلای خۆمەوە بڕیارمدا هەتاوەکو لە نانخواردن نەبینەوە، بە هیچ شێوەیەک لەو بارەیەوە هیچ شتێک نەدرکێنم. بەڵام هەستیشم دەکرد گومانیان لەلا دروستبوو بێ، بەتایبەتیش پاش ئەوەی کەمێک لە ناواخنی کتێبە بچکۆلەکەم بۆ درکاندن. بەهەرحاڵ لەوێدا بڕیارمدا وازیان لێبهێنم تا بەڕاشکاوی نانی بەیانیان بخۆن.

دایکم ڕۆیشتە ئەولاوە و ویستی کوپێک قاوەی تر تێبکات، لەو کاتەدا بە قووڵی تەماشای باوکمم کرد و بەمەبەستەوە پێم گوت؛

«باشبوو دایکمان لە ئەسینادا دۆزیەوە. بەڵام بۆ ئەوەی یاری کاغەزەکەمان بەتەواوەتی بکرێتەوە، کاغەزێکی تریشمان نوقسانە. وا من ئەو کاغەزەشم دۆزیوەتەوە»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

باوکم بە شپرزەییەکەوە تەماشایەکی دایکمی کرد، ئینجا سەیرێکی منی کرد و گوتی؛

«ئەویان چیە هانس تۆماس؟ بۆم باس بکە»

ڕێک تەماشای ناو چاویم کرد و گوتم؛

«ئەو نانەوایەت لەیادە کە لە شاری "دۆرف"دا ساردیەکە و چوار سەمونەکەی دامێ؟ لەبیرتە تۆ لەو کاتەدا لە خانەی "ڤاڵدەمار" لەگەڵ خەڵکانی ئاواییەکەی دۆرفدا عارەقی "ئەلپ"ەکانت دەخواردەوە؟»

سەرێکی بۆ لەقاندم و منیش گوتم؛

«ئەو نانەوایە باوکی ڕاستەقینەی تۆیە»

«قسەی قۆڕ!»

هەروەک ئەسپێک کە تازە ڕایدەهێنن، فیشکەیەکی لێبەرزبووەوە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەمزانی قسەکەمی هەروا بەئاسانی وەرنەگرتبوو.

ئەوجا گوتم؛

«بەپێویستی نازام ئا ئێستاکە چیتر لەسەر ئەو بابەتە بڕۆین، بەڵام حەزدەکەم هێندەت پێ بڵێم کە من لەسەدا سەد دڵنیام لەوە»

دایکم گەڕایەوە سەر مێزەکەمان و هەر کە بۆی دەرکەوت باسی چی دەکەین، یەکسەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا. ڕاستە باوکم بەشێوەیەکی توند وەڵامی دامەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکتریمان باش دەناسی... من دەمزانی کە ئەو بەرلەوەی لە قسەکانم بکۆڵێتەوە، هەروا قسەکانم بە تورەهات وەرناگرێت. هێندەشی دەزانی کە منیش جۆکەرم و جارناجارێک سەرنجی شتێکی ورد دەدەم کە مانایەکی گەورەی هەیە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





پاش نەختێک هەروا بەئاسانی پرسیارێکی لێکردم و گوتی؛
«باشە تۆ لە کوێوە دەزانیت کە ئەو باوکی منە؟»
نەمتوانی پێی بڵێم کە من ڕاست و دروست ئەو شتەم لە کتێبە بچکۆلەکەدا خوێندۆتەوە. لەبری ئەوە باسی ئێوارەی پێشووترم کرد و گوتم؛
«بەر لە هەموو شتێک ناوی "لودفی" بووە»
باوکیشم گوتی؛
«جا ئەوە چیە... ئەو ناوە هەتا بڵێیت لە ئەڵمانیا و سویسرادا ناوێکی باوە»
«وایە، بەڵام نانەواکە ئەوەندەشی پێگوتم کە لەکاتی شەڕی جیهانی دووهەمدا لە شاری "گریمستاد"دا بووە»
«بەڕاست ئەوەی پێ گوتیت؟»
«نەک بە نەرویجیەکی پاراو. بەڵام کە من گوتم خەڵکی "ئارەنداڵ"م، هاوارێکی لێبەرزبووە و گوتی منیش لەو "شارە ناشیرینەدا" ژیاوم. من وای بۆ دەچم کە مەبەستی لە "گریمستاد" بووبێت»
باوکم سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم و گوتی؛
«"گریمستاد" واتە "شارێکی ناخۆش" یان "شارێکی ناشیرین" یان شتێک لەو بابەتە. لەوانەشە مەبەستی لە "ئارەنداڵ" بووبێت... بەڵام هانس تۆماس لەو کاتەدا سەربازێکی زۆری ئەڵمانی لە "سیورلاند"دا بوون»
منیش گوتم؛
«بێگومان، بەڵام تەنها یەکێکیان باپیرەی من بووە. ئەو یەکەش نانەواکەی "دۆرف"ە. من خۆم هیچ گومانێکم لەوە نیە»



دواتر گەیشتینە ئەوەی باوکم تەلەفونێک بۆ نەنکم بکات. نازانم باوکم لەبەر قسەکانی من بوو کە ویستی تەلەفونی بۆ بکات، یان تەنها ویستی پێی بڵێت کە دایکمان لە ئەسینادا دۆزیوەتەوە. بەهەرحاڵ نەنکم لە ماڵەوە نەبوو، لەبەرئەوە تەلەفونی بۆ پورە "ئینگرید" کرد، ئەویش بە باوکمی گوت کە نەنکم لە ناکاودا دەستی لە هەموو شتێک هەڵگرتووە و بەرەو ناوچەی "ئەلپ"ەکان سەفەریکردووە.
هەر کە گوێم لەو باسە بوو، فیکەیەکی دوورودرێژم لێدا و گوتم؛
«ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات و بەو شێوەیەش دەنگی لەدووری سەدان میلەوە دەبیسترێت»
باوکم بە سەرسامیەوە تەماشایەکی کردم، هەر دەتگوت لە یەک کاتدا ڕووبەڕوی هەموو مەتەڵەکانی جیهان بۆتەوە. ئەوجا گوتی؛
«تۆ لەوەوپێش هەمان ئەو ڕستەیەت نەگوت؟»
منیش لەوەڵامدا گوتم؛
«بەڵێ گەورەم لەوەوپێشیش ئەو ڕستەیەم گوت. دەزانیت چی... ڕێیتێدەچێت ئەو نانەوا پیرە دواتر لەوە تێگەیشتبێت کە چاوی بە کوڕی کوڕەکەی کەوتووە. بەڕاست... خۆ تۆشی بینی، وەک دەڵێن خوێن قەت نابێت بە ئاو، پیاوە پیرەکە. بەبڕوای من لەوانەشە پاش ئەو هەموو ساڵە هەروا ویستبێتی تەلەفونێک بۆ نەرویج بکات، کێ دەزانێت؟ بەتایبەتیش پاش ئەوەی کوڕێکی خەڵکی "ئارەنداڵ" سەردانی نانەواخانەکەی دەکات. ئەگەر واش بووبێت، ئەوا ڕێیتێدەچێت کە پێی وابووبێت خۆشەویستیە کۆنەکەی لە شاری



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

"دۆرف"دا دیسانەوە کڵپەی لێهەڵبستێتەوە، هەروەک چۆن لە ئەسینادا ڕوویدا»

بەو شێوەیەش بەپەلە بەرەو "دۆرف" کەوتینە ڕێ. باوکم و دایکم لەو باوەڕەدانەبوون کە ئەو نانەوا پیرە باپیرەم بێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەیانزانی کە هەرگیز ناتوانن بەئاسوودەیی بژین ئەگەر بەتەواوەتی لەو بابەتە نەکۆڵنەوە.

گەیشتینە "کۆمۆ" و هەروەک جاری پێشوو لە ئوتێلە بچکۆلەکەی "بارادیللۆ"دا بۆ مانەوەی شەومان لاماندا. ئەو کاتەش شاری یارییەکەی لێ نەمابوو، نە ژنە فالگرەوەکە دیاربوو، نە شتەکانی تریش. بەڵام دڵم بەوە خۆشبوو کە دیسانەوە ژورێکی تەنهایان بۆ گرتم. هەرچەندە پاش ئەو هەموو ڕێگایە زۆر زۆر هیلاک بووبووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارمدا بەرلەوەی بخەوم کتێبە بچکۆلەکە تەواوبکەم.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

## هەشتی کوپ

...ئەم جیهانە چ پەرجویەکی مەزنە، نازانم بگریم یان پێبکەنم...

هەستامە سەرپێ و خۆم گەیاندە بەردەم هەیوانە بچکۆلەکەی بەردەم کوخەکە. نەمدەتوانی هەروا بە ئاسانی بەرێکوپێکی بڕۆم بەرێوە، چونکە لە هەموو شوێنێکی لەشمدا تامە جۆراوجۆرەکان هێرشیان بۆ دەهێنام. لە شانی چەپمەوە تامی شلیکێکی خۆشم دەکرد، هاوکات تامێکی تێکەڵی ترێیەکی ترش و لیمۆیەک لە ئەژنۆی ڕاستمەوە بەرزدەبووەوە. تامەکان هێندە زوو زوو بەلەشمدا دەهاتن و دەچوون، بۆم سەخت بوو هەر هەموویان بناسمەوە.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت "لەم کاتەدا لە هەموو شوێنێکی سەر ئەم زەویەدا خەڵکی نان دەخۆن. گەر سەرجەمی هەموو تامەکان کۆبکەینەوە، ئەوا چەند هەزار تامێکی جیاوازمان دەست دەکەوێت. من لەوێدا هەستم دەکرد کە تامی ئەو هەموو خواردنانە بکەم... دەتگوت بەیەکجار تامی هەموو ئەو شتانە دەکەم کە هەموو مرۆڤایەتی لە سەرانسەری جیهاندا دەیخۆن".

وردە وردە بەرەو دارستانەکەی سەرو کوخە بچکۆلەکە ڕۆیشتم. پاش ئەوەی تامەکانی لەشم هێور بوونەوە، هەستێکی هێندە سەیرم لەلا دروستبوو کە هەتا ئێستاکەش هەر لەگەڵمدایە.

ئاوڕێکم لە ئاوایییەکە دایەوە و ئەوجا بۆ یەکەمین جار هەستم بە پەرجوی مەزنی جیهان کرد. خۆم بە خۆمم دەگوت "چۆنە ئێمەی مرۆڤ لێرەدا دەژین؟" دەتگوت شتێکی نوێم دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەو شتەی کە دۆزیمەوە لە ڕاستیدا هەر لەسەردەمی منداڵیمەوە لەبەردەممدا بوو.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





هەستمدەکرد تا ئەو کاتە لە سووکە خەوێکدا ژیابم، ژیانی سەر زەویم وەک سوڕێکی سڕبوونی دوورودرێژ دەهاتە بەرچاوم.

لە دڵی خۆمدا گوتم "من هەم!"، من کەسێکی پڕ لە ژیانم و لەژێر ئاسمانێکی شیندا دەژیم. ئەوە یەکەمین جارم بوو لە هەموو ژیانمدا کە لە مرۆڤ تێبگەم. لە هەمان کاتیشدا دەمزانی گەر بەردەوام لەو خواردنەوە سەیرە بخۆمەوە، ئەوا هێواش هێواش ئەو هەستەم نامێنێت و لەدواجاریشدا بەتەواوەتی ونیدەکەم. ئەگەر چەند جارێکی زۆر تامی هەموو شتەکانی ئەم جیهانە بکەم، ئەوا لەناویاندا ونده‌بم. دواجاریش وام لێیەت کە هەست بە بوونی خۆم نەکەم. ئا... وەک تەماتەیەکم لێدێت، یان دەبمە دار هەڵوژەیەک.

لەسەر کۆتەڵە دارێک دانیشتم. پاش نەختێک ئاسکە کێویەک لەناو دارەکانەوە هاتە دەرەوە. بەلامەوە شتێکی سەیر نەبوو، چونکە هەمیشە لە دارستانەکانی چواردەوری "دۆرف"دا ئاسکە کێوی خۆیان نیشاندەدا. بەڵام هەتاوەکو ئەو کاتە بەو شێوەیە نەمبینیبوون، چ بوونەوەرێکی سەیربوو بەلامەوە. بێگومان لەوەوپێش ئاسکە کێویم بینیبوو، من تا ڕادەیەک هەموو ڕۆژێک دەمبینین. بەڵام هێندەم نەدەبینی کە هەر ئاسکێکیان تابڵێیت شتێکی ئەفسوناوی و پڕنهێنیە. لەوێشدا هێندەم بۆ ڕوونبووەوە کە بۆچی کاتی خۆی بەو شێوەیە نەمدەبینین؛ کاتی خۆی هێندە بەوردی تەماشام نەدەکردن، چونکە زوو زوو دەمبینین.

خۆم بە خۆمم دەگوت "هەموو شتەکانی تریش هەر وان، هەموو شتەکانی تری جیهانیش بەو شێوەیەن. هەتا ئەو کاتەی کە منداڵین، توانای ئەوەمان هەیە کە هەموو شتەکانی چواردەورمان بەتەواوەتی ببینین. بەڵام دواتر هەموو جیهان بەلامانەوە دەبێتە خوویەک.



پێموایە لەگەڵ گەورەبوونماندا ئەزموونە هەستیەکان مەستمان بکەن".

تەنها لەوێدا بەتەواوەتی زانیم کە کورتەبنەکانی سەر دوورگە خەیاڵیەکە بە چ شێوەیەک ژیاون. وابزانم لەناوەیاندا سنوورێکیان بۆ خۆیان کێشابوو و دەیانزانی تا چ ڕادەیەک بۆیان هەیە نهێنیە قوڵەکانی ئەم ژیانە تاقیبکەنەوە (لەوانەشە لەبەرئەوەبوبێت کە سەردەمی منداڵیان نەبووبێت). لە کاتێکیشدا کە ئەو بەتاڵییەیان بە خواردنەوە ئەرخەوانیەکە پڕدەکردەوە و هەموو تاکە ڕۆژێک لێیان دەخواردەوە، بەلامەوە سەیر نەبوو کە لە دواجاردا لەنێو شتەکانی چواردەوریاندا ونبووبوون. هەر لەوێشدا لەوە تێگەیشتم کە کاتی خۆی "فرۆد" و "جۆکەر" هەستیان بە چ سەرکەوتنێکی مەزن کردووە کە توانیویانە واز لەو خواردنەوە ئەرخەوانیە بهێنن.

ئاسکە کێویەکە بۆ ماوەی یەک دوو چرکە سەیرێکی کردم و دواتر بۆی دەرچوو و خۆیکرد بەناو درەختەکاندا. بۆ ساتێکی کەم هەموو شتێک ئارام و بێدەنگبوو، بەڵام لەناکاودا بولبولێک بە دەنگێکی ئەفسوناویەوە کەوتە خوێندن. سەرم لەوە سوڕمابوو کە لەشێکی بچکۆلەی وەک ئەو بە چ شێوەیەک جێگای ئەو هەموو هەوا و مۆسیقایەی تێدا دەبێتەوە.

لەدڵی خۆمدا گوتم "ئەم جیهانە چ پەرجویەکی مەزنە، نازانم بگریم یان پێبکەنم. لەوانەیە واباشتربێت هەردووکیان پێکەوە بکەین، بەڵام سانا نیە لەهەمان کاتدا پێبکەنین و بشگرین".

لەوێدا ژنە جوتیارێکی ئاوایەکەم بیرکەوتەوە. تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵانە، کەچی چەند ڕۆژێک لەمەوبەر بەخۆی و کۆرپەیەکی ساواوە خۆیکرد بە نانەواخانەکەدا، کچەکەی تەنها دوو سێ حەفتەیەکە لە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



دایکبووە. من لەوەپێش لە ژیانمدا گرنگیم بە منداڵی بچکۆلە نەدابوو، بەڵام تەماشایەکی ئەو کۆرپەیەم کرد و نیگایەکی پڕ لە ڕامان و سەرسوڕمانم لە چاوانیدا بەدیکرد. ئەو کاتە ئیتر من هێندەم بەسبوو... هەروا لەسەر ڕەگی دارەکە دانیشتبووم و گوێم بۆ چەهچەهەی بولبولەکە شلکردبوو، لەو کاتەدا ڕووناکی خۆر باڵی بەسەر بەری ئەو بەری ئاواییەکەدا کێشا... ڕێک لەوێدا خەیاڵێکی سەیر بە مێشکمدا هات، خۆم بە خۆمم دەگوت ئەگەر ئەو منداڵە کۆرپەیە بیتوانیبایە قسەبکات، ئەوا لەوانەیە بیگوتایە "من هاتوومەتە ناو جیهانێکی سەیروسەمەرەوە". من خەیاڵم لەلای دایکی بوو و پیرۆزباییم لێکرد، بەڵام لەڕاستیدا دەبوایە پیرۆزباییم لە منداڵە ساواکەی بکردایە. دەبوایە لەگەڵ هاتنە دنیای هەموو منداڵێکدا سەرمان بۆ دابنەوانایە و بمانگوتایە؛ "بەخێر هاتی بۆ ئەم جیهانە، گیانە! تۆ هەر یەکجار بەختەوەریت، چونکە لەدایک بوویت".
هەروا دانیشتبووم و پێم وابوو مایەی دڵتەنگی بێت کە ئێمەی مرۆڤ بەو شێوەیە دروستبووین کە بە شتێکی گەورەی وەک ژیان ڕادێین و دەبێتە خوویەک لەلامان. دواتریش ڕۆژێک لە ڕۆژان بوونی خۆمان وەک شتێکی ئاسایی دەبینین، لێرەشەوە... ئاخ ... لێرەشەوە چیتر هەتاوەکو ئەو کاتەی ئەم ژیانە بەجێدەهێڵین بیری لێناکەینەوە.
لەپڕێکدا لە سەرتاپای لەشمدا هەستم بەتامێکی شلیک دەکرد. ڕاستە تامێکی خۆشبوو، بەڵام تامەکەی هێندە زۆربوو خەریکبوو بمرشێنێتەوە. بەتەواوەتی هەستمکرد کە چیتر پێویستم بە خواردنەوەی ئەو شلە ئەرخەوانیە نیە. دەمزانی کە بینینی ئەو تووترکانەی دارستانەکە و سەردانێکی چکۆلەی ئاسکە کێویەکەم





بەسبوو، هەستمدەکرد دەنگی ئەو بولبولەم بەسبوو کە جارجارێک دەیخوێند.

بۆ خۆم هەر دانیشتبووم و لەناکاودا لەو نزیکانەوە گوێم لە زرنگەی شتێک بوو. سەرم هەڵبڕی و کوڕێکی کورتەباڵام بینی، لەنێوان دارەکانەوە سەرەتاتکێی لێدەکردم.
لەو کاتەشدا کە زانیم "جۆکەر"ە، خەریکبوو دڵم لە قەفەزەی سنگمەوە بێتە دەرەوە.
بەرەو ڕووم هات و لە دوری دە بۆ پانزە مەترێکەوە گوتی؛
«تامێکی خۆشی هەیە!»
زمانێکی بەلێوە بچکۆلەکانیدا هێنا و گوتی؛
«تینویەتی خۆتت بە خواردنەوە خۆشەکە شکاندووە؟ جۆکەر دەڵێت "خۆشە خۆش!»
هێشتام سەرتاپای هەموو چیرۆکی دوورگە خەیاڵیەکەم لەیادبوو، لەبەرئەوە ترسم لێنەنیشت. بەو شێوەیەش هەر زوو هێور بوومەوە و چیتر بینینی ئەو سەری نەدەسوڕمانم. هەستم دەکرد لە خۆمان بێت و سەر بە هەمان شت بین. بەتایبەتیش لەو کاتەدا کە خۆشم وەک جۆکەری دەستەی یاریەک دەبینی.
لەسەر کۆتەڵە دارەکە هەستامە سەرپێ و بەرەورووی ڕۆیشتم. چیتر چاکەتە وەنەوشەییەکەی لەبەردا نەبوو کە زەنگۆڵەکانی پێوەبوو. بەڵکو دەستێک جلی قاوەیی باوی لەبەردا بوو و خەت خەتی ڕەشی پێوەبوو.
بۆ تەوقەکردن دەستم بۆ ڕاکێشا و گوتم؛
«ئەزانم تۆ کێیت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



لەو کاتەدا کە دەستی بەر دەستم کەوت، گوێم لە زرنگەیەکی هێواشی زەنگۆڵەکانی بوو، ئینجا زانیم کە هەروا دەستێک جلی بەسەر جلە کۆنەکانیدا لەبەرکردووە. هاوکاتیش هەستمکرد دەستی هەروەک شەونمی بەیانیان ساردە.

ئەوجا گوتی؛

«پێم خۆشە تەوقە لەگەڵ سەربازەکەی وڵاتی باکوردا بکەم»

لەکاتی قسەکانیدا خەندەیەکی زۆر سەیر کەوتە سەر لێوەکانی. دانە بچکۆلەکانی هەروەک دیوی ناوەوەی سەدەفێک دەدرەوشانەوە، پاشان لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و گوتی؛

«چونکە ئێستاکە نۆبەی ئەو کوڕەیە کە بژی. پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونت لێدەکەم برای ئازیز!»

منیش وەڵامم دەیەوە و گوتم؛

«بەڵام... بەڵام ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایکبوونی من نیە»

«جۆکەر دەڵێت هێییی! ئەو دەڵێت تەنها یەک کەڕەت لەدایک نابین. دوێنێ شەو نانەوایەکی نوێ لەدایک بوو، جۆکەر ئاگای لەوەیە، هەرلەبەرئەوەشە کە پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونی لێدەکات»

دەنگی هەروەک نوزەنوزی بووکەشوشەیەک دەهاتە بەرگوێم، دەستم لەناو دەستە ساردەکەیدا بەردا و گوتم؛

«هەموویم... هەموویم بیستووە... دەربارەی باسی تۆ و فرۆد و ئەوانی تریش دەزانم...»

«بێگومان، ئەمڕۆ "ڕۆژی جۆکەرە" برادەر. سبەینێش بازنەیەکی نوێ دەستپێدەکاتەوە. ئەوجا پاش 52 ساڵی تر نۆبەی کەڕەتێکی تر دێت. ئەو کاتەش کوڕەکەی وڵاتی باکور بۆتە پیاوێکی گەورە. بەڵام بەرلەوە دێتە شاری "دۆرف". بەڕاستی شتێکی باشە کە ئەو زەڕەبینەیان





داوەتێ. جۆکەر دەڵێت زەڕەبینێکی نایابە. ئەو دەڵێت لە نایابترین شوشە دروستکراوە. چونکە کە شوشەیەکی ماسی کۆن دەشکێت، دەتوانین پارچەیەکی بخنینە گیرفانمانەوە»

لەمەبەستی ئەو کورتەبنەیە تێنەگەیشتم، بەڵام لێم نزیکبووەوە و بە هێواشی چەند وشەیەکی بە گوێمدا چرپاند و گوتی؛

«دەبێت هەموو باسی کاغەزەکانی "فرۆد" لە کتێبێکی بچکۆلەدا بنووسرێتەوە. دواتریش دەبێت بخرێتە ناو سەمونێکەوە، چونکە ماسیە پرتەقاڵیەکان نهێنی دوورگەکە دەرناخەن، بەڵکو سەموونەکە ئاشکرای دەکات. جۆکەر ئاوها دەڵێت. تەواو!»

لەوێدا گوتم؛

«بەڵام خۆ ناکرێت سەرتاپای چیرۆکی کاغەزەکانی فرۆد بخرێتە ناو سەمونێکەوە»

لەدڵەوە قاقای پێکەنینێکی لێبەرزبووەوە و گوتی؛

«برادەر... ئەوە کەوتۆتە سەرئەوەی سەمونەکەت چەندە گەورەیە، یان کتێبەکەت چەندە بچکۆلەیە»

«چیرۆکی دوورگە خەیاڵاویەکە... و هەموو شتەکانی تر... هێندە دوورودرێژە گەر بنووسرێتەوە کتێبێکی گەورەی لێدەردەچێت، کەواتە دەبێت بخرێتە ناو سەمونێکی یەکجار گەورەوە»

بەنیگایەکی مەکراویەوە تەماشایەکی کردم و گوتی؛

«جۆکەر دەڵێت هێندە دڵنیا نەبین باشە. دیسانەوە دەڵێت ئەوە خوویەکی خراپە. ئەگەر پیتەکانی کتێبەکە بەئەندازەیەکی بچکۆلە بنووسرێنەوە، ئەوا پێویست ناکات سەمونەکە هێندە گەورە بێت»

بەڵام من سووربووم لەسەر قسەکەی خۆم و گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





«پێم وانیە هیچ کەسێک بتوانێت بەو ئەندازە بچکۆلەیە کتێبێک بنووسێتەوە. دوای ئەوەش تەنانەت ئەگەر بەو شێوەیەش بنووسرێتەوە، لەو بڕوایەدا نیم هیچ کەسێک بتوانێت بیخوێنێتەوە»

«جۆکەر دەڵێت باشترە کتێبەکە بنووسرێتەوە. لەڕاستیدا هەقی خۆیەتی هەر ئائێستاکە دەستی پێبکرێت. بچووککردنەوەی پیتەکانیش گرفتێکی گەورە نیە، ئەوە خۆی لە کاتی خۆیدا چارەسەردەکرێت. هەروەها ئەو کەسەی کە زەرەبینەکەی پێیە، دەتوانێت پیتەکان ببینێت»

سەیرێکی دۆڵەکەم کرد. لەوبەرەوە رووناکیەکی رەنگ ئاڵتونی وەک فەرشێک خۆی بەسەر ئاواییەکەدا کێشابوو.

کاتێکیش کە ئاوڕم لە جۆکەر دایەوە، ونبووبوو. بەپەلە تەماشایەکی ئەملاولای خۆمم کرد، بەڵام ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە هەروەک ئاسکە کێویەکە بەپەلە خۆی لەناو درەختەکاندا ونکردبوو.

لەو کاتەشدا کە بەرەو کوخەکە ڕۆیشتمەوە، بەتەواوەتی شەکەت و ماندوو بووبوم. لەناکاویشدا خەریکبوو هاوسەنگیم تێکبچێت، چونکە خەریکبوو قاچی چەپم لەسەر بەردێک دابنێم و ڕێک لەو کاتەدا تامێکی یەکجار بەهێزی گێلاس هاتە ناو ئەو قاچەمەوە.

بیرم لە برادەرەکانی ئاواییم دەکردەوە، لەدڵی خۆمدا دەمگوت "خۆزگە ئەوانیش بەمەیان دەزانی. پاش ساتێک هەموویان لە "خانەی ڤاڵدەمار"دا کۆدەبنەوە. ئێ خۆ هەر دەبێت باسی شتێکیش بکەن... بێگومان هەر باسی ئەو نانەوا پیرەش دەکەن کە لە کوخێکی دارینا لەسەرو ئاواییەکەوە بەتەنها دەژی. لەو بڕوایەدام کە هەموویان ئەو نانەوایە وەک کەسێکی سەیر ببینن، هەربۆیە پێی دەڵێن شێتولکەیە. بەڵام لە ڕاستیدا خۆیان لەناو گەورەترین مەتەڵدان. مەزنترین مەتەڵ



لەبەردەستیاندایە، بەڵام نایبینن. لەوانەیە ڕاست بێت کە ئەلبێرت نهێنیەکی گەورەی حەشاردابێت. بەڵام نهێنیە هەرە گەورەکە ئەم جیهانەیە".

دەمزانی ئیتر من هەرگیز لە "خانەی ڤاڵدەمار"دا کەرەتێکی تر شەراب ناخۆمەوە. دەشمزانی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئیدی ئەوان باسی من دەکەن و لەپاش چەند ساڵێکیش دەبمە تاکە جۆکەری ئاواییەکە.

دواتر خۆم گەیاندەوە ناو جێگا بچکۆلەکەم و هەتا پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بۆی خەوتم.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



www.pertwk.com

نۆی کوپ

...جیهان هێندە کرچ و کاڵە کە نایەوێت گوێ بۆ باسی کاغەزەکانی فرۆد شلبکات...

هەر بەسەری پەنجەی دۆشاومژەم هەستمکرد کە گەیشتوومەتە دواهەمین پەڕەی کتێبەکە. دواهەمین پەڕە بەپێتی ئاسایی نووسرابووە و لەبەرئەوە زەرەبینەکەم لەسەر مێزەکەی تەنیشتمەوە دانا و وەک کتێبێکی ئاسایی خوێندمەوە.[27]

کوڕەکەم... لەو کاتە نزیک دەبینەوە خەریکە کە تۆ دێیتە شاری دۆرف، بۆ ئەوەی نهێنی کاغەزەکانی فرۆد و دوورگە خەیاڵیەکە بەریت. وا من نووسیم هەموو ئەو شتانەی لەیادمبوون کە ئەلبێرت کاتی خۆی گێڕایەوە بۆم. شەو دوو تێپەڕی بەدوای قسەکانیدا و مرد پیاوە پیرەکە، منیش بە نانەوای داهاتووی ئاواییەکە بووم.
یەکسەر کەوتمە نووسینەوەی چیرۆکی خواردنەوە ئەرخەوانیەکە و بڕیاریشمدا کە بە نەرویجی بینووسمەوە. لەبەرئەوە بوو کە تێبگەیت لێی تۆ، هەروەها بۆ ئەوەش بوو کە خەڵکانی ئاوایی نەتوانن تێبگەن لێی ئەگەر کتێبەکە بەردەستیان کەوت. ئێستاکە نەرویجیم هەمووم کردووە یاد.
پێم وانەبوو بتوانم بگرم پەیوەندی پێتانەوە بۆ نەرویج. نەمدەزانی لینا من چۆن پێشوازی دەکات. نەشمدەوێرا کۆنە پێشبینی بشکێنم من. دەمزانی من ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆ بۆ لادێکە دێیت.

[27] لێرەدا باپیرەی "هانس" بە نەرویجیەکی خراپ قسەدەکات.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

کتێبەکەم بە ئامێرێکی ئاسایی تایپ نووسیەوە. بوو مەحاڵ بە پیتی بچکۆلە بنووسرێتەوە. بەڵام چەند حەفتەیەک لەمەوبەر بیستم لە بانکی ئاوایی سەیرە ئامێرێکیان هاتووە بۆ. ئامێرێک بوو کە دەکرد کۆپی و هەموو جارێکیش کۆپی لەدوای کۆپی دەبوو بچوکتر. پەڕەکانی خۆمم کرد کۆپی هەشت جار و دواتر پێکەوە نووساندمن و هەر زۆر بچکۆلە کتێبێکم دەستکەوت. تۆش کوڕەکەم... وابزانم جۆکەر بچکۆلە زەرەبینەکەی داتێ، وایە؟
من کە تەواوی چیرۆکەکەم نووسیەوە، لەو کاتەدا ڕستەکانی تەنها "هانس"ی نانەوام لەیادبوو. بەڵام نامەیەکم دوێنێ هات بۆ. هەموو یاری جۆکەرەکەی نووسرابووەوە تیایدا. بێگومان جۆکەر ناردبووی.
هەر پاش ئەوەی تۆ لە دۆرف بوویت، کردم تەلەفون بۆ لینا. لەوانەیە هەمووومان بەیەک بگەینەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان.
ئاخ... ئێمەی نانەواکانی دۆرف هەمووومان چەند "جۆکەر"ێکین و هەر یەکەمان سەیروسەمەرە چیرۆکێکی پێیە. ئەو چیرۆکەش نابێت هەرگیز باڵی لێبروێت و بفرێت وەک چیرۆکەکانی تر. بەڵام هەروەک هەموو جۆکەرەکان (چ لە یاری کاغەزی بچکۆلەدا و چ لە یاری کاغەزی گەورەدا) دەبێت بە مرۆڤەکانی چواردەورمان ئەوەندە بڵێین کە ژیان حەکایەتێکی سەیرە و ناچێتە ئەقڵەوە. دەزانین ئاسان نیە چاوی مرۆڤەکان بکەینەوە و بەچاوی خۆیان ببینن کە ژیان چەندە سەرسوڕهێنەرە. بەڵام بەرلەوەی ئەو شتەی بەردەمیان وەک مەتەڵێک ببینن، جیهان هێندە کرچ و کاڵە کە نایەوێت گوێ بۆ باسی کاغەزەکانی فرۆد شلبکات کە لەسەر دوورگە خەیاڵیەکەدا ڕوویدا.
دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان لە "وڵاتی بەیانیدا" هەموو جیهان دەربارەی بچکۆلە کتێبەکەی من ببیستن. بەڵام هەتا ئەو کاتە دەبێت هەر **52**



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

سالْ کەرەتێک چەند دڵۆپێک لە ئەرخەوانیە خواردنەوەکەوە بێتە درەوە.

هەروەها هەیە شتێکی تریش کە تۆ نابێت بکەیت لەیادت؛ جۆکەر لەم جیهانەدایە. هەموو کاغەزەکانی ئەو یاریە گەورەیەش کوێریشبن ئەگەر، ئەوا جۆکەر هەمیشە بڕوای دەبێت بەوەی کە چەند مرۆڤێک چاوی دەبێت کراوە.

ئیدی خوات لەگەڵ کوڕەکەم. لەوانەیە دۆزیبێتەوە دایکت لەوڵاتی خواروودا. دواتریش کە گەورەتربوویت دێیتە شاری "دۆرف".

دوا لاپەڕەی کتێبە بچکۆلەکە تێبینیەکانی جۆکەرە کە لە ڕۆژی یاریە گەورەکەی جۆکەردا لەلای خۆی هێشتوونیەتەوە، ئەو قسانەیە کە کورتەبنەکانی دوورگە خەیاڵیەکە چەندەها و چەندەها سالْ لەمەوبەر گوتوویانە.





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

## یاری جۆکەر

کەشتیە چارۆکەدارەکە بە بارە زیوەکەیەوە لەناو دەریای تورەدا نقووم دەبێت. دەریاوانەکە دەگاتە دوورگەیەک کە گەورەتر و گەورەتر دەبێت. لە گیرفانی کراسەکەیدا دەستەیەک کاغەزی تێدایە و دواتر بۆ ئەوەی وشک ببنەوە لەبەر خۆردا دایاندەنێت. **53** وێنە بۆ ماوەی چەندین سالْ دەبنە هاوەڵی کوڕی شوشەچیەکە.

بەرلەوەی ڕەنگەکان کاڵ ببنەوە، **53** کورتەبنە لە فەنتاسی دەریاوانە تەنیاکەدا دادەڕژرێن. کەسایەتیە سەیرەکان لە ئاگایی "مێستەردا" هەڵدەپەڕن. ئەو کاتەی کە "مێستەر" دەخەوێت، کورتەبنەکان ژیانی تایبەتی خۆیان بەسەردەبەن. لەبەیانیەکی خۆشدا، پاشا و کوڕ لە زیندانی ئاگایدا دێنە دەرەوە.

فەنتاسیەکان لەشوێنی دروستکردنیانەوە دێنە دەرەوە و دەڕۆنە شوێنە دروستکراوەکە. کەسایەتیەکان لەقوڵی چاکەتی جادووبازەکەوە دێنە دەرەوە و لەپڕێکدا بەئاسمانەوە هەست بەوە دەکەن کە پڕلەژیانن. فەنتاسیەکان یەک لەیەک جوانترن، بەڵام جگە لە یەکێکیان هەر هەموویان مێشکیان لەدەستداوە. لە هەموو کۆمەڵەکەدا تەنها یەک جۆکەری تەنیا دەتوانێت لە وەهمەکە تێبگات.

خواردنەوە پرشنگدارەکە هەستەکانی جۆکەر دەوەستێنێت. جۆکەر ئەو خواردنەوەیە تفدەکاتەوە. ئەو بەبێ ئەو شلە پڕلەدرۆیە باشترێک بیردەکاتەوە. پاش **52** سالْ کوڕەزای خاوەنی کەشتیە تێکشکاوەکە دێتە ئاواییەکەوە.

هەقیقەت لە کاغەزەکاندایە. لە ڕاستیدا کوڕی شوشەچیەکە فێڵی لە فەنتاسیەکانی خۆی کردووە. فەنتاسیەکان بەشێوەیەکی نایاب لە



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





"مێستەر" هەڵدەگەڕێنەوە. پاش ماوەیەکی کەم "مێستەر" دەمرێت، لەڕاستیدا کورتەبنەکان دەیکوژن.

شازادەی خۆر ئەو ڕێگایە دەدۆزێتەوە کە بەرەو دەریاکە دەڕوات. دوورگە خەیاڵییەکە لەناووەوڕا دەڕمێت. کورتەبنەکان دیسانەوە کۆڵدەدەن. بەرلەوەی حەکایەتەکە کۆتایی پێبێت، کوڕی نانەواکە بۆی دەردەچێت.

زۆرزانەکە لەوڵاتی خۆیاندا ڕادەکاتە پشت چەند ئەمبارێکی پیسی بەندەرێکەوە. کوڕی نانەواکە بەرەو شاخەکان ڕادەکات و بەنهێنی لەلادێیەکدا دەمێنێتەوە. نانەواکە گەنجینەی دوورگە خەیاڵییەکە دەشارێتەوە. ئەو شتەی کە ڕوودەدات لە کاغەزەکاندایە.

لادێکە جێگای ئەو کوڕە بێدەرەتانە دەکاتەوە کە دایکی بەنەخۆشی مردووە. نانەواکە خواردنەوەیەکی پرشنگداری دەداتێ و ماسیە جوانەکانی پیشان دەدات. کوڕەکە پیر دەبێت و قژی سپی دەبێت، بەڵام بەر لەوەی بمرێت سەربازێکی بەدبەخت لەوڵاتی باکورەوە ڕووی تێدەکات. سەربازەکە پارێزگاری نهێنی دوورگە خەیاڵییەکە دەکات.

سەربازەکە ئەوە نازانێت کە ئەو کچەی بۆ ئەتک سەریان تاشیوە کوڕێکی جوانی دەبێت. کوڕەکە دەبێت بەرەو جیهانی دەریاوانی ڕابکات، چونکە کوڕی دوژمنە. دەریاوانەکە ژنێکی جوان دەهێنێت و کوڕێکیان دەبێت، دواتر ژنەکەی بەمەبەستی "خۆدۆزینەوە" بەرەو وڵاتەکانی خواروو سەفەردەکات. باوک و کوڕ بەدوای ئەو ژنە جوانەدا دەگەڕێن کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە.

کورتەبنە دەست ساردەکە ئاماژە بۆ ڕێگای لادێ نهێنیەکە دەکات و زەرەبینێک بەو کوڕە دەبەخشێت کە لە وڵاتی باکورەوە هاتووە، هەتا



لە سەفەرەکەیدا بەکاریبهێنێت. زەرەبینەکە ڕێک بە ئەندازەی پارچە شکاوەکەی شوشەی ماسیەکەیە. ماسیە پرتەقاڵیەکە نهێنی دوورگەکە نادرکێنێت، بەڵام سەمونەکە ئاشکرایدەکات. ئەو کەسەی کە سەمونەکە دروستدەکات هەر هەمان ئەو سەربازەیە کە لە وڵاتی باکورەوە هاتووە.

هەقیقەتی باپیرەکە لە کاغەزەکاندایە. چارەنووس وەکو مارێکی برسی وایە و لەبرسێتیدا خۆی خۆی دەخوات. قتووەکەی ناوەوە قتووەکەی دەرەوە دەکاتەوە، وە لە هەمان کاتیشدا قتووەکەی دەرەوە قتووەکەی ناوەوە دەکاتەوە. چارەنووس وەک گوڵەکەلەرم وایە، لە هەموو لایەکەوە وەک یەک گەشەدەکات.

دواتر کوڕەکە لەوە تێدەگات کە ئەو پیاوەی سەمونەکە دروستدەکات باپیرەی خۆیەتی و لە هەمان کاتیشدا ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات دەزانێت کە ئەو کوڕەی لە وڵاتی باکورەوە هاتووە کوڕەزای خۆیەتی. ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات و بەو شێوەیەش دەنگی لەدووری سەدان میلەوە دەبیسترێت. دەریاوانەکە مەشروبە قورسەکە تفدەکاتەوە. ئەو ژنە جوانەی کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە، کوڕە خۆشەویستەکەی خۆی دەدۆزێتەوە.

یاری کاغەزەکە نەفرینی نەوەکانە. هەمیشە جۆکەرێک هەڵدەکەوێت کە لە فرتوفێڵەکە تێبگات. نەوە بەدوای نەوەدا دێت، بەڵام هەمیشە زۆرزانێک بە جیهاندا دێت و دەڕوات کە دانەکانی کات ناتوانێت وردیبکات. ئەو کەسەی کە بەباشی لە چارەنووس تێدەگات، دەمێنێتەوە.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

**دەی کوپ**

**...هەمیشە زۆرزانێک بە جیهاندا دێت و دەڕوات کە دانەکانی کات ناتوانێت وردیبکات...**

ئاسان نەبوو بۆم هەروا لەپاش خوێندنەوەی دواهەمین لاپەڕەی کتێبە بچکۆلەکە لە ئوتێلە چکۆلەکەی "بارادیللۆ"دا بخەوم. چیتر ئوتێلەکە وەک شتێکی "بچکۆلە" نەدەهاتە بەرچاوم. لەناکاودا لەوە دەچوو کە ئوتێلی "بارادیللۆ" و شاری "کۆمۆ" بچنە ناو شتێکەوە کە زۆر زۆر گەورەتربوو لە خۆیان.

هەرچی دەربارەی جۆکەریشە، ڕێک وەک ئەو شێوەیەبوو کە من مەزەندەم دەکرد. کورتەبنەکەی بەنزینخانەکە هەمان ئەو کوڕە فێڵبازەبوو کە کاتی خۆی، خۆی لەناو ئەمبارەکانی بەندەری "مارسیلیا"دا ونکردبوو. جارجارێکیش خۆی نیشانی نانەواکانی "دۆرف" داوە، جگە لەوانەش بە هەموو جیهاندا خولاوەتەوە و لە هیچ شوێنێکی دیاریکراودا نەماوەتەوە. بۆ ماوەی ڕۆژێک لەلادێیەکدا بووە و ڕۆژی دواتر ڕووی لە شوێنێکی تر کردووە. تەنها شتیش کە ڕاستی خۆی پێشاردۆتەوە، ئەو جلە تەنکانەبووە کەبەسەر جلە ئەرخەوانیەکەی خۆیدا پۆشیبووی و زەنگۆڵەکانی پێدەشاردەوە. بێگومان بەو هەموو زەنگۆڵانەوە نەیدەتوانی خۆی بە شارە خامۆشەکاندا بکات. هەروەها نەشیدەتوانی بۆ ماوەی بیست سی ساڵێک یان سەد ساڵێک لە یەک شوێندا بمێنێتەوە، چونکە ئەو هەروەک خۆی دەمایەوە و پیر نەدەبوو، ئەوەش شتێکی سەیر دەبوو.

ئێمەی مرۆڤ شیاوی مردنین، بەڵام جۆکەر وەک ئێمە نیە، چونکە بیرم دێت لە چیرۆکی دوورگە خەیاڵیەکەدا باسی ئەو هاتووە و دەڵێت



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

"جۆکەر لە تواناییدایە بەئارەزووی خۆی ڕابکات و سەوڵ لێبدات بەبێئەوەی هیلاک ببێت". بەپێی ئەو شتانەی کە من دەمزانی، هەستم دەکرد جۆکەر لەو کاتەوەی کە یەکەمین جار لەسەر سنووری سویسرادا بینیمان، بەدواماندا ڕایکردبێت. بەڵام بێگومان ڕێشیتێدەچێت کە بە شەمەندەفەر دوامان کەوتبێت.

بەلایەنی کەمەوە دڵنیابووم لەوەی کە جۆکەر پاش ئەوەی لەیاری کاغەزە بچکۆلەکەی ناو دوورگە پڕنهێنیەکەدا دەرچوو، بۆ خۆی کاتێکی خۆشی لەناو یاری کاغەزە گەورەکەدا بەسەردەبرد. لێرەشدا دیسانەوە هەروەک کاتی خۆی ڕۆڵێکی گرنگی دەبینی؛ کورتەبنە بچکۆلەکان و کورتەبنە گەورەکانیش جارجارێک دەبێت هێندەیان بهێنرێتەوە یاد کە بوونەوەرێکی سەیری پڕلەژیانن و کەمێک لە خۆیان تێدەگەن. جۆکەر بۆ ماوەی ساڵێک لە "ئەلاسکا"دا بووە، یان لە "قەفقاس"دا ژیاوە. ساڵی دوایی ئەوەش ڕووی لە ئەفریقا کردووە، یان چۆتە "تەبیت". بۆ ماوەی حەفتەیەک لە بەندەرەکەی "مارسیلیا"دا خۆی نیشانداوە، حەفتەی دوای ئەوە لە گۆڕەپانی "مارکوس"ی شاری "فێنیسیا"دا دەرکەوتووە.

دواتریش هەموو بەشەکانی یاری جۆکەرەکە دەرکەوت. "هانس"ی نانەوا هەندێک لە ڕستەکانی لەیادکردبوو، من ئەو شێوەیەم بەلاوە جوانبوو کە دواتر ئەو ڕستانە خرانە ناو چیرۆکەکەوە.

"هانس"ی نانەوا یەکێک لە ڕستەکانی پاشاکانیشی لەبیرکردبوو؛ "ئەوە بەدوای ئەوەدا دێت، بەڵام هەمیشە زۆرزانێک بە جیهاندا دێت و دەڕوات کە دانەکانی کات ناتوانێت وردیبکات".



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





پڕ بەدڵ حەزمدەکرد باوکم ڕێک ئەو ڕستەیە بخوێنێتەوە. پێمخۆشبوو وەک بەڵگەیەک بیخەمە بەر لوتی باوکم و پێی بڵێم "ئەو وێنەیەی دەربارەی دەسەڵاتی ڕوخێنەری کات لە مێشکتدایە، یەکجار ئاوها هەمووی هەر ڕەش نیە وەک ئەوەی تۆ مەزەندەی دەکەیت". کات ناتوانێت هەموو شتێک وردوخاشبکات. جۆکەرێک لە دەستەی کاغەزەکاندایە و چەند سەدەیەکە دێت و دەچێت بەبێ ئەوەی تەنانەت دانێکی شیریشی بکەوێت.

هووها! بەلای منەوە ئەوە خۆی لە خۆیدا گەرانتیەک بوو بۆ ئەوەی کە توانای سەرسوڕمانی مرۆڤ لە بوون هەرگیزاو هەرگیز کۆتایی پێنایەت. ڕاستە تێڕامانێکی ئاوها دیاریەکی بەدەگمەنە، بەڵام لەبەرامبەردا هیچ شتێک ناتوانێت بیسڕێتەوە. هەتاوەکو ئەو کاتەی شتێک هەبێت کە پێی بڵێن مێژوو و مرۆڤایەتی و جۆکەر بەئارەزووی خۆی تێیدا بێت و بچێت، ئەو تێڕامانەش دووبارە و سێبارە دەردەکەوێتەوە. لە ئەسینای کۆندا "سوکرات" هەبووە، لەشاری "ئارەنداڵ"یشدا من و باوکم هەبووین. بێگومان چەندەها کەسی تریش لە شوێنی تر و کاتی تردا هەبوون کە ئێمە ڕاستەوڕاست نایانناسین.

"هانس"ی نانەوا دواهەمین ڕستەی یاری جۆکەرەکەی لەیادبوو. بێگومان دەبوایە لەیادیبوایە، چونکە سێ کەڕەت ئەو ڕستەیە گوترایەوە، تەنها لەبەرئەوەی "پاشای قەرە" ئارامی نەبوو و نەیدەتوانی دان بە خۆیدا بگرێت؛ "ئەو کەسەی کە بەباشی لە چارەنووس تێدەگات، دەمێنێتەوە".

لەوانەیە بەپلەی یەکەم ئەو ڕستەیە مەبەستی لە جۆکەر بووبێت، کە بۆ ماوەی چەند سەدەیەکە ماوەتەوە. بەڵام منیش هەستم دەکرد لە چارەنووس تێدەگەم، هەڵبەتە بەهۆی ئەو چیرۆکە دوورودرێژەوە بوو



کە لە کتێبە بچکۆلەکەدا خوێندمەوە. بەڵام ئایا بەلای هەموو کەسێکی تریشەوە هەر هەمان شت نیە؟ ڕاستە ژیانی سەر زەویمان کورت دێتە بەرچاومان، بەڵام لە هەمان کاتدا بەشداری مێژوویەک دەکەین کە لەدوای خۆمان دەمێنێتەوە. چونکە ئێمە تەنها ژیانی تایبەتی خۆمان نازین. دەتوانین سەردانی شوێنە دێرینەکانی وەک "دێلفی" و "ئەسینا" بکەین. لەو شوێنانەدا دەتوانین هەست بەو کەسانە بکەین کە لەپێش ئێمەوە لەسەر ئەم زەویەدا ژیاون.

لەپەنجەرەکەوە تەماشایەکی دەرەوەم کرد، دەیڕوانیە سەر باخچەیەکی بچکۆلە. دەرەوە بەتەواوەتی تاریکبوو، بەڵام لەناو مێشکمدا هەموو شتێکم بەڕوونی دەبینی. پێموابوو هەستێکی تایبەت و دەگمەنم هەیە و لە مێژووی مرۆڤایەتی تێدەگەم. لەبەرچاومدا مرۆڤایەتی یاری کاغەزە گەورەکە بوو. لەیاری کاغەزە بچکۆلەکەی خێزانی خۆشماندا تەنها یەک کاغەزی کەمبوو.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت؛ بڵێیت باپیرەم لە شاری "دۆرف"دا ببینینەوە؟ بڵێیت هەر لەئێستاوە داپیرەم خۆی نەگەیاندبێتە لای ئەو نانەوا پیرە؟

تاریکاییەکەی دەرەوە هێدی هێدی بەرەو ڕەنگێکی شین دەڕۆیشت، لەوێدا ئیدی بە هەموو جلەکانی بەرمەوە لەسەر جێگاکەم پاڵکەوتم و خەوم لێکەوت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





## کوڕی کوپ

**...پیاوێکی بچکۆلەمان لەناویدا بینی، خەریکی شتەکانی پشتەوەبوو و لەوە دەچوو بەدوای شتێکدا بگەڕێت...**

بۆ پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر بەرەو باکور کەوتینە ڕێ، لەسەرەتادا هیچ شتێکی ترمان دەربارەی باپیرەم باسنەکرد، بەڵام دواتر دایکم بێدەنگیەکەی شکاند و گوتی؛

«هەرچی دەربارەی نانەواکەی "دۆرف"ە بەلای منەوە قسەیەکی منداڵانەیە و باوەڕم پێنیە»

لەوە دەچوو باوکیشم هەروەک دایکم دەربارەی نانەواکەی "دۆرف" باوەڕم پێنەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرگری لێکردم، لەبەرئەوە زۆرم پێخۆشبوو کە وەڵامی دایکمی دایەوە و گوتی؛

«بەهەمان ئەو ڕێگایەدا دەڕۆینەوە ماڵەوە کە لێوەی هاتین. لەنانەواخانەکەی "دۆرف"یشدا کیسەیەک سەمون دەکڕین. خۆ چی دەبێت... ئەو پەڕەکەی تێری لێدەخۆین و تەواو. هەرچی دەربارەی "قسەی منداڵانیشە"، دەبێت هێندە ببینیت کە ماوەیەکی دورودرێژە لێوەی دووریت»

دایکم بە مەبەستی هێمن کردنەوەی باوکم دەستێکی خستە سەرشانی و گوتی؛

«مەبەستم لەوە نەبوو»

باوکیشم گوتی؛

«وریابە... ئێستاکە من ماشێن لێدەخورم»

ئەوجا دایکم ڕووی لە من کرد و گوتی؛





«ببوورە هانس تۆماس... هەر ئەوەندەیە کە نامەوێت نائومێدبیت ئەگەر نانەواکەی دۆرف لە ئێمە زیاتر دەربارەی باپیرەت نەزانێت»

لە هەموو بارێکدا دەبوایە سەمون خواردنەکەمان تا درەنگانێک دوابخستایە، چونکە بۆ دەمەوئێوارە دەگەیشتینە دۆرف. بەڵام خۆ دەبوایە تا ئەو کاتە شتێکمان هەر بخواردایە. بۆ پاش نیوەڕۆ باوکم لە شاری "بیللینزۆنا"دا لایدا و لە کۆڵانێکی باریکی نێوان دوو چێشتخانەدا ماشێنەکەی ڕاگرت.

لەو کاتەدا کە گۆشتی برژاوی گوێرەکە و ماکەرۆنیمان دەخوارد، هەڵەیەکی گەورەم کرد... دەتوانم بڵێم لەماوەی هەموو سەفەرەکەماندا گەورەترین بێئەقڵیم نواند؛ کەوتمە باسکردنی کتێبە بچکۆلەکە.

لەوانەیە هەموو ئەو شتانەی کە دواتر ڕوویاندا، بەهۆی ئەوەوەبووبێت کە من نەمتوانی ئەو نهێنیە گەورەیە لەلای خۆم بهێڵمەوە...

گوتم لە یەکێک لەو سەمونانەی کە نانەواکەی دۆرف دایمێ، کتێبێکی بچکۆلەی تێدابوو و بە خەتێکی یەکجار بچکۆلە نووسرابووەوە. هەر لەبەرئەوەش بوو کە کورتەبنەکەی بەنزینخانەکە زەڕەبینەکەی پێبەخشیم. دواتریش بەشێوەیەکی گشتی ناواخنی کتێبەکەم بۆ گێڕانەوە.

لەو کاتەوە چەندین جار پرسیارم لە خۆم کردووە و تا ئێستاکەش نازانم بۆ هێندە بێئەقڵبووم... بۆ ئەو پەیمانە گەورەیەم شکاند کە دابووم بە نانەوا پیرەکەی دۆرف، بەتایبەتیش تەنها چەند کاتژمێرێکمان مابوو کە بگەینەوە دۆرف؟ وابزانم ئێستاکە وەڵامی ئەو پرسیارەم لەلاگەڵاڵەبووە؛ من لە ناخمەوە زۆر بە قوڵی حەزمدەکرد ئەو پیاوەی کە لەلادێیەکی شاخەکانی "ئەلپ"ەکاندا بینیم، باپیرەم



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com



بوایە... هەروەها زۆر بە قوڵیش حەزمەدەکرد کە دایکم باوەڕی پێبکردمایە. بەڵام بەو شێوەیە کتومت هەموو شتەکانم هێندەی تر سەختتر کرد.

دایکم لە پێشدا تەماشایەکی باوکمی کرد، دواتر ڕووی لە من کرد و گوتی؛

«گیانەکەم من ئەو فەنتاسیا گەورەیەت وەک شتێکی باش دەبینم، بەڵام فەنتاسیاش دەبێت سنوورێکی هەر هەبێت»

لەوێدا باوکم هەڵیدایە و گوتی؛

«تۆ لەسەر سەربانی ئوتێلەکەی ئەسیناش شتێکت لەو بارەیەوە نەگوت؟ بیرمدێت لەو کاتەدا بەخیلیم بە فەنتاسیاکەت دەبرد. بەڵام منیش وەکو دایکت پێم وایە کتێبە بچکۆلەکە زیادەڕۆییبێت»

نازانم بۆ، بەڵام لەوێدا دامە پرمەی گریان. زۆرم بەلاوە سەختبوو ئەو باسە لەلای خۆم بهێڵمەوە، کەچی کە کەوتمە گێڕانەوەی باوەڕیان پێنەدەکردم.

بەدەم هەنسکەوە گوتم؛

«باشە، لێم بوەستن... لێم بوەستن تا دەگەینەوە ماشێنەکە. هەرچەندە پەیمانم بە باپیرەمدا کە لەلای کەس نەیدرکێنم، بەڵام دەبێت کتێبە بچکۆلەکەتان هەر نیشانبدەم»

لەوە بەدواوە زۆر بە خێرایی نان خواردنەکەمان کۆتایی پێهێنا. کەمێک ئومێدم بەوەبوو کە باوکم هەرچۆنێک بێت لەلای خۆیەوە بوارێک بەکراوەیی دەهێڵێتەوە و باوەڕم پێدەکات.

باوکم سەد فرانکی سویسری لەسەر مێزەکە دانا و چاوەڕوانی باقیەکەی نەکرد. دواتر بەپەلە ڕۆیشتینە دەرەوە.





لە ماشێنەکەمان نزیکبووینەوە و پیاوێکی بچکۆلەمان لەناویدا بینی، خەریکی شتەکانی پشتەوەبوو و لەوە دەچوو بەدوای شتێکدا بگەڕێت... ئێمە تائەم کاتەش نازانین بە چ شێوەیەک دەرگای ماشێنەکەی کردبووەوە... تا ئێستاکەش ئەوە وەک نهێنیەکی گەورە لەلامان ماوەتەوە.

باوکم هاواری لێکرد و گوتی؛

«کورە هۆوو! بوەستە!»

ئەوجا بەپەلە بەرەورووی فیاتەکە ڕایکرد.

بەڵام ئەو پیاوە بچکۆلەیەی لەناوەڕاستی ماشێنەکەدا بوو لەماوەی چاو تروکاندنێکدا هاتە دەرەوە، پێچێکی کردەوە و خۆیکرد بەناو یەکەمین کۆڵاندا. لەوێدا زۆر بەڕوونی گوێم لە زرنگەی زەنگۆڵەیەک بوو.

باوکم بەدوایدا ڕایکرد، من و دایکیشم لەلای فیاتەکەمانەوە ماینەوە. نیو سەعاتێک تێپەڕی، دواتر باوکم لە هەمان کۆڵانەوە گەڕایەوە و گوتی؛

«لێمونبوو... ئەو شەیتانە بچکۆلەیەم لێونبوو! نازانم، زەوی قوتیدا یان چی!»

کەوتینە تەماشاکردنی شتەکانمان و پاش نەختێک دایکم گوتی؛

«هیچ شتێکی من نەبراوە»

باوکیشم دەستێکی لەناو جانتاکەیدا بوو و گوتی؛

«هەموو شتەکانی منیش لە شوێنی خۆیانن... ئەوە پاسپۆرتەکانە و جزدانەکەش بە هەموو پارەکانی ناوی و دەفتەری چەکەکەوە لەشوێنی خۆیدایە. تەنانەت دەستکاری جۆکەرەکەشی نەکردووە. لەوانەیە بەدوای خواردنەوەدا گەڕابێت»



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



هەردووکیان لەناو ماشێنەکەدا دانیشتن، باوکم دەرگای دواوەی بۆ کردمەوە.
هەناسەیەکم بۆ هەڵکێشا... کتێبە بچکۆلەکە تەنها شت بوو کە بیرم لێدەکردەوە، لەژێر بلوسەکەمدا دامنابوو. بەدوایدا گەڕام و نەمدۆزیەوە!
«کتێبی ناو سەمونەکە... کتێبەکەی بردووە!»
هێندەم گوت و دامەوە پرمەی گریان. ئەوجا بەدەم هەنسکەوە گوتم؛
«کورتەبنەکە بوو... کتێبی ناو سەمونەکەی دزیوە، چونکە نەمتوانی وەک نهێنیەک لەلای خۆم بیهێڵمەوە»
دواتر دایکم هاتە دواوە و لەلامەوە دانیشت. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ باوەشی پێداکردم.
چەند جارێک لەسەریەک هەر دەیگوت؛
«کوڕە بچکۆلەکەم، هانس تۆماسی نەگبەت. هەمووی خەتای منە... با بەرەو ئارەندال بکەوینەوە ڕێ و بچینەوە ماڵەوە. بەڵام پێم وایە باشترە لەپێشدا سەرخەوێک بشکێنیت»
داچڵەکیم و گوتم؛
«بەڵام خۆ دەڕۆین بۆ "دۆرف"؟»
باوکم بەرەو شارێگاکە کەوتە لێخوڕین. دڵنیای کردم و گوتی؛
«بێگومان بەرەو دۆرف دەڕۆین. دەریاوان هەمیشە پەیمانی خۆی دەباتە سەر»
لەو کاتەدا کە خەریکبوو خەوم لێبکەوێت، گوێم لێبوو باوکم بەچرپەچرپ بەدایکمی گوت؛
«زۆر بەلامەوە سەیرە. هەموو دەرگاکان داخرابوون. خۆ هەر هیچ نەبێت دەبێت دان بەوەدا بنێیت کە کوڕێکی بچکۆلەبوو، وانیە؟»



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

لەوێدا گوتم؛
«ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە ئەتوانێت بەدەرگای داخراویشدا بڕوات. مرۆڤێکی دەستکردیشە، هەربۆیە هێندە بچکۆلەیە»
ئیدی سەرم خستە سەر ڕانی دایکم و خەوم لێکەوت.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





**کچی کوپ**

**...لەپڕێکدا ئافرەتێکی بەتەمەن لەبارە کۆنەکەوە هاتە دەرەوە...**

پاش دوو سەعاتێک خەبەرمبووەوە، لەسەر کوشنەکەی دواوە دانیشتم و تەماشایەکی دەرەوەم کرد، ئەوجا بۆمدەرکەوت کە گەیشتبووینە شاخەکانی "ئەلپ". باوکم گوتی؛

«هەستای لە خەو؟ نیو سەعاتێکی تر دەگەینە دۆرف و بۆ مانەوەی شەومان لە خانەی "ڤاڵدەمار" لادەدەین»

پاش کەمێک گەیشتینە ئەو لادێ بچکۆلەیەی کە من پێم وابوو لەدایک و باوکم زۆر زۆر باشتر شارەزای بم. باوکم ماشێنەکەی ڕێک لەبەردەم نانەواخانە بچکۆلەکەدا ڕاگرت. ئەوجا هەردووکیان چەند جارێک هەوڵیاندا بە نیگایەگی پڕنهێنیەوە تەماشای یەکتری بکەن، بەڵام من لە هەموو شانۆگەریەکەیان تێدەگەیشتم.

نانەواخانەکە چۆڵ و هۆڵبوو. تەنها نیشانەی ژیان لە ماسیە پرتەقاڵیە بچکۆلەکەدا دەبینرا، لەم سەری شوشەی ماسیە گەورەکەوە بۆ ئەو سەری مەلەی دەکرد. هێشتام هەر لەناو ئەو شوشەیەدابوو کە پارچەیەکی لێشکابوو. لەوێدا منیش هەستمدەکرد ماسیەکم و لەناو شوشەیەکدا دانراوم. زەڕەبینە بچکۆلەکەم لە گیرفانمدا دەرهێنا و گوتم؛

«سەیرکەن!... نابینن زەڕەبینەکە ڕێک بە ئەندازەی پارچە شکاوەکەی شوشەکەیە؟»

ئەوە تەنها بەڵگەی بەردەستم بوو و دەمویست لە ڕێگەیەوە وایان لێبکەم کە بڕوا بە چیرۆکە سەروسەمەرەکەم بهێنن.

باوکم وەڵامی دامەوە و گوتی؛



«بەڵێ ڕاستدەکەیت... سەیرە. بەڵام پێم وانیە ئا ئێستاکە چاومان بە نانەواکە بکەوێت»

نازانم ویستی بە شێوەیەکی جوان سەرتاپای چیرۆکەکەم ڕەتبکاتەوە، یاخود لە قوڵایی ناوەوەیدا باوەڕی بە هەموو قسەکانم دەکرد و نائومێدی ئەوەبوو کە یەکسەر چاوی بە باوکی نەکەوت.

ماشێنەکەمان هەر لەوێدا بەجێهێشت و هەروا بە بێهوودە بەرەو خانەی "ڤاڵدەمار" کەوتینە ڕێ. دایکم دەیویست قسەم لێدەربهێنێت و حەزی دەکرد بزانێت ئەو برادەرانەی "ئارەنداڵ"م کێن و من زیاتر یاری لەگەڵ کێدا دەکەم. منیش دەمویست لە کۆڵی خۆمی بکەمەوە، چونکە بابەتی نانەواکە و کتێبی ناو سەمونەکە بەلامەوە یاری نەبوو. لەپڕێکدا ئافرەتێکی بەتەمەن لەبارە کۆنەکەوە هاتە دەرەوە. چاوی بەئێمە کەوت و خێرا بەرەوڕوومان هات.

نەنکم بوو!

باوکم تاسا، هاوارێکی کرد و گوتی؛

«دایە!»

وابزانم فریشتەکانی ئاسمانیش گوێیان لەو هاوارەی باوکم بوو، زۆر بە توندی قیژانی و دیاربوو لە دڵیەوە دێتە دەرەوە.

نەنکم باوەشی بە هەمووماندا کرد. دایکیشم واقی ورمابوو و نەیدەزانی چی بکات. پاش کەمێک نەنکم منی بە خۆیەوە نووساند و دەستیکرد بە گریان و گوتی؛

«کوڕەکەم... کوڕی خۆم»

دیسانەوە دایەوە پرمەی گریان. باوکیشم بە پرتەپرتێک گوتی؛

«بەڵام بۆ... بۆ... چۆن...»

نەنکم زۆر بەقوڵی تەماشایەکی هەرسێکمانی کرد و گوتی؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com



«وێنێ شەو مرد»
لەوێدا دایکم پرسیارێکی لێکرد و گوتی؛
«کێ مرد؟»
نەنکم بە هێواشی وەڵامی دایەوە و گوتی؛
«"لودفی" مرد. حەفتەی پێشوو تەلەفونی بۆکردم. بۆ چەند ڕۆژێک پێکەوە بووین. گوتی کوڕێکی بچکۆلە هاتۆتە نانەواخانەکەمەوە. هەروەها گوتیشی پاش ئەوەی کە کوڕەکە ڕۆیشت، شتێک لەناوەوەمدا پێی گوتم "لەوانەیە ئەوە کوڕەزات بێت و ئەو پیاوەش کە ماشێنە سورەکە لێدەخوڕێت کوڕی خۆت بێت". هەموو ئەم بابەتە شتێکی گەورەیە و لە هەمان کاتیشدا دڵتەزێنە. بەڵام هەر باشبوو... هەر زۆر باشبوو کە بینیمەوە. بەڵام بە داخەوە جەڵدەی دڵ لێیدا. هەر... هەر لە باوەشی مندا گیانی دەرچوو...»
ئیتر من بەهیچ جۆرێک نەمتوانی دەست بەسەر خۆمدا بگرم و دامە پرمەی گریان. هەستمدەکرد نەگبەتی من باڵی بەسەر هەموو ئەوانی چواردەورمدا کێشاوە. هەر سێکیان هەوڵیاندەدا ژێرمبکەنەوە، بەڵام بێسوودبوو... هیچ شتێک ئارامی نەدەکردمەوە.
بەلامەوە تەنها باپیرەم کۆچی دوایی نەکردبوو... نەخێر، پێمابوو هەموو جیهان لەگەڵیدا ڕۆیشتبوو. چیتر نەیدەتوانی بەوانی تر بڵێت کە هەموو قسەکانی ئەم کوڕە دەربارەی "خواردنەوە ئەرخەوانیەکە" و دوورگە خەیاڵیەکە هەقیقەتە. بەڵام لەوانەشە مەبەست نەبووبێت کە ئەو ڕاستیە دەربکەوێت. باپیرەم پیاوێکی بەتەمەن بوو و منیش تەنها بۆ ماوەیەک کتێبی ناو سەمونەکەم لەلابوو و تەواو.



تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

دوای چەند کاتژمێرێک هاتمەوە سەرخۆم، لە خانەی "ڤاڵدەمار"دا دانیشتبووین. هەر لە هەمان ئەو ژورەی نانخواردنە بچکۆلەیەدا دانیشتبووین کە تەنها جێگای چوار مێزی نانخواردنی تێدا دەبووەوە. تاوناتاوێکیش هەمان ئافرەتە قەڵەوەکە دەهاتە لامەوە و بەئەڵمانی دەیگوت؛
«تۆ هانس تۆماسیت، وانیە؟»
پاش نەختێک نەنکم گوتی؛
«ئەم بابەتەتان بەلاوە سەیر نیە... چۆن لە ناکاودا هەستی بەوە کردبوو کە هانس تۆماس کوڕەزای خۆیەتی؟ خۆ ئەو تەنانەت ئەوەندەشی نەدەزانی کە کوڕی هەیە»
دایکم هەروەک ئەوەی لەگەڵ قسەکانیدا تەبابێت، سەرێکی بۆ لەقاند و گوتی؛
«ڕاستە، زۆر زۆر سەیرە»
بەلای باوکمەوە هێندە ئاسان نەبوو، هەر بۆیە گوتی؛
«بەلای منەوە نهێنیەکی گەورەتر هەیە... بۆ بیر لەوە ناکەنەوە کە هانس تۆماس چۆن زانی کە ئەو باپیرەی خۆیەتی؟»
لەوێدا هەر هەموویان تەماشای منیان دەکرد. منیش گوتم؛
«دواتر کوڕەکە لەوە تێدەگات کە ئەو پیاوەی سەمونەکە دروستدەکات باپیرەی خۆیەتی و لە هەمان کاتیشدا ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات دەزانێت کە ئەو کوڕەی لە وڵاتی باکورەوە هاتووە کوڕەزای خۆیەتی»
هەموویان بە قوڵی تەماشایانکردم، تاڕادەیەک نیگەرانیم لەسەر سیمایان دەبینی. بەڵام من لەسەر قسەکانم بەردەوام بووم و گوتم؛



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

www.pertwk.com

«ئەو پیاوەی کە سەمونەکە دروستدەکات، لەدەسکێکی ئەفسوناویەوە قسەدەکات و بەو شێوەیەش دەنگی لەدووری سەدان میلەوە دەبیسترێت»

بەو شێوەیەش کەمێک لە تەمومژی گومانەکانیانم ڕەواندەوە و بەسەریاندا زاڵبووم. لە هەمان کاتیشدا ڕاستیەکم بۆ روونبووەوە؛ "کتێبە بچکۆلەکە بۆ هەتاهەتایە وەک نهێنیەکی گەورە لەلای من دەمێنێتەوە".





تایبەتە بە پێگەی پەڕتووک

## پاشای کوپ

**...یادوەریەکانیش زیاتر و زۆرتر لەو شتانە دووردەکەونەوە کە کاتی خۆی بوونەتە هۆی سەرهەڵدانیان...**

هەر چوارمان لە ماشێنەکەدا دانیشتین و بەرەو باکور کەوتینەوە ڕێ. لەو سەرەوە کە هاتین تەنها دوو کەس بووین، بەڵام لەم سەرەوە دوو کەسی ترمان لەگەڵدابوو. بەبڕوای من پێرێکی جوانمان پێکهێنابوو، بەڵام تەنها ئەوەندەبوو کە پاشای "کوپ"مان کەمبوو.

دیسانەوە بەلای بەنزینخانە بچکۆلەکەدا تێپەڕینەوە کە تەنها یەک پەمپی بەنزینتێکردنی هەبوو. وابزانم باوکم پڕبەدڵ حەزی دەکرد دیسانەوە ئەو کورتەبنە سەیرە ببینێتەوە. بەڵام ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە لە هیچ کونێکەوە دیارنەبوو. بەلای منەوە ئاسایی بوو، بەڵام باوکم کەوتە جنێودان و نەفرینکردن.

پرسیارمان لە خەڵکانی ئەو دەوروبەرەکرد، بەڵام هەموویان دەیانگوت ئەو بەنزینخانەیە لە حەفتاکاندا داخراوە، ڕێک لەو کاتەدا کە قەیرانە گەورەکەی بەنزین و پترۆڵ سەریهەڵدا.

لەوێدا ئیدی سەفەرە گەورەکەمان بەرەو وڵاتی فەیلەسوفەکان کۆتایی پێهات. توانیمان دایکم لە ئەسینادا بدۆزینەوە و باپیرەشمان لە لادێیەکی بچکۆلەی شاخەکانی ئەلپدا بینی. وەکی تریش برینێک کەوتە دەروونمەوە... هەستمدەکرد لقوپۆپی ئەو برینە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ئەوروپا.

گەڕاینەوەماڵەوە و پاش ماوەیەکی دوورودرێژ ئەوجا نەنکم پێیگوتم کە "لودفی" وەسیەتنامەیەکی نووسیوە و هەموو ئەو شتانەی کە خاوەنی بووە خستوویەتیە سەر ناوی من. باپیرەم گوتبووی بەڵکو



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

ڕۆژێک لە ڕۆژان هانس تۆماس بیەوێت نانەواخانە بچکۆلەکەی دۆرف ببات بەڕێوە.

ئێستاکە چەند ساڵێک بەسەر ئەو سەفەرەدا تێپەڕیوە کە من و باوکم لە شاری "ئارەندال"ەوە بەمەبەستی دۆزینەوەی دایکم بەرەو ئەسینا کردمان، دایکم ئەو کاتە لە جیهانی مۆدەدا ونبووبوو.
لەیادمە کە لەسەر کوشنی پشتەوەی فیاتە کۆنەکەدا دانیشتبووم، لەڕاستیدا هەر دەڵێی دوێنێبوو. بەتەواوەتی دڵنیام لەوەی کە لەسەر سنووری سویسرادا کورتەبنەیەک زەرەبینێکی بچکۆلەی دامێ. تا ئێستاکەش هەر ماومە و باوکیشم گەواهی ئەوە دەدات کە کورتەبنەیەک لە بەنزینخانەکەدا پێی بەخشیم.
سوێند دەخۆم کە باپیرەم ماسیەکی پەرتەقاڵی لە نانەواخانەکەی دۆرفدا هەبوو، هەمووومان ئەو ماسیەمان بینی. جگەلەوەش من و باوکم بەردە سپیەکانی ناو دارستانەکەمان لەیادە، ئەو دارستانەی کە کەوتبووە سەروی کوخە دارینەکەی دۆرفەوە. ئەو کاتەش کە تێپەڕی، ناتوانێت ئەو ڕاستیە بسڕێتەوە کە نانەوا پیرەکە چوار سەمونی دامێ. هێشتام تامی ئاوی هەرمێکەش هەر لە لەشمدایە، هەرگیزیش قسەکەی باپیرەمم لەبیرناچێتەوە کە گوتی ساردیەکی تر هەیە کە تامەکەی هەر زۆر خۆشترە.
بەڵام بڵێیت بەڕاستی کتێبێکی بچکۆلە لە یەکێک لە سەمونەکاندا بووبێت؟ بڵێیت بەڕاستی لەسەر کوشنی پشتەوەی فیاتەکەدا دانیشتبووبێتم و دەربارەی خواردنەوە ئەرخەوانیەکە و دوورگە خەیاڵیەکەم خوێندبێتەوە؟ نازانم... بڵێیت هەر هەمووی فەنتاسیای پەتی نەبووبێت؟







هەمیشە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، گومان خێرا خۆی لە مێشکماندا نیشاندەدات، یادەوەریەکانیش زیاتر و زۆرتر لەو شتانە دووردەکەونەوە کە کاتی خۆی بوونەتە هۆی سەرهەڵدانیان.

جۆکەر کتێبە بچکۆلەکەی بردەوە، لەبەرئەوە ناچاربووم بەپێی یادەوەریەکانی خۆم سەرلەنوێ بینووسمەوە. تەنانەت ناشزانم هەموویم وەک خۆی نووسیوەتەوە یان نا، لەوانەشە جارجارێک خۆشم شتێکم خستبێتە سەری. ڕاستی ئەو بابەتە تەنها فاڵگرەوەکەی "دێڵفی" دەیزانێت.
من لەدواجاردا لەوە تێگەیشتم کە ئەو پیاوەی لە دۆرفدا بینیم باپیرەی خۆم بوو، هەڵبەتە دەبێت بەهۆی ئەو پێشبینیە کۆنەی دوورگە خەیاڵیەکەوە بووبێت کە ئەو ڕاستیەم بۆ دەرکەوت. چونکە هەتاوەکو ئەو کاتەی دایکمان لە ئەسینادا دۆزیەوە، نەمدەزانی کە ئەو پیاوە باپیرەی خۆمە. بەڵام بڵێیت ئەویش هەر لەبەر هەمان هۆ ئەو ڕاستیەی بینیبێت؟
من تەنها یەک وەڵامم لایە؛ باپیرەم کتێبە بچکۆلەکەی نووسیبوو. ئەو هەر لەدوای شەڕە گەورەکەوە، پێشبینیە کۆنەکەی زانیبوو.
لەوانەیە مەتەڵە هەرە گەورەکە لەوەدا بووبێت کە لە نانەواخانەیەکی بچکۆلەی لادێیەکی بچکۆلەی سەر شاخەکانی سویسرادا بینیمان. چونکە دەبوایە بەوێدا نەڕۆشتینایە، بەڵام کورتەبنە دەست ساردەکە هەڵیخلەتاندین و ئەو ڕێگا هەڵەیەی نیشاندایین.



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com





لەوانەشە مەتەڵە هەرە گەورەکە لەوەدابووبێت کە لە ڕێگای گەڕانەوەماندا لە هەمان ئەو شوێنەدا چاومان بە نەنکم کەوت... نازانم؟

ڕێشی تێدەچێت کە هەرە گەورەترین مەتەڵ لەوەدابووبێت کە توانیمان دایکم لە جیهانی مۆدە بهێنینە دەرەوە. چونکە خۆشەویستی لە هەموو شتێکی تر گەورەترە. کات دەتوانێت یادەوەریە کۆنەکانمان لاوازبکات، بەڵام ناتوانێت ڕەنگی خۆشەویستی بپەڕێنێت و زەردبیکات.

ئێستاکە هەر چوارمان ژیانێکی ئاسوودە لە شاری "هیسیو"دا بەسەردەبەین. دەڵێم هەر چوارمان، چونکە ئێستاکە خوشکێکی بچکۆلەشم هەیە. ئەو بوو کە لەدەرەوە بە هێواشی بەناو کەستانە وگەڵا وەریوەکاندا دەڕۆیشت. ناوی "تۆنی ئەنگیلیکا"یە و خەریکە پێنج ساڵ پڕدەکاتەوە. دەمیشی وەک چیکەنەیە و وەستانی نیە، بەردەوام هەر قسەدەکات و قسەدەکات. لەوانەیە ئەو فەیلەسوفە هەرە گەورەکە بێت.

ئێمە بەهۆی "کات"ەوە گەورەدەبین. هەمان "کات"یش پەرستگا دێرینەکان دەرمێنێت و دوورگە کۆنەکانیش لە دەریادا نغرۆدەکات.

ئێستاکەش بەردەوام پرسیارێک بە مێشکمدا دێت و دەچێت، هیچ پرسیارێکی تر ئاوها زوو زوو بەخەیاڵمدا نایەت، تاوناتاوێک خۆم لە خۆم دەپرسم؛ بڵێیت بەڕاستی کتێبێکی بچکۆلە لەناو یەکێک لە سەمونەکاندا بووبێت؟ دەتوانم منیش هەرووک سوکرات بڵێم؛ من تەنها یەک شت دەزانم، ئەویش ئەوەیە کە هیچ شتێک نازانم.



بەڵام دڵنیام لەوەی کە بەردەوام جۆکەرێک بە جیهاندا دێت و دەچێت. ئەو نایەوێت جیهان قەت بە ئارامی بمێنێتەوە. لەهەموو کاتێکدا، لە هەموو شوێنێکدا ئەو زۆرزانە بچکۆلەیە دەتوانێت خۆی نیشانبدات، بە خۆی وکڵاوە سەیرەکەی و هەموو زەنگۆڵەکانیەوە سەرهەڵدێنێتەوە. ڕێک تەماشای ناو چاومان دەکات، چەند پرسیارێک دەوروژێنێت و دەڵێت؛ ئێمە کێین؟ ئێمە لە کوێوە هاتووین؟



PDF created with pdfFactory trial version www.pdffactory.com

